# فیـــهی مـــافیـهی

**(ئەوەی تێدایە کە تێیدایە)**

مەولانا
جەلالەدین محەممەد
رۆمی بەڵخی - مەولەوی

(1207-1273.ز)

**وەرگێڕ**
**عەلی نانەوازادە**

**کوردستان - هەولێر**
**٢٠٠٦**

**ناوی کتێب: فیهی مافیهی**

- نووسەر: مەولەوی
- وەرگێڕ: عەلی نانەوازادە
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: سەیوان
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- ژمارەی سپاردن: ٣٢٥
- تیراژ: ٥٠٠
- نرخ: ٢٥٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب -٣٦- (١٣٩)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن: ٢٢٦٠٣١١**

**www.mukiryani.com**

« کێ کەوانی مەولانای پێدەکێشرێ؟

کەوانی ئەو ئاسمانەکانیش پێیاننەناکێشرێ. » (شەمس )

پێشکەشە بە:
مەولانا و هەتاوەکەی

وەرگێڕ

خەڵکێکم دیت ترساو و پەرێشان. چوومە پێش.

دەیانترساندم و وریایان دەکردمەوە « ئامان! ئەژدیهایەک دەرکەوتوە کە عالەم دەکاتە بابۆڵەیەک.»

هیچ باکم نەبوو. چوومە پێشتر. دەرگایەکم دیت ئاسن، بەرینایی و درێژایی لە قسە نایە، گاڵەدراو، قفلێکیان لە سەری داوە پێنسەد مەن.

کوتیان « لێرەیە ئەو ئەژدیها حەوت سەرە. ئامان ـ بە لای ئەو دەرگایە دا مەڕۆ! »

غیرەت و پیاوەتییم بزووت، لێمدا و قفڵم شکاند. وە ژوور کەوتم. کرمێکم دیت. پێم لە سەر دانا. پێم ڕێخشاند و پانم کردەوە و کوشتم. (مەقالاتی شەمس)

**خۆشەویستی دەریایەکە**

**و**

**من**

**قومێکم پێدراوە!**

**من بە تەنها**

**جامێکی چووک**

**ـ بە قەد دڵم ـ**

**پێبڕاوە!**

ستۆکهۆڵم ـ ٢٠٠٢

# پێڕست

# پێشەکی

فیەمافیە ـ یا مەقالاتی مەولانا یا «الاسرار الجلالیە » ـ گردەکۆیەکە لە قسەکانی مەولانا لە نێو کۆڕی دۆستان و مریدەکانی دا کە لە کاتی جیاجیا کوتوویەتی. سوڵتان وەلەدی کوڕی و یەکێک لە مریدەکانی حازری کۆڕ، قسەکانی مەولانایان نووسیوەتەوە و لە دوایی نیشانی مەولانایان داوە هەتا چاوێکی پێدابخشێنێ و ئەگەر پێویست بێ دەستێکیان تێوەردا. ئەو یادداشتانە لە شوێنێک پارێزران و دوای مەرگی بە دەست یەکێک لە مریدەکان و بە شکێکی زۆرەوە لە لایەن کوڕەکەیەوە ـ سوڵتان وەلەد ـ نووسراوەتەوە و بڵاو بۆتەوە.

xxx

مەولانا جەلالەددین مەحەممەدی بەلخی یا رۆمی مەشهوور بە مەولەوی دەگەڵ باوکی ـ سوڵتانەلعولەما ـ کە یەکێک لە شێخە گەورەکانی سەردەمی خۆی و یەک لە سۆفی بەناوبانگەکانی بەلخ بوو ـ لە ساڵی ١٢٢٠ی زایینی چوو قۆنیە. دە ساڵ دوایی، لە تەمەنی بیست و چوار ساڵی بە دوای مەرگی باوکی دا، بوو بە جێگر و خەریکی دەرس و وەعز بوو و هەتا پەیدا بوونی شەمس، کەسێک بوو هاوتای باوک و پلە و پایەیەکی بەرزی هەبوو و کۆمەڵێک مرید و یار و گیانباز دەورەیان دابوو.

شەمسی تەورێز، دەروێشێکی زمانتیژی، تژی لە خودا و بەتاڵ لە ماڵ و سەروەت و بێمنەت لە خەڵک و دەوڵەت، ـ کە هەمیشە لبادی رەشی دەبەرد دەکرد، ـ وەک هەورێکی رەش و تاری بە برووسک و تەرزە داهات و هەمووو بەر و بەرهەمەکانی درەختی زانیاریی مەولانای هەڵوەراند و بە سەری دا گرماند « قسەی خۆت کوا؟ ئەو زانست و قسە و حەدیسانەی تۆ قسەی خەڵکن، من گوییەکانم توند دەگرم، نامەوی ببیسم، هی تۆ کوا؟ »

مەولەوی کە هەتا ئەوسەردەمە خەڵک بە پەیکەرەی بێنیازیی و قوتبی راز و نیازیان دادەنا، بە داوێنی ئەم دەروێشە رەش و رووتەوە نووسا و شەقی لە تەخت و بەخت دا و دەرس و مەدرەسەی وەلانا و چەند مانگ چوونە خەڵوەوە و دەرگایان لە سەر یار و نەیار بەست.

ئەو کەش و هەوا نوێیە، ئەو تین و تاوەی شەمس، مەولەوی لەو بەرە دەسکردانە بێنیاز کرد و خۆی پشکووت و خۆی وە بەر هات، بەرێکی وا کە زەحمەتە

سـەرلكەكـانـی درەخـتی ئەدەب جـارێكی دیكە قـورسـایی ئاوێزەی شـیـرینـی وەها بەرهەمێک بە خۆیانەوە ببیننەوە.

شـەمس، هەتاوی بەهار بوو، چەند مـاوەیەک ماوە، مـەولانای وەبەر خست و خـۆی تۆراو لە ئاسۆی غوربەت ئاوا بوو. رۆیشت و كەس نەیدیتەوە.

کەسێک خەبەری بۆ مەولانا هێنا « مەولانا شەمسەددینم دیت! »

مەولانا هەموو جلوبەرگی بەری پێبەخشی.

بە مەولانایان کوت « درۆ دەکا و وا نیە، بۆ ئەوەندە زۆرت پێبەخشی؟ »

کوتی « ئەوەندەم لەبەر درۆکەی دایە. ئەگەر راست با گیانم دەدایە. »

xxx

بۆ وەرگێڕانی ئەم كارە سێ چاپی فیەمافیە لەبەر یەک نراوە و نەزەری سەرەكی لە سەر كاری **جعفر مدرس صادقی** بوە كە بۆ ساغ كردنەوە و رێكوپێک كردنی زەحمەتێكی زۆری كێشاوە. هەروەتر لە پەناشەوە كەلكم لە پەراوێز و شی كردنەوەی ئەو بەرێزانە وەرگرتوە.

١ـ مقالات مولانا (فیەمافیە)، ویرایش جعفر مدرس صادقی، چاپ دوم، نشر مرکز، ١٣٧٤

٢ـ فیەمافیە، حسین حیدرخانی، انتشارات سنایی، تهران ١٣٧٥

٣ـ فیەمافیە، زینب یزدانی، انتشارات عطار، چاپ اول ١٣٧٨

## بۆ تۆ پێویستە جارێکی دی گەڕان
## بە دەوری عالەم دا!

پەیتاپەیتا بیستنی گوێ، کاری بینین دەکا و حوکمی بینینی هەیە. بەم چەشنە کە لە دایک و باوکی خۆت زای. بە تۆ دەڵێن کە لەوان زاوی. تۆ بە چاو نەتبینیوە کە لەوان زاوی. بەڵام بەم زۆر کوتنە لێت دەبێتە راستی ـ کە ئەگەر بڵێن « تۆ لەوان نەزاوی » بە گوێت دانەچێ. هەر ئەوجۆرەش کە بەغدا و مەککەت لە خەڵک زۆر بیستوە، پەیتاپەیتا، کە هەن. ئەگەر بڵێن کە « نیە » و سوێند بخۆن، باوەڕ ناکەی. کەوایە زانیمان گوێ ئەگەر پەیتاپەیتا ببیسێ، حوکمی دیتنی هەیە.

هەر ئەو جۆرەی کە لە رواڵەتی پەیتاپەیتای قسەوە حوکمی دیتن دەدەن، واش هەیە کە قسەی کەسێک حوکمی پەیتاپەیتای هەبێ کە ئەو یەک نیە، سەدهەزارە. کەوایە قسەیەکی ئەو، سەدهەزار قسەیە و ئەمەت پێ سەیرە؟ ئەمە پادشایەکی رواڵەتییە کە حوکمی سەدهەزاری هەیە، هەرچەند یەکە. ئەگەر سەدهەزار بیڵێن ناگونجێ و کە ئەو بیڵێ دەگونجێ. کەوایە چونکە لە رواڵەت دا ئەمە هەیە، لە عالەمی رووحەکان دا بە شێوەیەکی لەوەش شیاوتر هەیە.

سەرەڕای ئەمە کە هەموو عالەم گەڕاوی، چونکە بۆ ئەو نەگەڕای، بۆ تۆ پێویستە جارێکی دی گەڕان بە دەوری عالەم دا. ئەو سوڕ و سەیرە بۆ ئەو نەبوو ـ بۆ سیر و پیاز بوو*. چونکە بۆ ئەو نەگەڕای، بۆ غەرەزێک بوو. ئەو غەرەزە ببوو بە حیجابی تۆ، نەیدەهێشت ئەو ببینی. هەر ئەوجۆرەی کە لە بازار ئەگەر بە راستی لە کەسێک بگەڕێی، هیچکەس نابینی و ئەگەر ببینی، خەڵک وەک خەیاڵ دەبینی. یا دە کتێبێک دا لە مەسەلەیەک دەگەڕێی. چونکە گوێ و چاو و هۆش لەو مەسەلە پڕ بوون، پەڕەکان هەڵدەدەیەوە و هیچ نابینی. کەوایە تۆ نیەت و مەبەستێکی غەیری ئەمەت هەبوە، لە هەر کوێ گەڕابی، [وەها] لەو مەبەستە پڕ بووی، کە ئەمت نەدیوە.

* سیر و افی الارض ثم انظر و اکیف کان عاقبه المکذبین. سوورەی ئەنعام ئایەی ١١.

# قسه بیانوویه!

یەکێک دەیگوت کە « مەولانا قسە نافەرموێ! »

گوتم ئاخر، خەیاڵی من ئەو کەسەی بۆ لای من هێنا. خۆ ئەم خەیاڵەی من قسەی دەگەڵ نەکرد کە چۆنی یا چلۆنی. بێ هیچ قسەیەک، خەیاڵ ئەوی بۆ ئێرە کێشا. ئەگەر هەقیقەتی من ئەو بەبێ قسە رابکێشێ و بۆ شوێنێکی دیکەی ببا، بۆ سەیرە؟

قسە سێبەری هەقیقەت و فەرعی هەقیقەتە. کە سێبەر رایکێشا، هەقیقەت بە شێوەیەکی لەوە شیاوتر رایدەکێشێ. قسە بیانوویە. بەشێکی شیاو، مرۆڤ بۆ لای مرۆڤ رادەکێشێ، نەک قسە. ئەگەر سەدهەزار موعجیزە و گفت و کەرامات ببینێ، مادام ئەو نەبی یان ئەو وەلییە ئەو بەشە شیاوەی تێدا نەبێ، فایدەی نیە. ئەو بەشەیە کە ئەو دەهەژێنێ و بێقەراری دەکا. دە کارەبا دا ئەگەر ئەو بەشە شیاوەی تێدا نەبێ، کا قەت بۆ لای کارەبا ناچێ. ئەو جنسییەتە دە نێوان ئەوان دا شاراوەیە، نابیندرێ. خەیاڵی شتێک مرۆڤ دەگەڵ ئەو شتە دەبا ـ خەیاڵی باغ دەتباتە باغ و خەیاڵی دوکان بۆ دوکان. بەڵام لەم خەیاڵانە دا دووڕوویی شاراوەیە. نابینی کە دەچیە فلان جێگا، پەشیمان دەبیەوە و دەڵێی « پێموابوو خێر دەبێ، کە نەشبوو » کەوایە ئەم خەیاڵانە چادرن و دە چادر دا کەسێک خۆی شاردۆتەوە. هەرکاتێک خەیاڵەکان لەم نێوە رابن و راستییەکان دەرکەون بەبێ چادری خەیاڵ، قەیامەتە. لەوێ کە حاڵ وەهایە، پەشیمانیی نامێنێ: هەر راستییەک تۆ رادەکێشێ، شتێکی دیکە جگە لەو نیە، هەر ئەو راستییەیە کە تۆی بۆ لای خۆی راکێشا.

لە راستی دا، راکێشەر یەکێکە، بەڵام زۆر دەنوێنێ. نابینی کە مرۆڤ ئارەزووی سەد شت دەکا جۆراوجۆر؟ دەڵێ « سەنگەسیرم دەوێ، بۆرانیم دەوێ، هەڵوام دەوێ، قلیەم دەوێ، میوەم دەوێ، خورمام دەوێ. » ئەمانە بە ژمار دیاری دەکا و دەریدەبڕێ. بەڵام لە بنەڕەت دا یەکێکە: بنەڕەت برسیایەتییە و ئەو یەکێکە. نابینی کە لە شتێک تێر بوو، دەڵێ « هیچم لەمانە پێویست ناکا! » کەوایە دەرکەوت کە دە و سەد نەبوو، بەڵکە یەک بوو.

ئەم ژماری خەڵکە فتنەن ـ کە دەڵێن ئەمە یەک و ئەوان سەد. یانی بە وەلی دەڵێن « یەک » و بە خەڵکێکی زۆر « سەد » و « هەزار » دەڵێن. ئەمە فتنەیەکی گەورەیە. ئەم

روانگە و ئەم بیرە کە وەهای بیر کردەوە ـ ئەوان بە زۆر ببینی و ئەو بە یەک، ـ فتنەیەکی گەورەیە. کام سەد؟ کام پەنجا؟ کام شەست؟ قەومێکی بێ دەست و بێ پا و بێ هۆش و بێ گیان، وەک تەلەسم و جیوە دەجوولێنەوە. نووکە، ئەوان بە شەست یا سەد یا هەزار دەردەبڕێ و ئەمە بە یەک. دەڵێی کە ئەوان هیچن و ئەم هەزار و سەدهەزار و هەزاران هەزار.

پادشایەک سەدکوتە نانێکی دابوو بە بێ ئەنوایەک. لەشکر سەرکۆنەیان لێدەدا. پادشا بە دڵی خۆی دەگوت « رۆژێک دابێ کە پێتان نیشان بدەم هەتا بزانن بۆچ دەمکرد. »

کە بوو بە رۆژی شەڕ. هەموو رایانکردبوو و ئەو تەنیا دەیوەشاند. کوتی « ئێستا ـ لەبەر ئەم مەسڵەحەتە! »

مرۆڤ دەبێ روانگەی خۆی بێبەریی لە غەرەز بکا و یارێک بدۆزێتەوە دە دین دا. دین، یارناسی ـ یە. بەڵام کاتێک تەمەن دەگەڵ بێتەمیزان تێپەڕ بکا، روانگەی ئەویش کز دەبێ، ناتوانێ یاری دین بناسێتەوە. تۆ ئەم لەشەت گەورە کرد کە تەمیزی تێدا نیە. تەمیز سفەتێکە شاراوە دە مرۆڤ دا. نابینی کە شێتیش لەش و دەست و پێی هەیە، بەڵام تەمیزی نیە ـ دەست بۆ هەر پیساییەک دەبا و دەیگرێ و دەیخوا. ئەگەر تەمیز دەم لەشە دا هەبا، پیسایی هەڵنەدەگرتەوە. کەوایە زانیمان، تەمیز مانایەکی ناسکە کە دە تۆ دایە و تۆ شەو و رۆژ خەریکی پێگەیاندنی ئەو بێ تەمیزە بووی.

بیانوو دێننەوە کە « ئەو بەمە قایمە، » ئاخر، ئەمەش بەو قایمە. چلۆنە کە بە تەواوەتی خەریکی تیمار کردنی ئەمەی و ئەوت بە تەواوەتی وەلاناوە؟ دەڵێی کە ئەم بەوە قایمە و ئەو بەمە قایم نیە. ئەو شۆقە لە دەلاقەی چاو و گوێ و غەیرەوە دێتە دەر. ئەگەر ئەم دەلاقانە نەبن، لە دەلاقەی دیکەوە خۆ دەنوێنێ. دەڵێی کە چرایەکت هێناوەتە بەر هەتاو کە « هەتاو بەم چرایە دەبینم » حاشا! ئەگەر چراش نەهێنی، هەتاو خۆی هەر دەردەخا. چ حەوجێ بە چرایە!

هیوا لە خەڵک نابێ ببڕن. هیوا سەر رێگەی هێمنایەتییە. ئەگەر رێگە نابڕی، لانیکەم، سەری رێگە بپارێزە! مەڵێ کە « خراپەی زۆرم کرد. » تۆ راستیی لەبەر چاو بگرە، هیچ خوارییەک نامێنێتەوە. راستیی هەروەک وەکازی مووسایە، ئەو

خواریانەش هەروەک سێحرەکانن. کە راستیی بێ، هەموویان دەخوا. ئەگەر خراپەت کردوە، بە خۆت کردوە. جەفای تۆ کوا بەو دەگا؟ کە راست بییەوە، ئەو بە تەواوەتی نامێنێ. هاوار، هیوا ـ مەبرە!

هەڵسوکەوت دەگەڵ پادشاکان لەبەر ئەمە جێی مەترسی نیە کە سەر بچێ ـ کە سەرێکە بۆ چوون دەبێ، چ ئەمرۆ، چ سبەی. بەڵام لەم بابەتەوە جێی مەترسییە، کاتێک ئەوان دەربکەون، نەفسیان هێزی گرتوە و بوونە ئەژدیها، ئەم کەسە کە دەگەڵیان قسەی دەکرد و ئیدعای دۆستایەتی دەکرد و ماڵی ئەوانی وەردەگرت، بێشک دەبێ کە بە مەیلی ئەوانیش قسە بکا و رای خراپی ئەوانیش لەبەر دڵ راگرتن قەبووڵ بکا و نەتوانێ دژ بێژێ. لەم بابەتەوە جێی مەترسییە. چونکە بۆ دین زیانی هەیە. کە لای ئەوان ئاوەدان بکەیەوە لای دیکە کە ئەسڵە لە تۆ بێگانە دەبێ.

ئەوەندی کە تۆ روو دەولا بکەی، لەم لایە کە مەعشووقە، روو لە تۆ وەردەگێرێ و ئەوەند کە تۆ دەگەڵ ئەهلی دونیا تەبا بی، ئەو لە تۆ توورە دەبێ. ئەوەش کە تۆ بۆ لای ئەو دەچی بەم مانایەیە: کە بۆ ئەولایە چووی، لە ئاکام ئەو بە سەر تۆ دا زاڵ دەبێ.

حەیفە بگەیە دەریا و لە دەریا بە لوێچێک یا گۆزەیەک رازی بی. ئاخر، لە دەریا گەوهەر و سەدهەزار شتی بایەخدار دەردەکێشن. لە دەریا ئاو هەڵکێشان چ رێزێکی هەیە و زانایان چ شانازییەکی پێوەدەکەن و چیان کردوە؟ نە مەگەر عالەم کەفێکە. ئەم دەریای ئاوە، زانستی ئەولیاکانە. گەوهەر ـ خۆی، لە کوێیە؟ عالەم کەفێکی پڕ لە خاشاکە بەڵام لە خولانەوەی ئەو و شەپۆلەکان و بە پێی هەڵگەڕانی دەریا و جووڵانەوەی شەپۆلەکان، ئەو کەفە دەگووڕێ. ئەو باش نیە، بەڵکە باشیی دەو دا ئەمانەتە و لە جێگەیەکی دیکەوەیە. قەڵبی زێڕکفتە! یانی ئەم دونیایە کە کەفە، قەڵب و بێقەدر و بێقیمەتە، ئێمە زێڕکفتمان کردوە.

مرۆڤ ئوستورلابی هەقە، بەڵام ئەستێرەناسێکی گەرەکە کە لە ئوستورلاب بزانێ. تەرەفرۆش یا بەقاڵ هەرچەند ئوستورلابیان هەیە بەڵام چ فایدەیەکی لێوەردەگرن و بەو ئوستورلابە چ دەزانن لە ئەحواڵی فەلەک و خولی ئەو و بورجەکان و شوێن داخستنی ئەو و گۆڕانی وەرزەکان؟ کەوایە ئوستورلاب لە هەق ئەستێرەناس

دا بە کەلکە. هەر ئەوجۆرەی کە ئەم ئوستورلابە مسە ئاوێنەی فەلەکە، وجوودی مرۆڤیش ئوستورلابی هەقە. ئەگەر هەقتەعالا ئەوی شارەزا و زانا و ناسیاوی خۆی کردبێ، لە ئەستورلابی وجوودی خۆی دا، شۆقی هەق و جەماڵی بێهاوتای ئەو، پەیتاپەیتا و دەم بە دەم دەبینی و قەت ئەو جەماڵە لەم ئاوێنەیە بەتاڵ نابێ.

هەق بەندەی وای هەن کە خۆیان بە حیکمەت و زانست و کەرامەت دادەپۆشن، هەرچەند خەڵک ئەو چاوەیان نیە کە ئەوان ببینن، بەڵام لەبەر رادەی غەیرەت خۆ دادەپۆشن.

# ئەسڵ مەبەستە!

قسـە بۆ ئەو کەسـەیە کە پێویسـتی بە قسـە هەبێ تـا تێبگا. بەڵام ئەوەی کە بێ قسـە تێبگا، دەگەڵ ئەو چ پێویسـتـە قسـە کردن؟ ئاخـر، ئاسـمـانەکان و زەوییـەکان هەموو قسـەن لای ئەو کەسـەی کە تێدەگا و لە قسـە گووراوە. کەوایە، لای ئەو کەسە کە دەنگێکی کز دەبیسێ، قاوەقاو و بانگ چ پێویستە؟

شـاعیرێکی عـەرەبوێژ هاتە لای پادشـایەک و ئەو پادشـایە تورک بوو، فـارسیـشی نەدەزانی. شاعیر شێعرێکی زۆر رەوانی بە عەرەبی پێهەڵکوتبوو و هێنابووی. کاتێک پادشـا لە سـەر تەخت دانیـشـتـبوو و ئەهلی دیوان گـشـتی ئامـادە، ئەمـیـرەکـان و وەزیرەکان، وەها کە دابە، شـاعیر لە سەر پێ وەستا و شێعری دەست پێکرد. پادشا لەو شــوێنانـەی کـە پـەسن بوو، سـەری رادەوەشـاند و لەو شـوێنانەی کـە جـێگەی سەرسوڕامـان بوو، زەق دەبۆوە و لەو شوێنەی کە جێگەی تەربیـەت وخۆ بە کەم زانین بوو، لوتفی دەکرد. ئەهلی دیوان حـەیران مـانەوە کە « پادشـای ئێمـە وشـەیەکی بە عـەرەبی نەدەزانی. وەها سـەر راوەشـاندنێکی بەجـێ لە کۆڕ دا، چلۆن لەو پەیدا بوو؟ مـەگەر عـەرەبی زانیبێ و چەند سـاڵ لە ئێمـەی شـاردبێتـەوە و ئەگەر ئێمە بە زمـانی عەرەبی بێ ئەدەبیمان کردبێ، هاوار بە حاڵمان! »

ئەو غـولامێکی هـەبوو شاز. ئەهلی دیوان کۆ بوونەوە و ئەسپ و یەسـتـر و ماڵیـان دایە و پتـر لەوەشـیـان وە ئەستـۆ گرت کە « ئێمە لەم حـاڵە ئاگادار بکەوە کە پادشـا عەرەبی دەزانێ یا نازانێ و ئەگەر نازانێ، لە شـوێنی خۆی چۆن سـەری رادەوەشاند؟ کەرامات بوو؟ ئیلهام بوو؟ »

هـەتا رۆژێـک، غـولام لە راو هـەلی دەست کـەوت و پادشــای دڵخـۆش بینی. دوای ئەوە کـە نێـچیـرێکی زۆری گـرتبـوو، لێـیپـرسی. پادشـا پێکەنی. کوتـی « وەڵڵا من عـەرەبی نـازانم، بەڵام ئەوەی کە سـەرم راوەشـاند، یانی دەمـزانی کە مـەبەسـتی لەو شـێعرە چیـە و سـەرم راوەشـاند و پەسنم کرد کە دیـارە مـەبەسـتی ئەو لەو شـێعرە چیە. »

کەوایە دەرکەوت کە ئەسڵ مەبەستە. ئەو شێعرە فەرعی مەبەستە ـ کە ئەگەر ئەو مەبەستە نەبا، ئەو شێعرەی نەدەکوت. کەوایە ئەگەر لە مەبەست بڕوانن، دوویی نامێنێ. دوویی لە فەرع دایە. ئەسڵ یەکە. هەر ئەوجۆرەی، شێخەکان کە ئەگەر بە رواڵەت جۆراوجۆرن و بە حاڵ و کردەوە و کردار و قسەکان جیاوازن. بەڵام لە مەبەست دا یەک شتە و ئەویش داوای هەقە. وەها کە بایەک کە بە ماڵ دا دەگەڕێ. سووچی مافوورە هەڵدەداتەوە، لەرز و تەکانێک دە بەڕەکان دەخا، تۆز و خۆڵ بەرز دەکاتەوە، ئاوی حەوز چین چین دەکا، دارەکان و لقەکان و گەڵاکان وە سەما دەخا، چرا دەکووژێنێتەوە، ئاورگی دامرکاو دەبووژێنێتەوە و گڕی لێ بەرز دەکاتەوە: ئەو هەموو حاڵی جۆراوجۆر و جیاواز دەردەخا، بەڵام لە مەبەست و رەگەز و راستی دا یەک شتە، چونکە جووڵانەوەی هەموویان لە یەک باوەیە.

# من له شێعر بێزارم!

من خوویەکم هەیە کە ناخوازم هیچ دڵێک لە من بێشێ. ئەوەی کە جەماعەتێک لە سەماع دا خۆ لە من دەدەن و هەندێک لە یاران بەریان دەگرن، من ئەوەم پێخۆش نیە و سەدجار کوتوومە لەبەر من بە کەس هیچ مەڵێن ـ من بەو رازیم. ئاخر، من ئەوەندە ئاشـقم کە ئەم یارانەی دێنە لای من، لەبەر ئەوە کە مـەلوول نەبن، شـێعـرێک دەڵێم هەتا پێوەی بخافڵێن. دەنا من لە کوێ، شێعر لە کوێ؟ وەڵڵا کە من لە شێعر بێزارم و لای من لەمـە خـرابتر شـتـێک نیـە. هەر ئەوجـۆرەی کە کـەسـێک دەست دە ورگی حەیوان دەنێ و دەیشواتەوە، بۆ ئیشتیای میوان، چونکە میوان ئیشتیای لە گیپەیە، لێم پێویست کرا. ئاخر مرۆڤ دەڕوانێ کە خەڵک لە فلان شار چ شمەکێکیان دەوێ و چ شـمـەکێک دەکڕن. ئەویش دەیکڕێ و دەیفرۆشـێتـەوە ـ ئەگەر بنژیلترین کالاش بێ.

من گەلێکم خوێندوە لە زانستەکان و گەلێکم زەحمەت کێشاوە ـ کە زانایان و لێکۆڵەران و زیرەکـان و وردبینان بێنە لای من هەتا شـتـی گـرانبـایی و غـەریب و وردیان پێشکەش بکەم. هەقتەعالا، خۆی وای خواستوە، ئەو هەموو زانستەی لێرە کۆ کردەوە و ئەو زەحمەتانەی بۆ دانا کە من خەریکی ئەم کارە بم. چم پێدەکرێ؟ لە وڵاتی ئێمە و لە قەومی ئێمە دا، لە شاعیریی نەنگتر کارێک نەبوە. ئێمە ئەگەر لەو وڵاتە مـابایـنەوە، بە پێی مـەیلی ئەوان دەژیاین و ئەوەمـان دەکـرد کـە ئەوان دەیانەویست ـ وەک دەرس کوتنەوە و نووسینی کتێب و فێر کردن و وەعز کوتن و خۆپارێزیی و خۆ نواندن بە کاری رواڵەتیی. *

ئەمیر پەروانە بە منی گوت کە ئەسڵ عەمەلە.

گوتم کوا ئەهلی عەمەل و داواکاری عەمەل، هەتا عەمەلیان نیشان بدەم؟ هەرئێستا تۆ داواکاری قسەی ـ گوێت هەڵخستوە هەتا شتێک ببیسی و ئەگەر نەیڵێم، مەلوول دەبی. داواکاری عەمەل بە، هەتا نیشانی بدەم!

ئێمە لە عالەم دا، داواکاری پیاوێکین کە عەمەلی نیشان بدەین، کە مشتەری عەمەلمان نیە، مشتەری قسە دەدۆزینەوە، خەریکی قسەین. وە تۆ عەمەل چووزانی،

چونکە عامل نی؟ بە عەمەل عەمەل دەناسرێتەوە و بە عیلم عیلم فام دەکرێ و بە رواڵەت رواڵەت، بە مانا مانا. چونکە لەم رێگەیە دا رێبوار نیە و چۆلە. ئەگەر ئێمە بەرێوەین و لە عەمەل داین، چۆن دەتوانین ببینین؟ ئاخر، ئەم عەمەلە نوێژ و رۆژوو نیە و ئەمانە رواڵەتی عەمەلن، عەمەل مانایە دە دەروون دا. ئاخر، لە سەردەمی ئادەم هەتا سەردەمی مستەفا، نوێژ و رۆژوو بەم چەشنە نەبوە و عەمەل هەبوە. کەوایە ئەمە رواڵەتی عەمەلە. عەمەل مانایە دە مرۆڤ دا. هەر ئەوجۆرەی کە دەڵێی « دەرمان عەمەلی کرد » لەوێ رواڵەتی عەمەل نیە، ئیللا مانایە دەو دا و هەر ئەوجۆرەی کە دەڵێن ئەو پیاوە لە فلانە شار « عامل ـ ە » شتێک بە رواڵەت نابینین: ئەو کارانەی کە هی ئەوە، بە هۆی ئەو « عامل ـ ەوە » دەیڵێن.

کەوایە ئەم عەمەلە غەیری ئەمەیە کە ئەم خەڵکە تێیگەیشتوون. ئەوان پێیانوایە کە عەمەل ئەم رواڵەتەیە. ئەگەر مونافق رواڵەتی عەمەل بە جێ بێنێ، هیچ قازانجی بۆی هەیە؟ چونکە دەو دا مانای راستیی و ئیمان نیە.

ئەسڵی شتەکان هەمووی گفت و قسەیە. تۆ خۆت خەبەرت لە گفت و قسە نیە ـ بە سووکی دەبینی. گفت بەری درەختی عەمەلە ـ کە قسە لە عەمەل دەزێ. هەقتەعالا دونیای بە قسە خوڵقاند ـ کە گوتی « کن فیکون ». ئیمان دە دڵ دایە: ئەگەر بە قسە نەیڵێی، سوودی نیە. نوێژ کە فێعلە، ئەگەر قورئان نەخوێنیەوە، دروست نیە و لەم زەمانە دا کە دەڵێی « قسە جێی بەقا نیە؟» رەدی ئەم قسە دەکەیەوە دیسان بە قسە. چۆن قسە جێی بەقا نیە؟ چۆن لە تۆ ببیسین کە قسە جێی بەقا نیە؟ ئاخر، ئەمە بە قسە دەردەبڕی!

یەکێک پرسیاری کرد ئەگەر ئێمە خێر بکەین و چاکەی بکەین، ئەگەر هیوامان بە خودا هەبێ و چاوەڕوانی خێر و پاداش بین، ئایا ئەمە زیانمان پێدەگەیەنێ یان نا؟

فەرمووی ئەی وەڵلا؟ هیوات دەبێ هەبێ و ئیمان هەر ئەو ترس و هیوایەیە.

یەکێک لە منی پرسی کە ئەم هیوایە خۆی خۆشە. ئەم ترسە چیە؟

کوتم تۆ ترسێکم نیشان بدە بێ هیوا، یا هیوایەکم نیشان بدە بێ ترس! چونکە لە یەک جیا نین و بێ یەکتر نین. چۆن دەپرسی، بۆ وێنە یەکێک گەنمی داچاندوە، هەڵبەت گەنم شین دەبێ و سەرەڕای ئەوەش، دەترسێ کە نەکا بەرگر و بەڵایەک پەیدا بێ. کەوایە دەرکەوت هیوا بەبێ ترس نیە و قەت نابێ بە مێشکت دابێ ترس بێ

هیـوا یا هیـوای بێ ترس. جـا ئێـسـتـا، ئەگـەر هیـوادار بێ و چاوەڕوانی پاداش و بەخشین، بەبێ شک لەو کارە دا گەرمتر و شێلگیرتر دەبێ. ئەو چاوەڕوانییە باڵی ئەوە. هەرچی باڵ بەهێزتر، فڕینی پتر. ئەگەر هیوابڕاو بێ، تەنبەڵ دەبێ و خێر و بەندەیی لێدەرناکەوێ. هەر ئەوجۆرەی کە نەخۆش دەرمانی تاڵ دەخوا و لە دە چێژی شیرین خۆ دەپارێزێ. ئەگەر هیوای سلامەتی نەبێ، کەی تاقەتی ئەمە دێنێ؟

مرۆڤ بریتییە لە حەیوانەتی و نوتق. هەر ئەوجۆرەی کە حەیوانەتی هەمیشە تێدایە و لێی جیا نیە، نوتقیش هەروایە و هەمیشە تێیدایە. ئەگەر بە رواڵەت قسە نەکا، دە دەروون دا قسە دەکا. هەمیشە ناتقە. بە وێنەی لافاوە کە قوڕی تێکەڵ کراوە. ئەو ئاوە روونە نوتقی ئەوە و ئەو قوڕە حەیوانەتی ئەوە. بەڵام قوڕ دەو دا سەپێندراوە. نابینی ئەو قوڕ و قالبانە ڕۆیشتن و رزان، بەڵام نوتق و حەکایەتی ئەوان و زانستی ئەوان ماوەنەتەوە، لە چاک و خراپ؟

خاوەنی دڵ، کوللە. کە ئەوت بینی، گشتت بینیوە. خوڵقێنەرانی عالەم هەموو ئەندامەکانی ئەون و ئەو کوللە. ئەگەر ئەوت بینی کە کوللە، بێ شک هەموو عالەمت بینیوە و هەرکەس کە دوای ئەو ببینێ، دووپات بوونەوەیە. و قسەی ئەوان لە قسە دا کوللە: کە قسەی ئەوانت بیست، هەر قسەیەک لەمە بە دوا بیبیسی، دووپات بوونەوەیە.

* مەولەوی لە دیوانی شەمسیش دا ئیشارە بەمە دەکا:

شعر چه باشد بر من، تا که از آن لاف زنم    هست مرا فن دگر، غیر فنون شعرا

شعر چو ابریست سیه، من پس آن پرده چو مه    ابر سیه را تو مخوان، ماه منور به سما

# ئیبلیس ئەگەر هەیە، ئەمەیە!

ڕەزاگرانێک هات، لە سەرەوەی گەورەیەک دانیشت. *

فەرمووی کە « بۆ ئەوان چ تۆفیرێک دەکا: سەر یا ژێر، چران! »

چرا ئەگەر بەرزایی بخوازێ، بۆ خۆی ناخوازێ ـ مەبەستی ئەو قازانجی خەڵکە، هەتا ئەوان لە شۆقەکەی حەز وەرگرن. دەنا، چرا لە هەرکوێ بێ، ژێر یا سەر، ئەو چرایە، هەتاوێکی ئەبەدی.

ئەوان ئەگەر پلە و بەرزیی دونیا دەخوازن، مەبەستیان ئەوەیە کە خەڵک چاویان نیە بەرزایی ئەوان ببینن. ئەوان دەیانەوێ بە داوی دونیا ئەهلی دونیا ڕاو بکەن، هەتا ڕێیان دە بەرزایی دیکە بکەوێ و دە داوی ئاخرەت کەون. وەها کە مستەفا، مەککە و شارەکانی لەبەر ئەوە نەدەگرت کە موحتاجی ئەو بێ، بۆ ئەوە دەیگرت هەتا ژیان بە هەموان ببەخشێ و ڕووناکیان کەرەم بکا. [ئەمە دەستێکە کە خووی بە بەخشینەوە گرتوە، خووی نەگرتوە کە وەربگرێ!]**

ئەوان خەڵک هەڵدەفریوێنن هەتا خەلاتیان بکەن، نە بۆ ئەوەی کە شتێک لەوان وەربگرن. کەسێک کە داو بنێتەوە و باڵندە بە مەکر دە داو بخا و بیانخوا و بیانفرۆشێ، بەوە دەڵێن مەکر. بەلام ئەگەر پادشایەک داو بنێتەوە هەتا بازێکی بەستەزمانی بێبایی کە خەبەری لە گەوهەری خۆی نیە، بگرێ و دەستەمۆی سەر دەستی خۆی بکا، هەتا پێبگا و پێیبگەیەنێ و ڕای بێنێ، بەمە ناڵێن مەکر. هەرچەند ڕواڵەتی مەکرە. ئەمە بە عەینی ڕاستی، خەلات و بەخشین، مردوو زیندوو کردنەوە، بەرد کردنە لەعل و ئاوی پشتی مردووی پیاو ـ کردنە مرۆڤ، دادەنێن. هەروەتر، ئەگەر باز ئەو زانستەی هەبا کە بۆچ دەگرترێ، موحتاجی دانە نەدەبوو. بە گیان و دڵ لە داو دەگەڕا و بۆ سەر دەستی پادشا دەفڕی.

خەڵک ڕواڵەتی قسەکەی ئەوان لەبەر چاو دەگرن و دەڵێن « ئێمە قسەی وامان زۆر بیستوە ـ توێ لە سەر توێ. دەروونی ئێمە لەم چەشنە قسانە پڕە. » کافران دەیانگوت کە « دڵەکانی ئێمە کەلووی ئەم چەشنە قسانەیە و لەمە پڕین. » هەقتەعالا وەلامی ئەوان دەداتەوە کە « حاشا کە لەمە پڕ بن! پڕ لە وەسواس و خەیاڵن، پڕ لە

شرک و شک، پڕ له لەعنەتن.»

بریا بەتاڵ بان لەم وڕێنانە! ئادی، ئەگەر قابیل بان کە ئەمەشیان قەبووڵ کردبا، قابیلیش نین. هەقتەعالا مۆری بە گوێی ئەوانەوە ناوە، بە چاو و دڵی ئەوانەوە. هەتا چاو بە چەشنێکی دیکە ببینێ، یۆسف بە گورگ ببینێ، و گوێ بە لەونێکی دیکە ببیسێ، حیکمەت بە هەتڵە و وڕێنە دابنێ و دڵ بە چەشنێکی دیکە ـ کە بۆتە مەکۆی وەسواس و خەیاڵ. هەروەک زستان، لە شکڵ و خەیاڵ، توێ توێ کەوتوە، ئاخنراو لە سەهۆڵ و سەرما.

کاتێک هەقتەعالا، ئادەمی لە ئاو و گڵ ساز کرد و قالبەکەی داڕشت و چەند ماوەیەک لە سەر زەوی مابۆوە، ئیبلیس داهات و چوە نێو قالبی ئەوەوە و هەموو رەگەکانی گەڕا و تەماشای کرد و ئەو رەگ و دەمارە پڕ لە خوێن و خڵتەی دیت، گوتی « تەح، ئەو ئیبلیسەی کە من لە بناغەی عەرش دیتبووم کە پەیدا دەبێ، سەیرە ئەگەر ئەمە نەبێ. ئەو ئیبلیسە ئەگەر هەیە، ئەمەیە. »

* رەزاگران (ثقیل) مەبەستی لە شێخ شەرەفەددینی هەروی ـ یە کە لە زانایانی قۆنیە و هاوچەرخی مەولەوی ـ یە و لە کۆڕێک دا دێ و لە سەرەوەی حیسامەددینی چەلەبی دادەنیشێ.

** هذا کف معود بان یعطی ماهو معود بان یاخذ

# ئەم لەشە خاپێنەرێکی مەزنە!

سەراجەددین گوتی کە « مەسەلەیەکم کوت، دەروونم وە ژان کەوت! »

فەرمووی: ئەوە وەکیلێکە کە ناهێڵێ دەریبڕی. هەرچەند کە وەکیل بە چاو نابینی، بەڵام چونکە مەیل و هەست و ژان دەبینی، دەزانی کە وەکیلێک هەیە.

بۆ وێنە وە نێو ئاوێک دەکەوێ. نەرمایی گوڵەکان و گیایەکانت پێدەگا. کە بۆ لایەکەی دیکە دەچی، دڕکت تێدەچەقێ. دەرکەوت کە ئەولا دڕکستانە و ناخۆشیی و رەنجە و ئەملا گوڵستان و راحەتە ـ هەرچەند کە هەردووکیان نابینی. بەمە دەڵێن ویژدانێک، [کە] لە بینراو ئاشکراترە، بۆ وێنە برسیایەتی و تینوایەتی و غەزەب و شادیی، گشتی نادیارن، بەڵام لە بینراو ئاشکراترن. چونکە ئەگەر چاو هەڵێنی، هەستپێکراو نابینی، بەڵام دوور کردنەوەی برسیایەتی لە خۆ، بە هیچ فێڵ و تەڵەکەیەک ناتوانی. و هەروەتر، گەرمیی دە چێشتی گەرم دا و ساردیی و شیرینیی و تاڵیی دە تەعام دا، ناپەیدان، بەڵام لە هەستپێکراو ئاشکراترن.

ئاخر، تۆ چۆن سەیری ئەم لەشە دەکەی؟ تۆ چ پێوەندییەکت پێوەی هەیە؟ تۆ قایم بێ ئەوی، هەمیشە بێ ئەمەی. ئەگەر شەوە، خەمی لەشت نیە و ئەگەر رۆژە، خەریکی کاری، قەت دەگەڵ لەش نی. ئێستا، بۆ دەلەرزی لە سەر ئەم لەشە؟ کە سەعاتێک دەگەڵ ئەو نی، لە جێگەی دیکەی. تۆ لە کوێ و لەش لە کوێ؟ تۆ لە بیابانێک و من لە بیابانێکی دیکە.*

ئەم لەشە خاپێنەرێکی مەزنە. پێیوایە کە ئەو بمرێ، ئەویش دەمرێ. هەیهات! تۆ چ پێوەندییەکت بەم لەشەوە هەیە؟ ئەو چاوبەندێکی مەزنە. سێحربازەکانی فیرعەون، هەر زەڕڕەیەک تێگەیشتن، لەشی خۆیان بەخت کرد، خۆیان دیت کە قایمن بێ ئەم لەشە و لەش هیچ پێوەندییەکی بە ئەوانەوە نیە. و هەروەتر، ئیبراهیم و ئیسماعیل و نەبیەکان و وەلیەکان، کاتێک تێگەیشتن، لە لەش و بوون و نەبوونی ئەو رزگار بوون.

حەججاج بەنگی خواردبوو و سەری بە دەرگاوە نابوو، هاواری دەکرد کە « دەرگا مەبزێون بڵا سەرم نەکەوێ! »

پێیوابوو کە سەری لە لەشی جیایە و بە هۆی دەرگاوە قایمە.

حاڵی ئێمە و خەڵکیش هەروایە: پێیانوایە کە پێوەندیان بە لەشەوە هەیە یان قایم بە لەشن.

* انت فی واد و انا فی واد

# خۆبەکەمزانین حەزی دونیایە!

فەرمووی: لوتفەکانی ئێوە و هەوڵەکانی ئێوە و ئەو تەربیەتانەی کە دەیکەن، حازر و غایب، من ئەگەر لە شوکر و کڕنۆش و داوای لێبوردن کۆتایی دەکەم، بە رواڵەت لەبەر خۆ بە زۆر زانین نیە یا لەبەر وە پشت گوێ دان یا نازانم هەقی نیعمەتپێدراو کە دەبێ چ پاداشێکی بدرێ، بە قسە و بە کردار. بەڵام بڕوای پاکی ئێوەم زانیوە کە ئێوە خالیس بۆ خودا دەیکەن. منیش بە خودای دەسپێرم هەتا وڵامی ئەویش هەر خۆی بیداتەوە، چونکە بۆ ئەوت کردوە ـ چونکە ئەگەر من خەریکی وڵام دانەوە بم، بە زمان رێزت بگرم و پێتهەڵبڵێم، وەها دەبێ کە هەندێک لەو پاداشانەی کە هەق دەبێ بیدا پێتدەگا و هەندێک سزا. چونکە ئەم خۆبەکەمزانینانە و وڵام دانەوە و پێهەڵکوتنانە حەزی دونیان. چونکە لە دونیا دا رەنجت کێشاوە، وەک بەخشینی ماڵ و بەخشینی پلە، واباشترە کە عەوەزەکەشی ئەو بە تەواوەتی هەر هەق بیداتەوە. لەبەر ئەمە، وڵام نادەمەوە. دەربڕینی ئەوە کە وڵام دانەوە حەزی دونیایە. چونکە ماڵ ناخۆن ـ مەبەست لە غەیرەیە و مەبەست لە عەینە نیە. بە ماڵ، ئەسپ و کەنیز و غوڵام دەکڕن و پلە و پایەیان دەوێ، هەتا پەسنیان بکەن و پێیانهەڵبڵێن. کەوایە دونیا خۆی ئەمەیە کە ئەو گەورە و ڕێزدار بێ ـ پەسنی ئەو بکەن و پێیهەڵبڵێن.

شێخ نەساجی بوخاریی پیاوێکی گەورە بوو خاوەندڵ. زانایان و گەورەپیاوان دەهاتنە لای بۆ زیارەت، لە سەر چۆک دادەنیشتن. شێخ ئوممی بوو. دەیانەویست لە زمانی ئەوەوە ئەفسیری قورئان و حەدیسەکان ببیسن. دەیگوت « عەرەبی نازانم » ئەوان تەرجومەی ئایەتەکەیان دەگوت، ئەو تەفسیر و لێکدانەوەی دەست پێدەکرد و دەیگوت کە مستەفا لە فلان پلە دابوو کە ئەم ئایەتەی گوت و چلۆنایەتی ئەو پلەیە وەهایە و بەرزیی ئەم پلە و پایە و رێگاکانی ئەو و عورووجی ئەوی بە درێژە باس دەکرد. رۆژێک، عەلەوییەکی ناسیاوی قازی لە خزمەت ئەو دا پێیهەڵکوت و دەیگوت « قازیی وا دە دونیا دا نیە. بەرتیل وەرناگرێ، بێ مەیل و بێ خۆف، خالیس و موخلیس، لەبەر هەق، دە نێو خەڵک دا داوەریی دەکا. » گوتی « ئەمە کە دەڵێی بەرتیل وەرناگرێ، لە بنەڕەت درۆیە. تۆ پیاوێکی عەلەویی لە بەرەی مستەفا، پێیهەڵدەڵێی و پەسنی دەکەی کە بەرتیل وەرناگرێ. ئەمە بەرتیل نیە؟ لەمە باشتر چ بەرتیلێک هەیە کە رووبەڕوو باسی ئەو دەکەی؟ »

شێخەلاسلام[ی ترمذی] دەیگوت « سەید بورهانەددین قسەی پڕکاکڵی باش دەکا. چونکە کتێبی مەشایخ و ئەسرار و مەقالەکانی ئەوان دەخوێنێتەوە. »

یەکێک گوتی « ئاخر، تۆش دەیخوێنیەوە. چۆنە قسەی وا ناکەی؟ »

گوتی « ئەو دەرد و تێکۆشان و عەمەلێکی هەیە. »

گوتی « ئەی بۆ ئەوە ناڵێی و باسی لێوەناکەی و لە خوێندنەوە دەدوێی. ئەسڵ ئەوەیە. ئێمەش هەروا دەڵێین. تۆش ئەمە بڵێ! »

ئەوان دەردی دونیای دیکەیان نەبوو. تەواو، دڵیان بەم دونیایەوە بوو.

هەندێک بۆ نان خواردن هاتوون و هەندێک بۆ تەماشای نان ـ دەیانەوێ کە ئەم قسەیە فێر بن و بیفرۆشنەوە. ئەم قسەیە هەروەک یار و بووکە. کەنیزێکی جوان کە بۆ فرۆشتنەوە بیکڕی، چ خۆشەویستییەکی دەدەیەی و چ دڵێکی پێدەسپێری؟ چونکە لەززەتی ئەو تاجرە لە فرۆشتنەوە دایە. ئەو لە پیاوەتی کەوتوە، کەنیز بۆ فرۆشتنەوە دەکڕێ. ئەو ئەو پیاوەتییەی نیە کە کەنیز بۆ خۆی بکڕێ. ژنانیلەیەک ئەگەر شمشیرێکی شازی هیندیی دەست کەوێ، ئەو بۆ فرۆشتنەوە دەکڕێ، یا کەوانێکی پاڵەوانیی دەست کەوێ، ئەویشی بۆ فرۆشتنەوە دەوێ. چونکە ئەو، ئەو باسکەی نیە کە کەوانی پێبکێشێتەوە. ئەو کەوانی بۆ ژێ دەوێ و ئەو توانایی ژێی نیە: ئەو بایخی ئەوە و کاتێک بیفرۆشێتەوە ئەو ژنانیلەیە، پارەکەی دەدا بە سوراوسپیاو و وەسمە. چی دیکەی پێدەکرێ؟ کە ئەو بفرۆشێتەوە باشتر لەو چی پێدەکرێ.

## عالەم بە وێنەی کێوە!

جەوهەر خادمی سوڵتان پرسیاری کرد کە « دە ژیان دا کەسێک پێنج جار تەڵقین دەدەن. [دیسان] تێناگا و ناچێتە مێشکیەوە، دوای مەرگ پرسیاری چی لێدەکەن؟ - کە دوای مەرگ، وڵامی پرسیارەکانیشی فەرامۆش کردوە. »

کوتم: ئەوەی کە فێر بوە چۆن فەرامۆشی دەکا، بەڵام بێ شک ساف دەبێ هەتا شیاوی ئەو پرسیارە فێرنەکراوانە بێ.

ئەم ساتە کە تۆ وشەکانی من - لەو دەمەوە هەتا ئێستا - دەبیسی، هەندێکی قەبووڵ دەکەی کە وێنەکەیت بیستوون و قەبووڵت کردوون. هەندێکیان نیوە قەبووڵ دەکەی و لە سەر هەندێک دەوەستی و باسی لە سەر دەکەی. ئەم رەد و قەبووڵ و باسی دەروونی تۆ کەس دەیبیسێ؟ لەوێ ئامرازێک نیە. هەرچەند گوێت هەیە. لە دەروونەوە دەنگێک ناگاتە گوێت. ئەگەر دەروون بپشکنی، هیچ وێژەرێک نادۆزیەوە. ئەو هاتنەی تۆ بۆ زیارەت عەینی پرسیارە بێ زار و زمان - کە « رێگایەکمان پێبنوێن و ئەوەی نواندووتانە روونـاکتری بکەن! » و ئەم دانیشتنی ئێمە دەگەڵ ئێوە، خامۆش یا بە قسە، وڵامی ئەو پرسیارە نهێنیانەی ئێوەیە. کە لێرەوە بچیەوە خزمەتی پادشا، هەر ئەو پرسیارەیە دەگەڵ پادشا و ئەو وڵامە. وە پادشا بێ زمان، هەموو رۆژ، پرسیاری لە بەندەکانە کە « چلۆن دەوەستن و چلۆن دەخۆن و چلۆن دەڕوانن؟ » ئەگەر کەسێک دە دەروون دا نەزەرێکی خراپی هەبێ، بێشک وڵامەکەشی خراپ دێ و ناتوانێ وڵامی راست بداتەوە. وەها کە کەسێک لاڵەپەتە بێ، هەرچەند بیەوێ قسەی دروست بکا، ناتوانێ. زێڕینگەر کە زێڕ لە بەرد دەدا، پرسیارە و وڵام: زێڕ وڵام دەداتەوە کە ئەمەم - خەوشم یا بێخەوشم. برسیایەتی پرسیارە لە سروشت کە « لە خانی لەش دا کەمایەسی هەیە - خشتم بدەیە، گڵم بدەیە! » خواردن وڵامە کە « بگرە! » نەخوارن وڵامە کە « هێشتا حەوجێم پێی نیە، ئەو چینەیە هێشتا ویشک نەبۆتەوە، ناکرێ چینەی لە سەر دانێن! » تەبیب دێ، نەبزی دەگرێ، ئەوە پرسیارە. لێدانی رەگەکان وڵامە. چاو لە قاروورە کردن پرسیارە و وڵامە بێ قسە کردن. دەنک دە زەوی نان، پرسیارە کە « من فلان میوەم گەرەکە! » درەخت رسکان، وڵامە، بێ قسەی زمان. چونکە وڵام بێ وشەیە، پرسیاری بێ وشەشی گەرەکە. یا

ئەوەکــە دەنکەکــە رزابوو، درەخت نــارِسکێ. ئەویش پرســیــار و وڵامــە. نەرِسکانی درەخت تەرکی وڵامە، بەڵام بێ شک وڵامە.

هەر حەرِەکەتێک کە مرۆڤ دەیکا، پرسیارە و هەرچی کە بۆی دێتە پێش، لە غەم و شادیی، وڵامە. ئەگەر وڵامی خۆش ببیسێ، دەبێ کە شوکر بکا و شوکریش ئەوەیە کە هاوجنسی ئەو پرسیارە بکا کە لەو پرسیارە ئەو وڵامەی دەست کەوت. ئەگەر وڵامی ناخۆشی بیست، تۆبەی بکا دەستبەجێ و ئیدی لەم چەشنە پرسیارانە نەکاتەوە. تێنەگەیشتن کە وڵام بە پێی پرسیاری ئەوانەوەیە و وڵامی پرسیاری خۆیان دەبینن، دەیانگوت « ئەم وڵامە ناحەزە، شیاوی ئەو پرسیارە نیە. » و نەیاندەزانی کە دووکەڵ لە ئێزنگەوە هەڵدەستێ، نەک لە ئاگر. ئێزنگ هەرچی ویشکتر، دووکەڵەکەی کەمتر. گوڵستانێکت بە باغەوانێک سپارد، ئەگەر بۆنی ناخۆشی لێبێ بوختان لە باغەوان بدە، نەک لە گوڵستان. »

گوتی « دایکت بۆ کوشت؟ »

گوتی « شتێکم دیت، شیاو نەبوو. »

گوتی « دەبا بێگانەکەت کوشتبا! »

گوتی « هەر رۆژ یەکێک بکوژم؟ ئەوم کوشت و لە کوشتنی خەڵک رزگارییم هات.»

نووکە، هەرچی دێتە پێش، نەفسی خۆت ئەدەب بکە، هەتا هەر رۆژ شەرِ دەگەڵ یەکێک نەکەی.

ئەگەر دەڵێن « کل من عنداللە* » دەڵێین بێ شک. توورە بوون لە نەفسی خۆ و عالەمێک رزگار کردنیش من عنداللە. وەها کە یەکێک لە سەر درەختی هەڵوێنی میوەی دەوەراند و دەیخوارد. خاوەنی باغ پرسیاری لێکرد، گوتی « لە خودا ناترسی؟ »

گوتی « بۆ بترسم؟ درەخت هی خودا و من بەندەی خودا. دەیخوا بەندەی خودا لە ماڵی خودا. »

گوتی « بوەستە هەتا وڵامت دەمەوە! »

پەتی هێنا و ئەوی لەم درەختە بەستەوە و لێیدەدا هەتا وڵام دەرکەوێ.

هاواری کرد کە « لە خودا ناترسی؟ »

گوتی « بۆ بترسم ـ کە تۆ بەندەی خودای و ئەمە داری خودا. داری خودا دەکوتم لە بەندەی خودا. »

ئاکام ئەمەیە کە عالەم بە وێنەی کێوە. هەرچی بڵێی، لە خێر و شەڕ، لە کێو هەمان دەبیسیەوە. ئەگەر پێتوابێ کە « من باشم گوت، کێو ناحەزی وڵام داوە، » مەحاڵە کە بولبول هاواری کێو بکا، دەنگی قەل لە کێو بگەڕێتەوە یا دەنگی مرۆڤ یا زەڕەی کەر. کەوایە دڵنیا بە، وەک کەر زەڕاندووتە!

* سوورەی النساء ئایەی ٧٨

# عالەم ئاوێنەیە ـ
# وێنەی خۆتی تێدا دەبینی!

گوتی کە « ئێمە خەتاکارین! »

فەرمووی: کەسێک کە ئەم بیرەبکا و بە گڕ خۆی دابێ کە « ئاخ ـ چمە و بۆچ وادەکەم؟ » ئەمە هۆی دۆستایەتی و عینایەتە. چونکە بە گڕ دۆست دادەچێ، نەک بێگانە. نووکە، ئەم بە گڕ داچوونەش جۆراوجۆرە: بۆ ئەو کەسەی کە ئێشی پێدەگا و هەستی پێدەکا، هۆی مەحەببەت و عینایەتە. بەڵام ئەگەر بە گڕی دابچێ و ئەو نەیەشێنێ ئەمە هۆی خۆشەویستی نیە. وەها کە فەرشێک بە دار دەکوتن هەتا تۆز لێی جیا بێتەوە، زانایان بەمە ناڵێن بە گڕ داچوون. بەڵام ئەگەر منداڵی خۆی و خۆشەویستی خۆی بکوتێ، بە گڕ داچوون بەمە دەڵێن و هۆی خۆشەویستی لە وەها شوێنێک دەردەکەوێ. کەوایە مادام دە خۆت دا دەرد و پەشیمانییەک دەبینی، هۆی سەرنج و دۆستایەتی هەقە. ئەگەر دە برای خۆت دا عەیب دەبینی، ئەو عەیبە دە تۆ دایە کە دەو دا دەیبینی. عالەم هەروەک ئاوێنەیە: وێنەی خۆتی تێدا دەبینی. ئەو عەیبە لە خۆت جیا کەوە! چونکە ئەوەی کە لەو دەڕەنجی، لە خۆت دەڕەنجی.

دەگێڕنەوە فیلێکیان هێنا سەر کانی ئاو بخواتەوە. خۆی دە ئاو دا دەدیت و دەسڵەمیەوە. ئەو پێیوابوو لە هی دیکە دەسڵەمێتەوە. نەیدەزانی کە لە خۆی دەسڵەمێتەوە.

هەموو کردەوەیەکی خراپ ـ لە زوڵم و قین و ئێرەیی و تەماح و بێبەزەیی و خۆ پێ زۆر بوون ـ چونکە دە تۆ دایە، ناڕەنجی، کە ئەوان دە کەسێکی دیکە دا دەبینی دەسڵەمیەوە و دەڕەنجی. کەوایە بزانە لە خۆت دەڕەنجی و دەسڵەمیەوە.

مرۆڤ لە گولیی و کوانی خۆی هێڵنجی نایە. دەستی بریندار دە چێشت دەنێ و بە ئەنگوستی خۆی دەیلێسێتەوە و دڵی پێی تێکەڵ نایە. کاتێک دە کەسێکی دیکە دا کوانێکی چووک یا نیوەبرینێک ببینێ، ئەو چێشتە بە گەرووی دا ناچێتە خوار و دڵی نایبا. هەروەها کردەوە وەک گولیی و کوانە: چونکە دەو دایە، لێی ناڕەنجێ و لە هی دیکە دا کە هەندێک ببینێ، دەڕەنجێ و بێزار دەبێ. هەر ئەوجۆرەی کە تۆ لەو دەسڵەمیەوە، ئیزن بدە ئەویش لە تۆ بسڵەمێتەوە و بڕەنجێ. ڕەنجانی تۆ عوزری

ئەوە، چونکە رەنجی تۆ لە دیتنی ئەوە و ئەویش هەر ئەوە دەبینێ.

ئیماندار ئاوێنەی ئیمانداره! نەیانکوتوە کافر ئاوێنەی کافره؛ چونکە لەبەر ئەوە نیە کە کافر ئاوێنەی نیە، ئیللا ئەوەیە لە ئاوێنەی خۆی خەبەری نیە.

پادشایەک، دڵتەنگ، لە دەم جۆبارێک دانیشتبوو. ئەمربەرەکان و وەزیرەکان لەو ترساو و هەراسان و [ئەو] بە هیچ لەونێک رووی نەدەکراوە. ویشکەڕنێکی هەبوو زۆر نزیک. ئەمربەرەکان وە ئەستۆیان گرت کە « ئەگەر پادشا وە پێکەنین بخەی، ئەو هێندەت دەدەینێ! »

ویشکەڕن چوە لای پادشا و هەرچی هەوڵی دا، پادشا چاوی لێنەکرد و سەری هەڵنەهێنا کە ئەو ئەدایەک دەربێنێ و پادشای وە پێکەنین بخا: چاوی لە جۆبار دەکرد و سەری هەڵنەدێنا.

ویشکەڕن بە پادشای گوت کە « چ دە ئاوی جۆ دا دەبینی؟ »

گوتی « قورمساغێک دەبینم. »

ویشکەڕن وڵامی داوە کە « ئەی پادشای عالەم، بەندەش کوێر نیم! »

نووکە وەهایە: ئەگەر تۆ دەو دا شتێک دەبینی و دەڕەنجی، ئاخر ئەویش کوێر نیە ـ هەر ئەوەی دەبینێ کە تۆ دەیبینی.

## مرۆڤ: نیوه فریشتەی نیوه حەیوان!

[ئەمیر] نایب گوتی کە « پێشتر، کافرەکان بوتیان دەپەرست و کڕنۆشیان بۆ دەبرد. ئێمە لەم سەردەمەش دا هەر ئەوەی دەکەینەوە. ئەوە کە دەچین و کڕنۆش بۆ مەغوول دەبەین و خزمەتیان دەکەین و خۆمان پێ موسڵمانە و چەند بوتی دیکەمان دە دەروون دایە وەک تەماح و هەوەس و قین و ئێرەیی و ئێمە گوێڕایەڵی ئەمانەین. کەوایە ئێمەش، بە رواڵەت و بە دەروون، هەر ئەو کارەی دەکەین و خۆشمان پێ موسڵمانە. »

مەولانا فەرمووی: بەڵام لێرە شتێکی دیکە هەیە. چۆن ئەوەتان بە مێشک دادێ کە ئەمە خراپە و پەسند نیە؟ بێشک دیدەی دڵی ئێوە شتێکی بێهاوتا و بێوێنە و گەورەی دیوە کە ئەو [شتە] ئەوانە ناحەز و کرێت دەکا. ئاوی سوێر بۆ کەسێک سوێرە کە ئاوی شیرینی خواردبێتەوە [ئەشیا بە دژی خۆیان دەناسرێنەوە]*. کەوایە هەقتەعالا نووری ئیمانی دە دڵی ئێوە ناوە کە ئەم کارانەتان پێ ناحەزە؟ ئاخر، لە ئاست جوانیی دا ئەمە ناحەز دەنوێنێ، دەنا خەڵکی دیکە کە ئەم دەردەیان نیە، لەوەی کە هەن شادن و دەڵێن « خۆی، هەروابوە! »

هەقتەعالا ئەوەتان دەداتێ کە ویستی ئێوەیە، هیممەتی ئێوە ئەگەر هەبێ، دەبێتە ئەوەی کە ویستووتانە. [مەل بە باڵەکانی دەفڕێ و ئیماندار بە هیممەتی]**

خەڵک سێ تاقمن:

مەلایکەن ـ کە ئەوان ئەقڵی کوللن. تاعەت و بەندایەتی و زیکر بۆ ئەوان زەوادە و چێشتە و پێخۆرە و حەیاتە. هەروەک ماسی نێو ئاو: ژیانی ئاوە و جێ و نوێنی، ئاو. ئەو لە سەر ئەوان ئەرکێکی دانەناوە، چونکە لە شەهوەت بێبەرییە و پاکە. کەوایە چ منەتێک هەیە ئەگەر هەوەسباز نەبێ یا ئارەزووی هەوا و نەفسی نەبێ؟ چونکە لەمانە پاکە و ئەو هیچ هەوڵێکی بۆ نادا و ئەگەر تاعەت بکا، بە حیسابی تاعەتی دانانێن، چونکە زاتی وەهایە و بێ ئەو ناتوانێ ببێ.

تاقمێکی دیکە، گیاندارەکانن ـ کە ئەوان شەهوەتی کوللن. ئەقڵی بەرگریان نیە.

ئەوان هیچ ئەرکێکیان لە سەر نیە.

ماوە مرۆڤی بەستەزمان ـ کە بریتییە لە ئەقڵ و شەهوەت: نیوەی فریشتەیە و نیوەی حەیوان. نیوەی مارە و نیوەی ماسی. ماسی بەرەو ئاوی دەبا و مار بەرەو خاک. هەمیشە لە کێشە و شەڕ دایە. جا ئێستا، هەندێک مرۆڤ ئەوەند ئەقڵیان رەچاو کرد کە بە تەواوەتی بوونە فریشتە و نووری کولل ـ ئەوانیش ئەنبیا و ئەولیان. لە خۆف و هیوا رزگاریان بوو. هەندێک شەهوەت بە سەر ئەقڵیان دا زاڵ بوو هەتا بە تەواوەتی حوکمی حەیوانیان وە خۆ گرت. هەندێک لە شەڕ و کێشە دا مانەوە و ئەوانیش ئەم تایفەیەن کە دە دەروونیان دا رەنج و ژان و هاوار و حەسرەتێک پێکدێ و لە ژیانی خۆیان رازی نین. ئەوانە ئیماندارەکانن. ئەولیا چاوەڕوانی ئەوانن کە ئیمانداران بگەیەننەوە مەنزڵی خۆیان و وەک خۆیانیان لێبکەن و شەیتانیش چاوەڕوانە کە ئەوان بۆ ئەسفەلەسافەلین، بەرەو خۆیان بکێشێ.

ئێمە ئەمیرمان بۆ دونیا و تەربیەت و عیلم و عەمەل خۆش ناوێ. خەڵکی دیکە لەبەر ئەمە خۆشیان دەوێ ـ کە رووی ئەمیر نابینن، پشتی ئەمیر دەبینن. ئەمیر هەروەک ئاوێنەیە و ئەم سفەتانەی هەروەک دوڕی تاکانە و زێڕ بە پشت ئاوێنەوەیە. ئەوانەی کە گیرۆدەی زێڕ و گەوهەرن، چاویان لە پشت ئاوێنەیە و ئەوانەی کە گیرۆدەی ئاوێنەن، چاویان لە زێڕ و دوڕ نیە، هەمیشە روویان دە ئاوێنەیە و ئاوێنەیان لەبەر ئاوێنەیەتی خۆش دەوێ. چونکە دە ئاوێنە دا رووی جوان دەبینن، لە ئاوێنە مەلوول نابن. بەڵام ئەوەی کە رووی ناحەز و عەیبداری هەیە، دە ئاوێنە دا ناحەزێتی دەبینێ، زوو ئاوێنە وەردەگێڕێ و داخوازی ئەو گەوهەرانە دەبێ. جا ئێستا ئەگەر لە پشت ئاوێنە هەزار چەشنە نەقش ساز بکەن و گەوهەری پێوە بنێن، رووی ئاوێنە چ زیانێکی پێدەگا؟

نووکە، هەقتەعالا حەیوانیەت ومرۆڤایەتی لێکداوە هەتا هەردووک دەرکەون ـ چونکە مانا لێدانەوەی شتێک بێ دژی ئەو [شتە] ناگونجێ و هەقتەعالا، دژی نەبوو. کەوایە ئەم عالەمەی خوڵقاند کە لە تاریکییە، هەتا نوورەکەی دەرکەوێ. هەروەتر، ئەنبیا و ئەولیای دەریتەوە و ئەوان نوێنگەی نوور و هەقن، هەتا دۆست و دوژمن دەرکەون و خۆیی لە بیانی شازتر بێ ـ کە ئەو مانایە لە رووی ماناوە دژ نین، ئیللا لە رواڵەت دا نەبێ: هەر ئەو جۆرەی کە لە ئاست ئادەم، ئیبلیس. لە ئاست مووسا، فیرعەون. لە ئاست ئیبراهیم، نەمروود و لە ئاست مستەفا، ئەبووجەهل... کەوایە بە

هۆی ئەولیاوە، خودا دژی دەردەکەوێ ـ هەرچەند لە مانا دا دژی نیە. ئەوەند کە دوژمنایەتی و دژایەتییان دەکرد، کاریان وە برەو دەکەوت و بەناوبانگتر دەبوون.

گەلێک کەس هەن کە هەقتەعالا ئەوان بە نیعمەت و ماڵ و زێڕ و میرایەتی عەزاب دەدا بەڵام گیانیان لەمە رادەکا.

* و بضدها تتبین الاشیاء

** الطیر یطیر بجناحیه و المومن یطیر بهمته

## دەبێ هەتاو بی هەتا ترسی جیاییت نەمێنێ!

مەولانا فەرمووی « ئارەزووی دیدارمان هەیە. بەڵام چوونکە دەزانین کە ئێوە بە بەرژەوەندیی خەڵکەوە خەریکن، زەحمەت دوور رادەگرین!

[ئەمیر] گوتی: ئەمە لە سەر ئێمە واجب بوو بە خزمەت بگەین. ترسمان رێنیشت و لەمە بەدوا، بە خزمەت دەگەین! »

فەرمووی کە « فەرقێک نیە: هەموو یەکن. ئێوە ئەو لوتفەتان هەیە کە هەموو یەک بن. دەگەڵ زەحمەتەکان چۆنی؟ بەڵام چونکە دەزانین ئەوە ئێوەن کە ئیمڕۆ خەریکی خێرات و چاکەن، بە ناچار روومان دە ئێوە کرد.

ئەم ساعەتە لەمە دەدواین کە ئەگەر پیاوێک خێزانی هەبێ و ئەویدی نەیبێ، لەو دەبڕن و دەیدەن بەم. ئەهلی رواڵەت دەڵێن کە « لە خێزاندار دەبڕی و دەیدەی بە بێ خێزان؟ » کە بڕوانی، ئەو بۆ خۆی لە راستی دا خێزاندارە. هەر ئەوجۆرەی کە ئەهلی دڵێک کە جەوهەری هەبێ بۆ بەرژەوەندیی نهێنی لە کەسێکی باتڵ بدا بۆ تەربیەتا و سەر و لووت و دەمی بشکێنێ، هەموو دەڵێن کە ئەم مەزلوومە و ئەو زاڵم. بەڵام بە لێکدانەوە، مەزلووم ئەو کەسەیە کە وەشاندوویەتی. زاڵم ئەو کەسەیە کە مەسڵەت ناکا. ئەو لێدان وێکەوتوو و سەرشکاوە زاڵمە و وەشێنەر بێشک، مەزلوومە. چونکە ئەمە خاوەن جەوهەرە و فەوتاوی هەقە، کردەوەی ئەو کردەوەی هەقە. بە خودا ناڵێن زاڵم. هەر ئەوجۆرەی کە مستەفا دەیکوشت و خوێنی دەڕشت و تالانی دەکرد، زاڵم ئەوان بوون و ئەو مەزلووم. بۆ وێنە مەغرەبییەک کە لە مەغریب نیشتەجێیە. مەشرقییەک هاتە مەغریب. غەریب ئەو مەغریبیەیە. بەڵام ئەمە چ غەریبێکە کە لە مەشرقەوە هاتوە؟ چونکە هەموو عالەم یەک ماڵە. لەم ماڵە بۆ ئەو ماڵە چوو، یا لەم سووچەوە بۆ ئەو سووچ. ئاخر، مەگەر هەر دەو ماڵە دانیە؟ بەڵام ئەو مەغریبییە کە جەوهەری هەیە، لە دەرەوەی ماڵەوە هاتوە. هەر ئەوجۆرەی کە مستەفا تێکشکا مەزلووم بوو، کە تێکیشکاندیش مەزلووم بوو. چونکە لە هەر دوو حاڵ دا، هەق بە دەست ئەوەوە بوو. مەزلووم ئەو کەسەیە کە هەق بەوبێ.

مستەفا دڵی بە ئەسیرەکان سووتا. هەقتەعالا بۆ خاتری پێغەمبەر وەحی نارد کە

« بڵێ بەوان: لەم حاڵە دا کە ئێوە لە کۆت و زنجیر دان، ئەگەر نیەتی خێر بکەن، هەقتەعالا ئێوە رزگار دەکا و ئەوەی لە کیستان داوە، دەتانداتەوە و دوو هێندەی ئەو و لێ خۆش بوون و بەهەشت لە ئاخرەت دا. »

دوو گەنج: یەکیان ئەوەی کە لە کیستان داوە و یەکیان گەنجی ئاخرەت.

پرسیاری کرد کە « ئەگەر بەندە عەمەلی خێربکەم؟ ئەو تۆفیق و خێرە لە عەمەلەوە سەر هەڵدەدا یا خەڵاتی هەقە؟ »

فەرمووی کە « خەڵاتی هەقە و تۆفیقی هەقە، بەڵام هەقتەعالا لە بەر لوتفی زۆر، هەردووک بە بەندەی دەبەخشێ. دەفەرموێ کە: هەردووک هی تۆیە. »

گوتی: چونکە خودا ئەو لوتفەی هەیە، کەوایە هەرکەس داوای هەقیقی بکا، دەیبینێتەوە.

فەرمووی: بەڵێ بەڵام بێ سالار نابێ، وەها کە قەومی مووسا چونکە گوێڕایەڵی مووسا بوون، دەریاکان رێگەیان لێدەرکەوت و تۆزیان لە دەریا هەڵدەستاند و بە سلامەت تێدەپەڕین. بەڵام کە دژایەتیان دەست پێکرد، لە فلانە بیابان چەند ساڵ مانەوە. سالار ئەوەدەمە لە هەوڵی چاک کردنی ئەوان دادەبێ کە سالار بۆی دەرکەوێ کە ئەوان لە بەندی ئەو دان و گوێڕایەڵ و فەرمانبەری ئەون. بۆ وێنە ئەگەر چەند سپایەک لە خزمەتی میرێک دا گوێڕایەڵ و فەرمانبەر بن، ئەویش ئەقڵ و بیری خۆی بۆ کاری ئەوان وە کار دەخا و هەوڵی چاک کردنی ئەوان دەدا، بەڵام کە گوێڕایەڵ نەبن، کەی بۆ ساز کردنی حاڵی ئەوان ئەقڵی خۆی خەسار دەکا؟

ئەقڵ دە لەشی مرۆڤ دا هەروەک میرێکە. مادام رەعیەتەکانی لەش گوێڕایەڵی ئەو بن، هەموو کارەکان چاک رێک دەکەون، بەڵام کە گوێڕایەڵ نەبن، هەموو تووشی خراپە دێن. نابینی کاتێک کەسێک دێ مەست، لەم دەست و پێ و زمان و رەعیەتەکانی گیان چ خراپەیەک سەر هەڵدەدا؟ رۆژی دوایی دوای ئەغیاریی، دەڵێ «ئاخ، چم کرد و بۆ وەشاندم و بۆچ جوێنم دا؟ » کەوایە کاتێک کارەکان چاک دەچنە پێش کە لەو گوندە دا سالارێک هەبێ و ئەوان گوێڕایەڵی بن. نووکە، ئەقڵ کاتێک لە فکری چاک کردنی ئەو رەعیەتانە دا دەبێ کە گوێڕایەڵی ئەو بن. بۆ وێنە کاتێک ئەقڵ بیری کردەوە کە « برۆم » وەختایەک دەڕوا کە پێ لە ژێر فەرمانی ئەو دا بێ، دەنا ئەم بیرە ناکاتەوە.

نووکە، هەر ئەوجۆرەی کە ئەقڵ دە نێو هەست و لەش دا میرە، ئەم گیانانەی دیکە کە خەڵکن، ئەوان وێگڕا بە ئەقڵ و زانست و روانگە و بۆچوونی خۆیانەوە، لە چاو ئەو وەلییە، بە تەواوەتی لەشن و ئەقڵ ئەوە دە نێوان ئەوان دا. نووکە، خەڵک کە ـ لەشن ـ ئەگەر گوێڕایەڵی ئەقڵ نەبن، حاڵی ئەوانیش بە پرێشانیی و پەشیمانیی تێدەپەڕێ. بەڵام ئەگەر گوێڕایەڵ بن، وەهایان لێبێ کە هەرچی ئەو بیکا، گوێڕایەڵیی بکەن و لە ئەقڵی خۆیان نەپرسن، چونکە لەوانەیە بە ئەقڵی خۆیان تێینەگەن. دەبێ کە گوێڕایەڵیی ئەو بکەن. هەر ئەوجۆرەی کە منداڵێک لای جلدرووییەک بە شاگرد دادەنێن، دەبێ گوێڕایەڵی وەستای بێ: ئەگەر پینەی دایە کە بیدروێ، پینەی بدروێ و ئەگەر تەقەڵ، تەقەڵی لێدا و ئەگەر دەیەوێ فێرە جل دروون بێ، دەبێ دەستەڵاتی خۆی بە تەواوەتی بەر بدا و مەحکوومی دەستی وەستا بێ.

هیوامان هەیە لە هەقتەعالا حاڵەتێک پێکبێنێ کە عینایەتی ئەوە ـ کە سەرووتر لە سەدهەزار هەوڵ و کۆششە. کاتێک عینایەتی ئەو بگاتێ، کاری سەدهەزار هەوڵ دەکا و پتر. تێکۆشان باشە و قازانجی زۆرە، بەڵام لە ئاست عینایەت چیە؟

پرسی کە « عینایەت هەوڵ پێکدێنێ؟ »

گوتی: بۆ پێکیناهێنێ؟ کە عینایەت بێ، هەوڵیش دێ. عیسا چ هەوڵێکی دا کە دە لانکە دا گوتی « انی عبدالله* »؟ یەحیا هێشتا دە زگی دایکی دابوو کە باسی ئەوی دەکرد.

گوتی: بۆ مەحەممەد بێ هەوڵ بوو؟

گوتی: ئەوە فەزلی هەقە و خەڵاتێکی مەحز، دەنا بۆ هاورێکانی دیکە کە نزیکی ئەو بوون وایان لێنەهات؟ لە پێشدا فەزلە و دوایە هەوڵ. فەزل هەروەک ئاورینگە. ئەو ئاورینگە فەزل و خەڵاتی هەقە، بەڵام کە لۆکەت وەبەرنا ئەو ئاورینگە پەروەردە دەکەی و پەرەگری دەکەی. لە پێشدا خەڵاتە و ئاخر فەزل و جەزایە. مرۆڤ، سەرەتا، چووک و زەعیفە، هەر ئەوجۆرەی کە لە بەرد و ئاسن پریشکێک بپەڕێتە سەر پەڕۆی سووتاو. لە پێشدا زەعیفە، بەڵام کاتێک ئەو ئاگرە کزە پەروەردە بکەن، دەبێتە عالەمێک و جەهانێک دەسووتێنێ و ئەو ئاگرە چووکە گەورە و مەزن دەبێ.

گوتیان بە مەولانا « ئەمیر ئێوەی گەلێک خۆش دەوێ! »

فەرمووی کە « نە هاتنی من بە قەرا دۆستایەتییە و نە گوتنی من. ئەوەی کە بە سەر زارم دا دێ، دەریدەبڕم. ئەگەر خودا بیەوێ، ئەوەندە قسە کەمە دەکاتە قازانج و

دە دەروونی سینەی ئێوەی داوێ، هەتا گەلێک کەلک بدا و ئەگەر نەیەوێ، سەدهەزار قسەی گوتراو هیچی دە دڵ دا قەرار ناگرن ـ تێدەپەڕن و فەرامۆش دەکرێن. هەروەک ئاوینگێک کە بکەوێتە سەر پەڕۆی سووتاو: ئەگەر هەق بیەوێ، ئەو پریشکە دەگرێ و پەرەگر دەبێ و ئەگەر نەیەوێ، سەد ئاوینگ دەپەڕێتە سەر ئەو پەڕۆ سووتاوە و هیچ کاری لێناکا. »

ئەم قسانە سپای هەقن، قەڵاکان بە دەستووری هەق دەکەنەوە و دەیگرن. ئەگەر بە چەند هەزار سوار بفەرموێ کە « برۆن، روو دەو قەڵایە کەن، بەڵام مەیگرن » وەها بکەن و ئەگەر بە سوارێک بفەرموێ کە « ئەو قەڵایە بگرە » هەر ئەو تاکە سوارە دەروازە دەکاتەوە و دەیگرێ. مێشوولەیەکی لە سەر نەمروود دانا و فەوتاندی. ئەگەر هەقتەعالا بەرەکەت بدا، دانگێک کاری هەزار دینار دەکا و پتریش، و ئەگەر بەرەکەت لە هەزار دینار ببڕێ، کاری دانگێک ناکا. هەروەتر ئەگەر پشیلەی لە سەر دانێ ئەو بفەوتێنێ و ئەگەر شێری لە سەر دانێ، شێر لەو بترسێن یان ببنە گوێدرێژی ئەو. هەر ئەوجۆرەی کە هەندێک لە دەرویشەکان سواری شێر دەبن. هەر ئەوجۆرەی کە ئاگر لە سەر ئیبراهیم سارد بۆوە ـ بێ ئازار و بوو بە شیناوەرد و گوڵ و گوڵجار ـ چونکە دەستووری هەقی لە سەر نەبوو کە بسووتێنێ. بە گشتی، چونکە ئەوان تێگەیشتن کە ئەوانە گشتی لە هەقەوەیە، لای ئەوان گشت بوو بە یەک شت.

هیوادارین کە ئێوەش ئەم قسانە لە دەروونی خۆتان دا ببیسن ـ کە قازانج ئەوەیە. ئەگەر هەزار دزی دەرەوەیی بێن، ناتوانن دەرگا بکەنەوە، هەتا لە ئەندەروونەوە دزێک یارمەتیان نەدا و لە ئەندەروونەوە نەیکاتەوە. هەزار قسە لە دەرەوە بکە! هەتا لە ئەندەروون دا راوێژکارێک نەبێ، کەلکی نیە. هەر ئەوجۆرەی کە درەختێک هەتا تەڕایی دە ریشەکەی دا نەمابێ، ئەگەر هەزار لافاوی ئاوی تێگری، کەلکی نیە. لە پێشدا تەڕایی دە ریشە دا پێویستە، هەتا ئاو بتوانێ یارمەتیدەری بێ. ئەگەر نوور هەموو عالەم داگرێ، هەتا چاو نووری نەبێ، قەت ئەو نوورە نابینێ. نووکە، ئەسڵ ئەو توانایییە کە دە نەفس دا هەیە. نەفس شتێکی دیکەیە و رووح شتێکی دی. نابینی کە نەفس لە خەو دا بۆ کوێ دەچێ؟ رووح دە لەش دایە، بەڵام نەفس دەگەڕێ و دەبێتە شتێکی دیکە.

بۆ وێنە ئاوێنەیەکی چووکت بە دەستەوە گرتوە. ئەگە دە ئاوێنە دا باش بنوێنێ،

گەورە بنوێنێ، چووک بنوێنێ، هەر ئەوەیە. بە قسە مەحاڵە تێبگەن. بە قسە هەر ئەوەندە دەکرێ کە تاسەیەک دەو بخا کە « لە دەرەوەی ئەوە کە ئێمە دەیڵێین، عالەمێک هەیە: بڵا داوای بکەین! »

ئەم دونیا و خۆشییەکانی نەسیبی حەیوانەتی مرۆڤە. تەواوی ئەوانە هێزی حەیوانیی ئەو دەیکا و ئەوەی ئەسڵە ـ کە مرۆڤە ـ لەبەر خۆشییەکانی حەیوانیی لە کەم بوونەوە دایە. کەوایە مرۆڤ دوو شتە: ئەوەی کە لەم دونیایە دا هێزی حەیوانیی ئەوە، کە ئەمە مەیل و ئارەزووکانن. بەڵام ئەوەی کە گردەگۆی ئەو و ئەسڵ و خۆراکی ئەوە، عیلم و حیکمەت و دیداری هەقە. ئەوەی کە دە مرۆڤ دا حەیوانەتی ئەوە لە هەق رادەکا و مرۆڤایەتییەکەی لە دونیا رادەکا.

دوو کەس دەم لەشە دا لە شەڕن ـ هەتا بەخت روو لە کامەیان بکا و کامەی خۆش بوێ. لەمە دا شک نیە کە ئەم عالەمە بەفرانبارە بۆ جەماد. بۆ دەڵێین جەماد؟ چونکە هەموو بەستوویانە ـ ئەم بەرد و کێو و جلە کە دەبەرت کردوە، هەموویان بەستوویانە. ئەگەر بەفرانبار نیە، عالەم بۆ بەستوویەتی؟ مانای عالەم بەربڵاوە، وەبەر چاو نایە. بەڵام بە هۆی کار تێکردن دەزانین کە با و سەرمایەک هەیە. ئەم عالەمە وەک مانگی بەفرانبارە کە هەموو بەستوویانە. چ بەفرانبارێک؟ بەفرانباری عەقڵ، نەک بەفرانباری هەست. کاتێک هەوای خودایی دابێ، کێوەکان دەتوێنەوە، عالەم، دەبێتە ئاو ـ هەر وەک چۆن کاتێک گەرمای تەمووز دادێ، هەموو بەستەڵەکەکان دەتوێنەوە. رۆژی قیامەتیش، کە ئەو هەوایە دابێ، هەموو دەتوێنەوە.

هەقتەعالا ئەم وشانە بکاتە لەشکری ئێمە لە دەوری ئێوە، هەتا بەری دوژمنی پێبگرێ، هەتا ببێتە هۆی زاڵ بوون بە سەر دوژمنەکان دا. دوژمنی وا هەیە دوژمنی دەروون. ئاخر، دوژمنی دەرەوە هیچ نین. چن ئەوان؟ نابینی چەند هەزار کافر ئەسیری یەک کافرن کە پادشای ئەوانە و ئەو کافرەش ئەسیری بیر؟ کەوایە زانیمان کە کار بیر دەیکا. چونکە بە بیرێکی لاوازی شێواو، چەند هەزار خەڵک و عالەم ئەسیرن. لەو شوێنەی کە بیر بێبن بێ بڕوانە کە چ شکۆ و مەزنایەتییەکی هەیە و چۆن بە سەر دوژمنەکان دا زاڵ دەبێ و چها عالەم داگیر دەکا! کە بە ئاشکرا دەبینن سەدهەزار روخساری لە رادە بەدەر و سپای بێ بڕانەوە ـ سارا لە سەر سارا ـ ئەسیری کەسێکن و ئەو کەسە ئەسیری بیرێکی چووک، کەوایە گشتیان ئەسیری یەک بیرن. جا تۆ بڕوانە کە بیری مەزنی بێبنی پیرۆزی بەرز چۆن دەبێ! کەوایە زانیمان کار بیر دەیکا، روخسارەکان هەموو ئامرازن و لە ژێر فەرمانی ئەو دان و

بێ بیر مەحتەل کەوتوون و جەمادن. کەوایە ئەوەی کە روو ببینێ، ئەویش جەمادە و ڕێی نەبردۆتە ماناوە و منداڵ و نابالغە ـ هەرچەند بە روخسار پیر و سەد ساڵەیە.

کەوایە کار بیرەکان دەیکەن کە بەبێ نێویژیی لەش خەریکن. هەر ئەوجۆرەی کە ئەقڵی کارا بێ هیچ ئامرازێک چەرخ دەگەڕێنێ. ئاخر، دەڵێن کە موحتاجی ئامراز نیە چونکە قایم بە غەیرە. قایم بە غەیریش نامێنێتەوە. چونکە ئەم جەوهەرە [یا قایم بە زاتە] وەک نافەی میسکە و ئەم عالەم و خۆشییەکانی وەک بۆنی میسک. ئەم بۆنە نامێنێتەوە، چونکە قایم بە غەیرە. هەرکەسێک لەم بۆنە میسکی داوا کرد نەک بۆنەکەی و بە بۆنەکەی رازی نەبوو، باشە. بەڵام ئەوەی کە بە بۆنەکە رەزای دا، ئەوە خراپە، چونکە دەستی لە شتێک داوە کە لە سەر دەستی نامێنێتەوە. چونکە بۆن سفەتی میسکە. ئەوەند کە میسک رووی لەم عالەمەیە، پێیدەگا. کە حیجابی بە سەر دا بکێشرێ و روو دە عالەمی دیکە بکا، ئەوانەی کە زیندوو بە بۆن بوون، دەمرن. چونکە بۆن خزمەتکاری میسکە، چوە ئەو شوێنەی کە میسک خۆ دەردەخا. کەوایە بەختەوەر ئەو کەسەیە کە لە بۆنەوە بەو بگا و وەک وی لێبێ. دوای ئەوە، ئەو فەنا نابێ و وەک زاتی میسک دەمێنێتەوە و حوکمی میسک دەگرێ. دوای ئەوە، ئەو دەگەیەنێتە عالەمی بۆن و عالەم زیندوو بەو دەبن. ئەو جگە لە ناوێک چی دیکە نیە. وەها کە ئەسپێک یا حەیوانێک لە خوێجاڕ دا ببێتە خوێ. ئەو جگە لە ناوی ئەسپ هیچی بۆ نەماوە ـ هەر ئەو دەریا خوێیەیە لە کار و کردەوە دا. ئەو ناوە چ زیانێکی پێدەگەیەنێ؟ لە خوێیەتی دەری ناکەن و ئەگەر ئەو کانگای خوێیە ناوێکی دیکەی لێبنێی، لە خوێیەتی دەرناکەوێ.

کەوایە مرۆڤ لەو خوشی و لوتفانە کە تیشک و وێنەی هەقیقەتە دەبێ تێپەڕێ و بەوەندە رازی نەبێ. هەرچەند ئەوەندەش لە لوتفی هەقەوەیە و تیشکی جەمالی ئەوە، بەڵام نامێننەوە ـ بۆ هەق دەمێنێەوە، بۆ خەڵک نامێنێتەوە. هەروەک تیشکی هەتاو کە لە ماڵان دەدا، سەرەڕای ئەوە کە تیشکی هەتاوە و شۆقە، بەڵام خزمەتکاری هەتاوە: کە هەتاو ئاوا بێ، رووناکی نامێنێ. کەوایە دەبێ هەتاو بی هەتا ترسی جیاییت تێدا نەمێنێ.

شانس هەیە و شارەزایی. هەندێک پێدراون و بەختیان هەیە، بەڵام شارەزاییان نیە و هەندێک شارەزاییان هەیە، بەڵام شانسیان نیە. بەڵام کە ئەم دوانە پێکەوەبن، سەیر رێک دەکەوێ، وەها کەسێک بێوێنە دەبێ. وەک ئەوە: بۆ وێنە کابرایەک رێ دەبڕێ، بەڵام نازانێ کە کە ئەمە رێیە یا لاڕێیە کە دەیبڕێ، بەو هیوایە قووقەی

کەڵەبابێک یا نیشانی ئاوەدانییەک دەرکەوێ. ئەمە لە کوێ و ئەوە لە کوێ کە ڕێگا دەزانێ و دەڕوا و موحتاجی نیشان و عەلامەتێک نیە؟ کار ئەو دەیکا! کەوایە شارەزایی لە سەرووی هەموو شتێکە.

* سوورەی مریەم ئایەی ٣٠

# غیرەت وەلا بنێ!

شەو و رۆژ خەریکی کێشەی و داخوازی چاک کردنی ئەخلاقی ژنی و پیسایی ژن بە خۆت پاک دەکەیەوە. خۆت دەو دا پاک کەیەوە باشترە هەتا ئەو دە خۆت دا پاک بکەیەوە! خۆت بەو پاک بکەوە! بۆ لای ئەو بچۆ و ئەوەی کە ئەو بیڵێ بە جێی بگەیەنە، هەرچەند ئەم قسەیە لای تۆ مەحاڵ بێ: غیرەت وەلا بنێ! ـ سەرەڕای ئەوە کە کردەوەیەکی پیاوانەیە ـ کە بەم کردەوە باشە، گەلێک کردەوەی خراپ دە تۆ دا سەر هەڵدەدەن.

بۆ ئەم مانایە، پێغەمبەر فەرمووی « لا رهبانیة فی الاسلام! » ـ کە رەبەنەکان ئیشیان رێگای خەڵوە و لە کێو مانەوە و ژن نەخواستن و تەرکی دونیا، بوو. خودا ئاهەرێیەکی باریک و شاراوەی بە پێغەمبەر نواند و ئەو چیە؟ ژن خواستن! هەتا جەوری ژنان بکێشێ و مەحاڵەکانی ئەوان ببیسێ و لێی توورە بی و خۆی پاک بکاتەوە. جەوری کەس کێشان و تاقەتی مەحاڵ هێنان، وەهایە کە پیسایی خۆت لەوان هەڵدەسووی. خوڵقی تۆ لەبەر سێبووریی باش دەبێ و خوڵقی ئەوان خراپ لەبەر تێراخوڕین و تەعەدا. جا کە ئەوەت زانی، خۆت پاک کەوە! ئەوان هەروەک پەڕۆ دابنێ کە چڵکی خۆت بەوان پاک دەکەیەوە و پاک دەبیەوە! ئەگەر بە نەفسی خۆشت ناوێری، بە ئەقڵەوە وەهای دانێ کە « وەهای دادەنێم کە مارە کردنێک دە ئارا دا نەبوە، دۆستێکە خەراباتی هەرکاتێک کە هەوەس بە سەرم دا زاڵ بوو، دەچمە لای ئەو. » بەم چەشنە پیاوەتی و ئێرەیی و غیرەت لە خۆت دوور کەوە، هەتا ئەودەمی کە جیا لەو بەڵێنە، لەززەتی تێکۆشان و تەحەمول رووت تێبکا و لە مەحالاتی ئەوان حاڵی جۆراوجۆرت لێدەرکەوێ. دوای ئەوە، بێ ئەم بەڵێنە، تۆ دەبیە موریدی تەحەمول و تێکۆشان و حەیف خواستن ـ چونکە بە ئاشکرا سوودی خۆتی تێدا دەبینی.

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر دەگەڵ ئەسحابەکانی لە خەزا گەڕابوونەوە. فەرمووی کە « تەپڵ لێدەن کە: ئیمشەو لەبەر دەروازەی شار دەخەوین و سبەی وەژوور دەکەوین. »

گوتیان « یا رەسووڵەڵلا، لەبەر چ بەرژەوەندییەک؟ »

گوتی « بەشکەم ژنەکانتان دەگەڵ پیاوی بێگانە ببین و دەردەدار بن و فیتنە ساز بێ. »

یەکێک لە ئەسحابەکان گوێی نەدایە. دەرچوو. ژنی خۆی دەگەڵ بێگانە بینی.

نووکە، ڕێگای پێغەمبەر ئەمەیە کە « دەبێ ڕەنج بکێشی بۆ دوور کردنەوەی غیرەت و پیاوەتی و ڕەنجی نەفەقە و داوێنی ژن و سەدهەزار ڕەنجی بێحەد بچێژی، هەتا عالەمی مەحەممەدیی ڕوو دەرخا. » ڕێبازی عیسا: خەبات و خەڵوەت و خۆ لە هەوەس پاراستنە. ڕێبازی مەحەممەد جەور کێشان و خەمی ژن و خەمی خەڵکە.

کە ناتوانی بە ڕێبازی مەحەممەد دا بڕۆی، کەوایە ڕێبازی عیسا بگرە، هەتا بە تەواوەتی بێبەش نەبی! ئەگەر سەفایەکی هەیە کە سەد زللە دەخۆی و بەر و بەرهەمی ئەو دەبینی یان بڕوات بە غەیب هەیە، چونکە فەرموویانە و خەبەریان داوە کە وەها شتێک هەیە، « سەبر دەگرم هەتا سەردەمایەک ئەو بەرهەمەی کە خەبەریان لێداوە، بگاتە منیش » دوای ئەوە دەیبینی ـ چونکە دڵت لەوە ناوە ـ کە « من لەو ڕەنجانە هەرچەند ئێستا بەرێکم دەست نەکەتوە، لە ئاکام بەو گەنجانە دەگەم » و بە گەنج دەگەی و پتر لەوەش کە تۆ هیوا و تەماحت پێیهەبوو.

ئەم قسەیە ئەگەر ئێستا کارت تێنەکا، دوای ماوەیەک کە پوختەتر بووی، گەلێکت کار تێدەکا.

ژن چیە؟ عالەم چیە؟ بڵێی و نەڵێی، ئەو هەر هەمانە و کاری خۆی وەلا نانێ ـ و بە کوتنیش کاری تێناکا و خرابتری دەکا. بۆ وێنە نانێک بێنە، وە بن هەنگڵتی بدە و لە خەڵکی مەنع کە و بڵێ کە « هەڵبەت ئەوە نادەمە کەس. چۆن دەیدەم؟ ـ تەنانەت نیشانیشی نادەم. » سەرەڕای ئەوە کە لەبەر دەرگاکان کەوتوە و سەگیش نایخۆن لەبەر زۆریی و هەرزانیی نان، بەڵام کە مەنعت دانا، هەموو مەیلی دەکەن و بە شوێن ئەو نانەوەن و دێنە سەلا و تکا کە « هەڵبەت ئەو نانەی کە مەنعی دەکەی و دەیشارییەوە دەمانەوێ بیبینین. » بە تایبەت کە ئەو نانە ساڵێک وە بن باغەڵتی بدەی و موباڵغە و داکۆکی بکەی لە سەر نەدان و نیشان نەدان، مەیلیان بۆ ئەو نانە لە حەد تێدەپەڕێ ـ کە الانسان حریص علی ما منع.

هەرچەند کە ئەمر بە ژن بکەی کە « خۆت بشارەوە » ئەو مەیلی خۆ نواندنی پتر

دەبێ و خـەڵک لە خـۆ شـاردنەوەی ئـەو مـەیلی پتـریان دەکـەوێتـە سـەر. کـەوایە تۆ دانیشـتووی و دوومـەیل لە دوو لا زیاد دەکـەی و لات وایە کە ئیسـلاح دەکەی؟ ئەوە خـۆی عـەینی فـەسادە. ئەگـەر ئەو گەوهـەرێکی هەبێ کـە نەیەوێ کاری خـراپ بکا، مـەنعی بکەی و نـەکـەی، ئەو بـە پێی تەبـعی باشی خـۆی و زاتی پاکـی خـۆی دەڕوا. ڕزگار بە و خەم مەخۆ! ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوە بێ، دیسان هەروا بە پێی شێوازی خۆی دەڕوا. مەنع جگە لە زیاد کردنی مەیل چی دیکە ناکا.

## ده مرۆڤ دا ئەشق و ئێش و دڵویست و دڵخوازییەک هەیە!

ده مرۆڤ دا ئەشق و ئێش و خوتخوته و دڵویست و دڵخوازییەک هەیە کە ئەگەر سەدهەزار عالەم ببێتە ملکی ناحەسێتەوە و ئارام ناگرێ. ئەم خەڵکە بە ورد بوونەوە لە هەر پیشە و سەنعەت و مەنسەب و زانستی ئەستێرەناسی و پزشکی و غەیرە خەریک دەبن و هیچ ئارام ناگرن، چونکە ئەوەی کە مەبەستە، دەست نەکەوتوە. ئاخر، بە مەعشووق دەڵێن « دلارام » یانی دڵ بەو ئارام دەگرێ ـ کەوایە بە غەیر چۆن ئارام دەگرێ؟ تەواوی ئەم خۆشی و مەبەستانە وەک پەیژەن. پلەکانی پەیژە شوێنی نیشتەجێ بوون و مانەوە نین، بۆ تێپەڕینن. خۆزگە بەوەی کە زووتر وە خەبەر بێ و ئاگادار بێ، هەتا ڕێگای درێژی لێ کورتتر بێتەوە و لە سەر ئەو پلانەی پەیژە عومری خۆی زایە نەکا.

پرسیاری کرد کە « مەغوول ماڵی ئێمە دەستێنن و ئەوانیش جار و بار ماڵمان پێدەبەخشن، حوکمی ئەوە چۆن دەبێ؟ »

فەرمووی « هەرچی مەغوول بیستێنێ، وەهایە کە کەوتبێتەوە قەبزە و خەزێنەی هەقەوە. وەها کە: لە دەریا گۆزەیەک یا کووپەیەک پڕ کەی و هەڵیبنجی. ئەوە دەبێتە ملکی تۆ. هەتا دە نێو گۆزە و کووپە دایە، کەس هەقی نیە دەستی بە سەر داگرێ. هەرکەس لەو کووپەیە بەرێ بەبێ ئیزنی تۆ، دەستدرێژکەرە. بەڵام کە دە دەریا بکرێتەوە لە هەموو کەس حەلاڵ دەبێ و لە ملکی تۆ دەچێتە دەر. کەوایە ماڵی ئێمە لەوان حەرامە و ماڵی ئەوان لە ئێمە حەلاڵە. »

مستەفا هەوڵی لێک کۆوە بوونی دەدا ـ کە لێک کۆبوونەوەی رووحەکان شوێنی گەورە و گران دادەخا. لە تاکیی و تەنیایی دا ئەمە دەست ناکەوێ. رازی ئەوە کە مزگەوتیان ساز کردوە: هەتا خەڵکی گەڕەک لەوێ کۆ بنەوە و رەحمەت و فایدە زێدەتر بێ. ماڵەکانی جیاواز بۆ تەفریق و داپۆشینی عەیبە ـ فایدەی ئەو ئەمەیە.

مزگەوتی جامیعیان داناوە هەتا خەڵکی شار لەوێ بن و کەعبەیان واجب کردوە هەتا زۆربەی خەڵکی عالەم، لە شارەکان و وڵاتەکان، لەوێ کۆ بنەوە.

گوتی: مەغوول دە پێشدا کە هاتنە ئەم وڵاتە، رووت و قووت بوون. یەکسمیان گا بوو و چەکیان چێویی. ئێستا، دەوڵەمەند و تێر بوون و ئەسپی عەرەبی هەرەباش و چەکی هەرەچاک لای ئەوانە.

فەرمووی: ئەودەم کە دڵشکاو و لاواز بوون و هێزێکیان نەبوو، خودا یارمەتی دان و نیازی پێکهێنان. ئێستا کە وەها دەوڵەمەند و هێزدار بوون، هەقتەعالا بە کزیی خەڵک دەیانفەوتێنێ هەتا بزانن کە ئەوە عینایەتی هەق و یارمەتی هەق بوو کە ئەوان عالەمیان گرت، نە بە زۆر و بە هێز.

ئەوان سەرەتا لە سارایەک بوون دوور لە خەڵک، بێ ئەنوا و هەژار و رووت و ئاتاج. جگە لە هەندێکیان کە بۆ تەجارەت دەهاتنە وڵاتی خارەزمشا و شتێکیان دەکڕی و دەفرۆشت، کەرباسیان دەکڕی بۆ داپۆشینی لەشی خۆیان. خارەزمشا بەری دەگرتن و دەیفەرموو کە تاجرەکانی ئەوان بکووژن و هەستەی لێدەستاندن و نەیدەهێشت بازرگانەکان بچنە وێ. تەتەرەکان هاواریان بۆ پادشای خۆیان برد کە «تێداچووین! » پادشای ئەوان دە رۆژ مۆڵەتی خواست و رۆیشت و لە بنەبانی ئەشکەوت دە رۆژ رۆژووی گرت و لالاوە و پاڕاوە.

لە هەقتەعالاوە خەبەر هات کە « پاڕانەوەی تۆم قەبووڵ کرد دەرکەوە! بۆ هەرکوێ کە بچی سەر دەکەوی! »

ئەوە بوو کە دەرکەوتن، بە ئەمری هەق سەر کەوتن و عالەمیان داگرت.

گوتی: تەتەرەکانیش بروایان بە حەشر هەیە و دەڵێن یەرغوویەک دەبێ و ویست و پرسیار و حیسابێک دەبێ.

فەرمووی کە: درۆ دەکەن. دەیانەوێ کە خۆ دەگەڵ موسڵمانەکان شەریک بکەن کە یانی « ئێمەش دەزانین و بڕوامان پێیە. »

لە وشتریان پرسی کە « لە کوێوە دێی؟ »

گوتی « له حەمام »

گوتیان کە « لە چۆکتەوە دیارە! »

نووکە ئەگەر ئەوان بڕوایان بە حەشرە، کوا نیشان و عەلامەتی ئەو؟

ئەو گوناھ و زوڵم و خراپەیە ھەروەک سەھۆڵ و بەفرن، توێ لە سەر توێ کۆ بوونەوە. کاتێک ھەتاوی تۆبە و پەشیمانیی و خەبەری دونیای دیکە و ترسی خودا دەرکەوێ، ئەو بەفرانەی گوناھ ھەمووو دەتوێنەوە ـ ھەروا کە بەفر و سەھۆڵ دەتوێنێتەوە، ئەگەر بەفر و سەھۆڵێک بڵێ کە « من ھەتاوم دیوە و ھەتاوی تەمووز لە منی داوە » و ئەو بەرقەرار بەفر و سەھۆڵە، ھیچ ئاقڵێک ئەمە باوەڕ ناکا. مەحاڵە کە ھەتاوی تەمووز تیشک باوێژێ و بەفر و سەھۆڵ نەتوێنێتەوە.

ھەقتەعالا ھەرچەند وەعدەی داوە کە جەزای چاکە و خراپە لە قیامەت دا دەبێ، بەڵام ھاووێنەکەی دەم بە دەم و سات بە سات دەگا. کاتێک مرۆڤ شادییەکی دە دڵ دەکەوێ، جەزای ئەوەیە کە کەسێکی شاد کردوە و ئەگەر غەمین بێ، کەسێکی غەمین کردوە. ئەمە دیاریی عالەمی دیکەیە و نوێنەری ڕۆژی جەزایە، ھەتا بەم کەمە ئەو زۆرە فام بکا ـ ھەروەک لە ئەنبارێک گەنم، مشتێک گەنم بنوێنێ.

مستەفا سەرەڕای ئەو ھەموو گەورەیی و مەزنایەتییە، شەوێک دەستی وە ژان کەوت. وەحی ھات کە « لەبەر ژانی دەستی عەبباسە » ـ کە ئەسیریان کردوە و دەگەڵ ئەسیرەکانی دیکە، دەستیان بەستوون.

سەرەڕای ئەوەکە بەستنی دەستی ئەو بە ئەمری ھەق بوو، دیسان جەزا گەیشت، ھەتا تێبگەی کە ئەم گرفت و تاریکایی و ناخۆشییانە کە بە سەر تۆ دا دێ، لەبەر ئازار و تاوانێکە کە کردووتە، ھەرچەند تۆ بە وردیی لە بیرت نین کە چی و چیت کردوە، بەڵام لە جەزاوە تێبگە کە کاری خراپت زۆر کردوە و لێت روون نیە کە ئەوە خراپە ـ یا لەبەر غەفڵەت، یا لەبەر جەھل، یا لەبەر ھاونشینیی بێدینێک کە گوناھەکانت بۆ ھاسان دەکاتەوە کە ئەو بە گوناھ دانانێ. سەیری جەزا بکە ھەتا بزانی چەندەت فەرعانە ھەیە و چەندە گرفت! بێ شک گرفت جەزای گوناھە و فەرعانە پاداشی تاعەت.

ئاخر، مستەفا لەبەر ئەوە کە ئەنگوستیلەی دە ئەنگوستی دا دەگەڕاند، عیتاب ھات کە « تۆمان بۆ بێکاریی و یاریی نەخوڵقاندوە! »

لێرەوە قیاس بکە کە ڕۆژی تۆ بە گوناه تێدەپەڕێ یا بە تاعەت!

مووسای بە خەڵک خەریک کرد. هەرچەند بە ئەمری هەق بوو و بە تەواوەتی خەریکی هەق بوو، بەڵام خەریکی خەڵکی کرد بۆ بەرژەوەندیی و خزری بە تەواوەتی خەریکی خۆی کرد. مستەفای سەرەتا بە تەواوەتی خەریکی خۆی کرد، دوای ئەوە ئەمری کرد کە « خەڵک بانگەواز بکە و نەسیحەتیان بکە و چاکیان بکە! »

مستەفا وە هاوار و ناڵە کەوت کە « ئاخ، یارەب، چ گوناهێکم کردوە؟ بۆچ من لە حەزرەت دەردەکەی؟ من خەڵکم ناوێ! »

هەقتەعالا گوتی « ئەی مەحەممەد، هیچ غەم مەخۆ ـ کە ناهێڵم خەریکی خەڵک بی! سەرەڕای ئەوە کە خەریکی، دەگەڵ منی و سەرەمووییەک لەوەی کە ئەم ساتە دەگەڵ منی، کە دەگەڵ خەڵک خەریک بی، هیچ لەو لە تۆ کەم نابێتەوە. هەر کارێک کە بکەی، عەینی وەسڵ دەبێ. »

پرسیاری کرد « حوکمەکانی ئەزەلی و ئەوەی هەقتەعالا دیاری کردوە، هیچ دەگۆڕدرێن؟ »

فەرمووی « هەقتەعالا ئەوەی کە حوکمی کردوە لە ئەزەل کە خراپە خراپەی بە دواوە دەبێ و چاکە چاکە، ئەو حوکمە قەت ناگۆڕدرێ، چونکە هەقتەعالا حەکیمە. کێ دەڵێ کە « تۆ خراپەی بکە هەتا چاکەت دەست کەوێ؟ » قەت کەسێک گەنم دادەچێنێ، جۆ هەڵگرێتەوە یا جۆی دادەچێنێ، گەنم هەڵگرێتەوە؟ ئەوە مومکین نیە و هەموو ئەولیا و ئەنبیا وەهایان گوتوە کە « جەزای چاکە چاکەیە و جەزای خراپە خراپە. » لە حوکمی ئەزەلی ئەمەت دەوێ کە کوتم و لێکم داوە، قەت ناگۆڕدرێ ـ مەعازەڵڵا. ئەگەر دەتەوێ کە جەزای چاکە و خراپە زیادتر بێ و بگۆڕدرێ، یانی ئەوەند کە چاکەی پتر بکەی و چاکەکان پتر بن و ئەوەند زوڵم پتر بکەی خراپەکان پتر بن، ئەوە دەگۆڕدرێ، بەڵام ئەسڵی حوکم ناگۆڕدرێ. »

فزوولێک پرسیاری کرد کە « ئێمە دەبینین کە چارەڕەشێک بەختەوەر دەبێ و بەختەوەرێک چارەڕەش دەبێ. »

فەرمووی « ئاخر، ئەو چارەڕەشە چاکەی کرد یا بە چاکە بیری کردوە کە بەختەوەر بوو و ئەو بەختەوەرەی کە چارەڕەش بوو، خراپەی کرد یا بە خراپە بیری کردوە کە چارەڕەش بوو. هەرئەوجۆرەی کە ئیبلیس کاتێک لە هەق ئادەم دا گازندەی

کرد کە منت لە ئاگر و ئەوت لە خاک خوڵقاندوە!* سەرەڕای ئەوە کە ئوستادی مەلەک بوو، بوو بە مەلعوونی ئەبەد و دەرکراوی دەرگا. ئێمەش هەر ئەوەی دەڵێینەوە کە جەزای چاکە چاکەیە و جەزای خراپە خراپەیە. »

پرسیاری کرد کە « یەکێک نەزری کرد کە: ڕۆژێک ڕۆژووی بگرم! ئەگەر بیشکێنێ، کەفارەتە یا نا؟ »

فەرمووی کە « لە مەزهەبی شافەعی دا بە قەولێک، کەفارەتە، چونکە ئەو نەزرە بە سوێند دادەنێ و هەر کەس سوێند بشکێنێ لێی دەبێتە کەفارەت. بەڵام لای ئەبوو حەنیفە، نەزر بە مانای سوێند نیە، کەوایە کەفارەت نیە.

کەسێک کەرێکی ون کردبوو. سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بوو، بە نیەتی ئەوە کە کەرەکەی ببینێتەوە. دوای سێ ڕۆژ کەرەکەی بە تۆپیویی دیتەوە. دڵی ئێشا و بە دڵێشاویی سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردوە و گوتی کە « ئەگەر لەبری ئەو سێ ڕۆژوویە کە گەرتم، شەشەکانی ڕەمەزان نەخۆم، پیاو نەبم، دەتەوێ قازانجم لێوەرگری؟ »

یەکێک پرسیاری کرد کە « مانای: « التحیات » چیە و « صلوات » و « طیبات »؟

فەرمووی « یانی ئەم، پەرستن و خزمەت و بەندەیی و چاوەدێرییانە لە دەستمان نایە و بەوانمان ڕزگاریی نابێ. کەوایە وە ڕاست گەڕا کە طیبات و صلوات و تحیات هی خودایە ـ هی ئێمە نیە. هەموو هی ئەوە و مڵکی ئەوە. هەرئەوجۆرەی کە وەرزی بەهار، خەڵک کشتوکاڵ دەکەن و وە دەشت دەکەون و سەفەر دەکەن و خانووبەرە ساز دەکەن. ئەوانە هەموو بەخشین و خەڵاتی بەهارە دەنا ئەوان هەر ئەوجۆرەی کە بوون، حەبسی ماڵ و ئەشکەوتەکان دەبوون. کەوایە لە ڕاستی دا، ئەم کشت و گەشت و نیعمەتە هەموو لە بەهارەوەیە و وەلی نیعمەت ئەوە. خەڵک نەزەریان لە هۆ و ئەسبابە و کارەکان لە ئەسبابەوە دەزانن، بەڵام لای ئەولیا دەرکەوتوە کە ئەسباب پەردەیەک پتر نیە، هەتا هۆکار نەبینن و نەزانن. هەر ئەوجۆرەی کە کەسێک لە پشت پەردەوە قسە دەکا، وادەزانن کە پەردە قسە دەکا و نازانن کە پەردە کارا نیە و حیجابە، کاتێک ئەو لە پەردە بێتە دەر، دەردەکەوێ کە پەردە بیانوو بوە. »

ئەولیای هەق، لە دەرەوەی ئەسباب، کاری وایان دیوە کە جێبەجێ بوە و وەدی هاتوە: هەر ئەوجۆرەی کە وشتر لە کێو هاتە دەر و وەکازی مووسا بوو بە ئەژدیها و لە بەردی خارا دوازدە کانی هەڵقوڵی و هەر ئەوجۆرەی کە مستەفا مانگی بێ هیچ

کـەرەسـەیەک، بە ئـیشـارە، شـەق کـرد و هـەر ئەوجـۆرەی کـە ئـادەم بێ دایک و باوک خوڵقا و عیسا بێ باوک و بۆ ئیبراهیم لە ئاگر، گوڵ و گوڵزار رسکا. چونکە ئەمەیان دیت، زانیـان کـە ئەسـبـاب بیـانوویە، کـارساز کـەسێکی دیکەیە. ئەسـبـاب جگە لە رووپۆشێک نیە هەتا عەوام پێوەی خەریک بن.

هەقتەعالا وەعدەی بە زەکەریا دا کە « منداڵێکت دەدەمێ. »

ئەو هاواری کـرد کـە « من پیـرم و ژن پیر و ئـەسـبـابی شـەهوەت زەعـیفـە و ژن گەیشـتـۆتە قـۆناغـێک کە ئیـمکانی منداڵ و زگپـڕ بوون نیە. یارەب، لە وەها ژنێک منداڵ چۆن دەبێ؟ »

وڵام هاتەوە کە « ئامـان، ئەی زەکەریا، سەر و بنت لێگۆراوە! سەد جار کارەکانی دەرەوەی ئەسبابم پێ نیشان داوی، لە بیرت چۆتەوە؟ من دەتوانم هەر ئێستا، لەبەر چاوی تـۆ، سـەدهەزار منداڵ لە تۆ سـاز بکەم، بێ ژن و زگپـڕیی. تەنانـەت ئەگـەر ئیشارەیەک بکەم خەڵکێک لە عالەم دا پەیدا بن تەواو باڵغ و زانا. مەگەر من تۆم بێ دایک و بێ باوک لە عالەمی رووحەکان، ساز نەکرد و لوتف و عینایەتی من بۆ تۆ بەر لەوەی کە بخوڵقێی نەبوو؟ ئەوە بۆ لە بیر دەکەی؟ »

ئەحـواڵی ئەنبـیـا و ئەولیـا و خـەڵک و چاک و خـراپ وەک ئەوەیە کـە غـوڵام لە کافرستانەوە بۆ وڵاتی مـوسڵـمانان دێنن و دەیانفرۆشن. هەندێکیـان پێنج ساڵە دێنن و هەندێک دە ساڵە و هەندێک پازدە ساڵە. ئەو منداڵەی کە هێنابێیان، لەبەر ئەوەی کە زۆر دە نێو مـوسڵـمانان دا پەروەردە دەبێ و پیر دەبێ، ئەحواڵی ئەو وڵاتەی ـ کە زێدەکەیەتی ـ بە تەواوەتی فەرامۆش دەکا و هیچ وە بیری نایەتەوە. ئەگەر هەندێک گەورەتر بێ، هەندێکی وە بیر دێتەوە و ئەگەر زۆر گەورە بێ، پتری لە بیرە. هەروەتر، رووحـەکـان لەو عـالەمـە دا کـە لای حـەزرەتی هـەق بوون و خـۆراک و قـەوەتی ئەوان کەلامی هەق بـوو ـ بێ دەنگ و قسـە. لەبەر ئەوەی کـە هەندێکیان بە منداڵی هێناوە، کـاتێک ئەو کـەلامـە ببـیسـن، ئەو ئەحواڵـەیان وە بیـر نایەتەوە و خـۆیان لەو کەلامـە بێگانە دەبین و لەو تاقمە رووگیراوانەن کە لە کوفر و تاریکی دا نوقم بوون. هەندێک کـەمـێکیـان وە بیـر دێتـەوە و مـەیل و هەوای ئەولا تێـیـان دا سـەر هـەڵدەدا و ئەوان ئیـماندارانن. هەندێک کاتێک ئەو کەلامـە دەبیسن، ئەو حـاڵـەتەی کە کۆن هەیانبـوو پەیدا دەبێـتـەوە و حـیـجـابەکـان بە تەواوەتی لا دەدرێن و خـۆیان تێکەڵ دەکـەنەوە ـ ئەوان ئەنبیا و ئەولیان.

یاران وەسیەت دەکەم کە کاتێک بووکی مانا لە دەروون دا رووی دە ئێوە کرد و رازەکان دەرکەوتن، ئامان و ئامان بە ئەغیارەکانی مەڵێن و باسی مەکەن و ئەم قسەی ئێمە کە دەبیسن، بە هەر کەسێکی مەڵێن! ئەگەر تۆ گراویی و مەعشووقێکت دەست کەوێ و لە ماڵە تۆ دا خۆی بشارێتەوە کە « من بە کەس نیشان مەدە من هی تۆم! » ئاخۆ رەوایە و دەشێ کە ئەو لە بازاڕ بگێڕی و بە هەرکەس بڵێی کە « وەرە ئەم جوانە ببینە »؟ ئەو مەعشووقە هەرگیز ئەوەی پێخۆش دەبێ؟ لێت تووڕە دەبێ و لێت دەتۆرێ.

هەقتەعالا ئەوم قسانەی لەوان حەرام کردوە. هەر ئەوجۆرەی کە ئەهلی دۆزەخ هاوار لە ئەهلی بەهەشت دەکەن کە « ئاخر، کوا کەرەم و بەزەیی ئێوە؟ لەو خەڵات و دیاریانەی کە هەقتەعالا پێیداون، بە سەدەقە و خێرات شتێکمان بۆ هەڵڕێژن و بەشمان بدەن چ دەبێ؟ ـ کە ئێمە لەم ئاگرە دا دەسووتێین و دەتوێینەوە. لەو میوانە یا لەو ئاوە روونانەی بەهەشت زەڕڕەیەک بە گیانی ئێمەی داکەن، چ دەبێ؟ »

بەهەشتییەکان وڵام دەدەنەوە کە « خودا ئەوەی لە ئێوە حەرام کردوە. تۆوی ئەو نێعمەتانەی لە داری دونیا دا هەبوون. چونکە لەوێ نەتانکێلا و داتاننەچاند و ئەویش ئیمان و راستیی و کردەوەی چاک بوو ـ لێرە چ دەدروونەوە؟ ئەگەر ئێمە بە کەرەم بتاندەینێ، قورگتان دەسووتێنێ و لە گەرووتان ناچێتە خوار و ئەگەر لە کیسەی بنێن، کیسە دەدرێ و دەرژێ. »

تاقمێک مونافق و ئەغیار هاتنە لای حەزرەتی مستەفا. رازەکانیان لێک دەداوە و پەسنی مستەفایان دەکرد. پێغەمبەر بە رەمز بە ئەسحابەکانی گوت کە « خمرا آنیتکم! » یانی زارکی گۆزە و قاپ و مەنجەڵ و گۆزەڵە و کووپەکان داپۆشن و بگرن ـ چونکە ئەوانە جانەوەرێکن چەپەڵ و ژاردار، نەکا دە گۆزە بکەون و ئێوە نەزانن و لەو گۆزە ئاو بخۆنەوە، زیانی بۆ ئێوە هەیە. بەم جۆرە، بەوانی فەرموو کە لە ئەغیار حیکمەت بشارنەوە و زار و زمان لای ئەغیار ببەستن ـ کە ئەوان مشکن، لایقی ئەو حیکمەت و نیعمەتە نین.

فەرمووی « ئەوە کە ئەمیر لە لای ئێمە رۆیشت، هەرچەند لە قسەی ئێمە بە

وردیی تێنەدەگـەیشـت، بەڵام سـەر زارەکی زانی کـە ئێـمـە ئەو بۆ هەق بانگەواز دەکـەین. ئەو نیـاز و سـەر راوەشـاندن و خـۆشـەویسـتی و ئەشـقی ئەو لەبری فـام دادەنێین. ئاخر، ئەو لادێییـەی کە دێتە شـار، بانگی نوێژی گوێ لێـدەبێ، هەرچەند مانای بانگی نوێژ بە وردیی نازانێ، بەڵام لە مەبەست دەگا. »

* خلقتنی من نار و خلقته من طین. سورەی اعراف ئایەی ١٢.

## که دەستەڵاتیشت هەیە خۆت پێ بێدەستەڵات بێ!

[پەروانە] گوتی کە « شەو و رۆژ دڵ و گیانم لە خزمەت دایە و لەبەر سەرقاڵیی و کاروباری مەغوول ناتوانم بە خزمەت بگەم! »

[مەولانا] فەرمووی کە « ئەو کارانەش کاری هەقن، چونکە هۆی ئەمن و ئەمانی موسڵمانەتییە. خۆتان بە ماڵ و بە لەش بەخت کردوە، هەتا دڵی ئەوان بە جێ بێنن، هەتا چەند موسڵمانێک دەگەڵ من خەریکی تاعەت بن. کەوایە ئەمەش کاری خێرە و چونکە هەقتەعالا تاسەی وەها کارێکی خێری دە دڵ ناوی و تاسەی زۆر، هۆی عینایەتە و ئەگەر لەم تاسەیە دا کەمایەسییەک هەبێ، هۆی بێ عینایەتییە ـ چونکە هەقتەعالا نایەوێ کە وەها خێرێکی گەورە بە هۆی ئەوەوە سەر بگرێ هەتا موستەهەقی ئەو سەواب و پلە و پایە بەرزە نەبێ. هەروەکی حەمام کە گەرمە. ئەو گەرمییە لە کەرەسەی تونخانەوەیە ـ هەروەک پووش و ئێزینگ و شیاکە و غەیرە. هەقتەعالا کەرەسەیەک دەدۆزێتەوە کە هەرچەند بە رواڵەت خراپ و کرێتە، بەڵام لە هەق ئەو دا عینایەتە. چونکە حەمامەکەی گەرم دادێ و قازانجەکەی بە خەڵک دەگا.

لەم بەینە دا دۆستان هاتن.

داوای لێبوردنی کرد کە « ئەگەر من لە بەرتان هەڵنەستم و قسە نەکەم و حاڵتان نەپرسم، ئەمە رێزە. چونکە رێزی هەر شتێک شیاوی ئەو کاتەیە. لە نوێژ دا ناکرێ حاڵی باوک و کوڕ بپرسی و کڕنۆشیش بەری. سەرنج نەدان بە دۆستان و خزمان لە نوێژ دا عەینی سەرنجە و عەینی دڵ راگرتن. چونکە بە هۆی ئەوانەوە خۆی لە تاعەت و نوقم بوون جیا ناکاتەوە و تێکناچێ. کەوایە ئەوان شیاوی عەزاب و تووڕەیی ناین. کەوایە عەینی سەرنج و دڵ راگرتنە، چونکە خۆی پاراست لە شتێک کە دوارۆژی ئەوانی تێدا بەستەیە. »

پرسیاری کرد کە « لە نوێژ نزیکتر، رێگایەک بەرەو هەق هەیە؟ »

فەرمووی « دیسان نوێژ! بەڵام نوێژ تەنیا ئەو روخسارەی نیە، ئەمە قالبی نوێژە.

چونکە ئەو نوێژە، یەکەمییە و ئاخرییە و هەر شتێک یەکەم و ئاخری هەبێ، ئەوە قالبە. چونکە تەکبیر سەرەتای نوێژە و سلاو، ئاخری نوێژ. هەروەتر، شەهادەت ئەوە نیە کە هەر تەنیا بە زمان دەیلێن، چونکە ئەویش یەکەمە و ئاخرە و هەر شتێک کە بە قسە و دەنگ دەربڕدرێ، یەکەم و ئاخری دەبێ. ئەوە رواڵەت و قالبە. گیانی ئەو بێهاوتا و بێنەهایەتە و ئەو، یەکەم و ئاخر نابێ. کەوایە زانیمان، گیانی نوێژ تەنیا ئەو روخسارە نیە، بەڵکە نوقم بوون و بێهۆشییە ـ کە ئەم هەموو روخسارانە لە پشت دەرگا دەمێننەوە و لەوێ ناگونجێن. جبرەییلیش کە مانای مەحزە، ئەویش ناگونجێ.»

دەگێڕنەوە لە مەولانا سوڵتانەلعولەما کە رۆژێک ئەسحاب ئەویان نوقمی خۆ بینی. وەختی نوێژ داهات. هەندێک لە موریدەکان هەرایان لە مەولانا کرد کە «وەختی نوێژە! » مەولانا گوێی لە قسەی وان نەگرت. ئەوان هەستان و خەریکی نوێژ بوون. دوو مرید وەک شێخیان کرد و نوێژیان دانەبەست. یەک لە موریدەکان کە خەریکی نوێژ بوو بە ناوی خواجە، بە چاوی سەر لێیان عەیان کرد کە تەواوی ئەو ئەسحابانەی کە خەریکی نوێژن، دەگەڵ پێشنوێژ، پشتیان لە قیبلە بوە و ئەو دوو مریدەی کە وەک شێخ جووڵابوونەوە، روویان لە قیبلە بوە. چونکە شێخ کە لە ئێمە و من تێپەڕی و ئەو ـ ایەتی ئەو فەنا بوو و نەما و لە نووری هەق دا فەوتا. [بمرن، بەر لەوەی کە بمرن!]* نووکە ئەو بۆتە نووری هەق و هەرکەس پشت لە نووری هەق بکا و روو لە دیوار بنێ، بێشک پشتی لە قیبلە کردوە ـ چونکە ئەو گیانی قیبلە بوە.

مستەفا بە گژ دۆستێک داهات کە « تۆم بانگ کرد، بۆ نەهاتی؟ »

گوتی « خەریکی نوێژ بووم. »

گوتی « ئاخر، نە ئەوە کە من بانگم کردی؟ »

گوتی « من بێدەستەڵاتم. »

فەرمووی کە « زۆر باشە ئەگەر هەموو کات و دەمێک، بێدەستەڵات بی ـ کە دەستەڵاتیشت هەیە، خۆت بێدەستەڵات ببینە، هەر ئەوجۆرەی کە لە داماویی دا دەیبینی. چونکە لە سەرووی دەستەڵاتی تۆ، دەستەڵاتێک هەیە و دەستەڵاتدارێکی هەق، لە هەموو حاڵێک دا. »

تۆ دوو کوت نی ـ جارێک دەستەڵاتدار و جارێک بێدەستەڵات. چاو لە هێزی ئەو بکە و هەمیشە خۆت پێ بێدەستەڵات بێ، بێ دەستوپێ و داماو و بێ ئەنوا.

نەک هەر مرۆڤ زەعیف! بەڵکە شێر و پڵینگ و نەهەنگەکانیش هەموویان بێچارەن و لەبەری دەلەرزن، زەوی و ئاسمانەکان هەموو بێچارە و لە ژێر دەستەڵاتی حوکمی ئەو دان. ئەو پادشایەکی مەزنە. نووری ئەو وەک نووری مانگ و هەتاو نیە کە بە هۆی ئەوانەوە شتێک بمێنێتەوە. کاتێک نووری ئەو بێ پەردە روو دەربخا، نە ئاسمان دەمێنێتەوە و نە زەوی، نە هەتاو و نە مانگ. جگە لەو شایە کەس نامێنێتەوە.

پادشایەک بە دەروێشێکی کوت کە « ئەودەمەی کە لە دەرگای هەق نزیک دەبییەوە، یادم بکە! »

گوتی « کاتێک من بگەمە ئەو حەزرەتە و شۆقی هەتاوی جەمالی لە من بدا، من خۆم لە بیر نامێنێ، چۆن یادی تۆ بکەم؟ »

بەڵام کاتێک هەقتەعالا بەندەیەکی هەڵبژارد و نوقمی خۆی کرد، هەرکەس کە داوێنی بگرێ و حاجەتی لێبخوازێ، بێ ئەوەی کە ئەو گەورەیە لای هەق یادی بکا و دەریبڕێ، هەق بەجێی دێنێ.

دەگێڕنەوە کە: پادشایەک بوو بەندەیەکی خاس و زۆر نزیکی هەبوو. کاتێک بەندە تەمای سەردانی پادشای گرت، ئەهلی حاجەت حەکایەت و نامەی خۆیان دایە کە «بیدە بە پادشا! »

ئەو دە هەگبەی نا. کاتێک بە خزمەت پادشا گەیشت، تاقەتی جەمالی نەهێنا و لەبەر پادشا بێهۆش کەوت. پادشا دەستی دە بەرۆک و هەگبەی ئەو گێڕا بە شێوەیەکی ئاشقانە کە « ئەم بەندە بێهۆشەی من، نوقمی جەمالی من، چی پێیە؟ » نامەکانی دیتەوە و حاجەتی گشتیانی لە پشت نووسی و دیسان دە هەگبەی ناوە. تەواوی کارەکان بێ ئەوەی کە ئەو دەریبڕێ، جێبەجێی کرد. وەها کە یەکێکیانی نەبوارد، بگرە داوای ئەوانی دووهێندە و پتر لەوەی کە داوایان کردبوو، پێگەیاند.

بەندەکانی دیکە کە هۆشیان هەبوو و توانیان حەکایەتی ئەهلی حاجەت بە

حەزرەتی شا رابگەیەنن و نیشانی بدەن، لە سەد کار و لە سەد حاجەت بە هەڵکەوت یەکێک جێبەجێ کرا و بە ئاکام گەیشت.

* موتو اقبل ان تموتوا

# شەو درێژە بۆ راز دەربڕین!

شــەو درێژە بۆ راز دەربڕین و حـاجــەت خـواستن ـ بێ پەشـێـویی خـەڵک و بێ زەحـمـەتی دۆسـتـان و دوژمنـان. خـەڵوەتێک و ئەهوەنیـیـەک پێکـهـاتوە و هەقـتـەعـالا پەردەی داکێشـاوە هەتـا ئاکارەکان لە ریا بە دوور و مـەحفووز بن و خـالیس بن بۆ خـودای تەعـالا. لە شەوی تـاریک دا، پیاوی ریاکار، لە مـوخلیس دەردەکەوێ. ریاکار رسـوا دەبێ لە شـەو دا. هەمـوو شـتـەکان بە شـەو داپۆشـراون و بە رۆژ رسـوا دەبن کـەچی پیـاوی ریاکـار بە شـەو رسـوا دەبێ. دەڵێ « چـونکە کـەس نایبـینێ، بۆ کـێی بکەم؟ »

پێیدەڵێن کە « کەسێک دەیبینێ، بەڵام تۆ کەسێک نی هەتا کەسێک ببینی! »

ئەو کـەسـە دەیبـینێ کـە هەمـوو کـەسـەکـان لە قـەبزەی دەسـتـەڵاتی ئەو دان و لە لێقەومان دا بانگی دەکەن و لە کاتی ددان ئێشە و گوێ ئێشە و چاوێشە و بوختان و خـۆف و ئاژاوە دا، هەمـوو بە نهـێنی ئەو بانگ دەکـەن و لە سـەر ئەم باوەڕەن کـە دەیبیسێ و حـاجـەتی ئەوان پێکدێنێ و لەبنەوە و بە شـاراوەیی سـەدەقـەی دەدەن بۆ دوور کـردنـەوەی بەڵا و شـەفـای نـەخـۆشی و باوەڕیان هەیە کە ئەو دان و سـەدەقـەیە قەبووڵ دەکا.

کـە شـەفـا و حـەسـانەوەی پێـدان، ئـەو باوەڕە لە یاد دەکـەن و خـەیاڵات روویان تێدەکاتەوە. دەڵێن « خودایا، بە راستی ئەوە چ حـاڵەتێک بوو کە ئێمە لە دڵەوە تۆمان بانگ دەکـرد لە کـونجی زیندان دا ـ بە هـەزار قل هـوالله بـەبێ رەنج ـ حـاجـەتت پێکهـێنا؟ » نووکە ئـێمـە لە دەرەوەی زیندان، هەروا ئاتاجین کە دە زیندان دا بووین هـەتا ئێمـە لەم زیندانی عالەمی تاریک دەربکێشی و بمانبـەیە عالەمی پێغەمبەران کە نوورانییە. نووکە، بۆچی ئێمـە هەمان خـڵاسییمـان لە دەرەوەی زیندان و لە دەرەوەی دەرد، نیـە؟ هەزار خـەیاڵ دادێ کـە عـەجـایب ـ فـایدەی هـەیە یان نا؟ و ئـەم خـەیاڵە هـەزار سستی و خەفەت پێکدێنێ. ئەو باوەڕە خەیاڵ سووتێنەرە کوا؟

خودا وڵام دەداتەوە کـە « ئەوەی کە گوتمان: نەفسی حەیوانیی ئێوە دوژمنی ئێوە و منە. هـەمـیـشـە ئەم دوژمـنەتان دە زینـدانی هەوڵ دا هـەیـە ـ چونکە ئـەو دە زیندان دایە و تووشی رەنج و بەڵایە، خڵاس دەبی و هێز دەگرێ! »

هەزار جارت بە تاقی کردۆتەوە کە لە ئێشی ددان و لە دەرد و لە خۆف، خەڵاسیت هاتوە. بۆ بووی بە دیلی راحەتیی لەش و خەریکی تیمار کردن بووی؟ سەرینچاوە لە یاد مەکەن و هەمیشە نەفس بێمراد بکەن هەتا بە مرادی ئەبەدی بگەن و لە زیندانی تاریکی رزگار بن!

[شەو درێژە، بە خەو کورتی مەکەوە. رۆژ نوورانییە بە گوناهەکانت پیس و تاری مەکە!]*

* حەزرەتی مەحەممەد: اللیل طویل فلا تقصره بمنامک و النهار مضی فلا تکدره باثامک.

## هەردەم لە غەیبەوە زللەیەکمان وێدەکەوێ!

هەردەم لە غەیبەوە زللەیەکمان وێدەکەوێ. هەرچی ڕەچاوی دەگرین، بە زللە لێمانی دوور دەخەنەوە. دیسان، شتێکی دیکە دەگرینە بەر. دیسان، بەم چەشنە.

« خسف » نوقمی دونیا بوون و بوون بە ئەهلی دونیایە و « قذف » لە دڵ چوونە دەرە: هەروەک کەسێک تەعامێک بخوا و لە گەدەی دا بترشێ و بیهێنێتەوە. ئەگەر ئەو تەعامە نەترشابا و نەیهێنابایەوە، دەبوو بە بەشێک لە مرۆڤ. نووکە، مریدیش کلکەسووتە و خزمەت دەکا هەتا دە دڵی شێخ دا بگونجێ و ـ العیاذ بالله ـ شتێک لە مرید دەرکەوێ، شێخ پێیخۆش نەبێ و ئەو لە دڵ دەرخا، هەروەک ئەو تەعامەی کە خواردی و هێنایەوە. وەها کە ئەو تەعامە دەیەویست ببێتە بەشێک لە مرۆڤ بەڵام لەبەر ترشان هێنایەوە و فڕێی دا، ئەو مریدەش بەرەبەرە دەیەویست ببێتە شێخ، لەبەر جوولانەوەیەکی ناخۆش لە دڵی دەرخست.

لەو بای بێنیازیی دا، زەڕڕەکانی خۆڵەمێشی ئەو دڵانە دەرەقسن و نەعرەتەی لێدەدەن و ئەگەر وەها نین، ئەی کێ ئەم خەبەری هێنا و هەردەم ئەم خەبەرە کێ تازەی دەکاتەوە؟ ئەگەر دڵەکان حەیاتی خۆیان لەو سووتان و بە با دانە دا نەبینن، چلۆن وەها مەیلی سووتانیان هەیە؟ ئەو دڵانەی کە لە ئاگری شەهوەتی دونیا سووتاون و بوونە خۆڵەمێش، هیچ ئاوازە و ڕەونەقێک دەوان دا دەبینی، دەبیسی؟

بە ڕاستی کە من قاعیدەی بژیو دەرهێنان دەزانم و ئەمە خووی من نیە کە زێدە ڕاکە ڕاکەی بکەم و لەخۆوە، خۆم ئەزیەت بدەم. بە ڕاستی ئەوەی کە بژیوی منە، لە پارە و لە خۆراک و لە پۆشاک و لە گڕی هەوەس، بۆ خۆی دەگاتێ. من چۆن بە شوێن ئەو داوایانە دا ڕادەکەم. داوا کردنی ئەوانە من سووک و چووک و شەکەت دەکا و ئەگەر سەبر بگرم و لە سەر جێگەی خۆ دانیشم، بێ ڕەنج و سووک بوون، بۆم دێن. چونکە ئەو بژیوەش داواکاری منە و من ڕادەکێشێ، کە نەتوانێ من ڕاکێشێ، خۆی دێ. وەها کە من نەتوانم بیکێشم، من دەچم.

ئاکامی قسە ئەوەیە کە خەریکی کاری دین بە هەتا دونیا بە شوێنێت دا ڕابکا.

مەبەست لەو دانیشتنە، دانیشتنە بە کاری دین. هەرچەند کە رادەکا، بەڵام چونکە بۆ کاری دین رادەکا، ئەو دانیشتوە. و هەرچەند کە دانیشتوە، چونکە بۆ دونیا دانیشتوە، ئەو رادەکا.

هەرکەس کە دە غەمی هەبێ، غەمی دین هەڵیگرێ، هەقتەعالا ئەو نۆیە بەبێ هەوڵی ئەو وە راست دەگێرێ. وەها کە ئەنبیا لە بەندی ناو و نان دا نەبوون، لە بەندی رەزاخوازیی هەق دا بوون، نان ئەوان دەستیان خست و ناو ئەوان. هەرکەس کە رەزای هەق بخوازێ، لەم دونیایە و لەو دونیا دەگەڵ پێغەمبەرەکانە. نەک هەر ئەمە، بەڵکە دەگەڵ هەق هاودەمە. ئەگەر هەق هاودەمی ئەو نەبا، دە دڵی دا مەیلی هەقی نەدەبوو. هەرگیز بۆنی گوڵ بەبێ گوڵ نابێ، هەرگیز بۆنی میسک بەبێ میسک نابێ.

ئەم قسەیە کۆتایی نیە و ئەگەر کۆتایی هەبێ، هەروەک قسەی دیکە نابێ. شەو و تاریکایی ئەم عالەمە تێدەپەڕێ و نووری ئەم قسەیە هەردەم پتر دەردەکەوێ. وەها کە شەوی عومری ئەنبیا تێپەڕی و نووری حەدیسیان تێنەپەڕی و نەبڕاوە و نابڕێتەوە.

بە مەجنوونیان گوت چەند سەیرە کە لەیلات خۆش دەوێ؟ ـ چونکە هەردووک منداڵ بوون و لە یەک مەکتەب دا بوون.

مەجنوون گوتی « ئەم خەڵکە گەوجن. پیاو هەیە کە مەیلی ژنێکی باشی نەبێ؟ ژنیش هەروەتر. بەڵکە ئەشق ئەوەیە کە خۆراک و مەزەیەکی لەو دەست کەوێ ـ هەر ئەوجۆرەی کە دیداری دایک و باوک و برا و خۆشی منداڵ و خۆشی شەهوەت و لەززەتی جۆراوجۆر لەو دەبا. »

مەجنوون بۆ ئاشقان بوو بە وێنە ـ هەر ئەوجۆرە کە لە نەحو دا، زەید و عومرۆ.

دونیا و نێعمەتەکانی ئەو، هەروەک ئەمەیە کە کەسێک دە خەو دا شتێکی خوارد. کەوایە حاجەتی دونیایی هەروەک ئەوەیە کە کەسێک لە خەو دا شتێکی خواست و دایانێ. لە ئاکام کە وە ئاگا هاتنەوەیە، لەوەی کە لە خەو دا خواردی چ سوودێک نابینێ. کەوایە، لە خەو دا، شتێکی خواستوە و پێیانداوە.

## هەرکەس لای حاجەتی خۆیەتی!

مەعلووم دەبێ بزانین هەرکەس لە هەر کوێیەک کە هەیە، لە پەنا حاجەتی خۆیەتی بی هیچ جیاییەک و هەر حەیوانێک لە پەنا حاجەتی خۆیەتی هەمیشە و ئەو حاجەتە پەتی ئەوە ـ کە دەیکێشێ و بۆ ئەملا و ئەولای دەبا، هەروەک هەوسار. هەروەتر مەحاڵە کە کەسێک خۆی ببەستێتەوە چونکە ئەو خوازیاری رزگاریی لە پەتە. وە مەحاڵە کە خوازیاری رزگاریی خوازیاری پەت بێ. کەوایە، ناچار کەسێکی دیکە ئەوی بەستۆتەوە. بۆ وێنە ئەو خوازیاری سلامەتییە، کەوایە خۆی نەخۆش نەکردوە، چونکە مەحاڵە کە هەم خوازیاری نەخۆشی بێ و هەم خوازیاری سلامەتی. بەلام چونکە لای حاجەتی خۆیەتی، لە لای حاجەتدەری خۆی دەبێ. وە چونکە هاورێی هەوساری خۆی بێ، هاورێی هەوسارکێشی خۆی دەبێ. ئیللا چونکە ئەو نەزەری لە هەوسارە ـ لەبەر ئەو بێرێز و بێقەدرە. ئەگەر نەزەری لە هەوسارکێش با، لە هەوسار رزگاریی دەهات، هەوساری ئەو هەوسارکێشی ئەو دەبوو. چونکە هەوساری ئەویان لەبەر ئەوە داناوە کە ئەو بێ هەوسار، بە شوێن هەوسارکێش دا نارِوا و نەزەری ئەو لە هەوسارکێش نیە. ناچار: « هەوساری دە مل دەکەین و رایدەکێشین، بێ مەیلی خۆی، چونکە ئەو بێ هەوسار، بە دوامان دا نایە. »

هەقتەعالا لە فەزلی خۆی لاوەتی دەدا بە پیرەکان کە منداڵ خەبەریان لێی نیە. چونکە لاوەتی لەبەر ئەوە تازەیی پێکدێنێ و دەیبزوێنێ و وە پێکەنینی دەخا و مەیلی یاریی کردنی دەداتێ چونکە دونیا بە نوێ دەبینێ، مەلوول نابێ لە دونیا. کاتێک ئەم پیرەش دونیا نوێ ببینێ، هەر ئەوجۆرە مەیلی یاریی و بزووتنی دەبێ و گۆشت و خوێنی ئەو زیاد دەبن.

مەزنایەتی پیریی لە مەزنایەتی هەق زێدەترە ـ کە بەهار، مەزنایەتی هەق پەیدا دەبێ و پاییزی پیریی بە سەری دا زاڵ دەبێ و تەبعی پاییزیی خۆی ناهێڵێتەوە. کەوایە لاوازیی بەهار فەزلی هەقە ـ کە بە هەر ددان کەوتنێک، بزەی بەهاری هەق کەم دەبێتەوە و بە هەر سپی بوونێکی موو، سەرسەوزیی فەزلی هەق هەتڵە دەبێ و بە هەر گریانێکی بارانی پاییزیی، باغی هەقیقەتەکان تار دەبێ.

## ئاشقم بە مەولانا!

ئەکمەلەددین گوتی: ئاشقم بە مەولانا و ئارەزووی دیداری ئەوم هەیە و ئاخرەتم لە یاد نیە. نەقشی مەولانا بێ ئەم بیر و مەبەستە، بە هاودەم دەبینم و ئارام دەگرم بە جەمالی ئەو و ئۆخژنم دێتێ بە عەینی روخساری یا بە خەیاڵی ئەو.

فەرمووی: هەرچەند ئاخرەت و هەقت لە یاد نیە، بەڵام هەمووی لە دۆستایەتی و لە یاد دا شاراوەیە. هەرچەند مرید بە وردیی ئاخرەتی وە بیر نایە بەڵام لەززەتی ئەو بە دیتنی شێخ و ترسانی لە فەراقی شێخ هەموو ئەو تەفسیلانەی گرتۆتە خۆ و هەموو دەو دا شاراوەیە.

وەها کە کەسێک کوڕەکەی یا براکەی دەلاوێنێتەوە و خۆشی دەوێ. هەرچەند لە کوڕایەتی و برایەتی و هیوای وەفا و رەحمەت و دڵاوایی و خۆشەویستی ئەو لە سەر خۆی و ئاکامی کار و باقی مەنفەعەتەکان کە خزم لە خزمی هەیە، ئەوانەی هیچ بە یاد دا نایە، بەڵام ئەم تەفاسیلانەی هەموو تێدا شاراوەیە لەوەندە دیدار و چاو پێکەوتنە دا. هەر ئەوجۆرەی کە با لە چێو دا شاراوەیە، چ لە خاک دابێ چ لە ئاو دا ـ ئەگەر بای تێدا نەبا، ئاگر کاری تێنەدەکرد. چونکە با دەستەچیلەی ئاگرە و ژیانی ئاگر، نابینی کە بە فوو دەبووژێتەوە؟ چێو ئەگەر لە ئاو و خاک دابێ، با تێیدا شاراوەیە، ئەگەر بای تێدا شاراوە نەبا، وە سەر ئاو نەدەکەوت. هەر ئەوجۆرەی کە قسە دەکەی، هەرچەند کەرەسەی ئەم قسە گەلێک شتن وەک ئەقڵ و مێشک و لێو و زار و مەڵاشوو و زمان و هەموو ئەندامەکانی لەش کە سەرۆکی لەشن و ئەرکان و تەبایع و ئەفلاک و سەدهەزار ئەسباب کە عالەم بەوان قایمە هەتا بگاتە عالەمی سفات و ئەوجار زات، سەرەڕای ئەوانە ئەم مانایانە لە قسە دا دیار نین و نابیندرێن ـ ئەوانە هەموو شاراوەن لە قسە دا، هەر ئەوجۆرەی کە کوترا.

# لێره شتێكم فەرامۆش كردوه!

یەكێك هات و گوتی « لێره شتێكم فەرامۆش كردوه! »

خوداوەندگار فەرمووی كە « دە عالەم دا، یەک شتە كە بۆ فەرامۆش كردن، نابێ. ئەگەر گشت شتێک فەرامۆش بكەی و ئەو فەرامۆش نەكەی، قەیدی نیە و ئەگەر گشت وە بیر بێنیەوە و لە یادت بێ و فەرامۆشی نەكەی، ئەو فەرامۆش بكەی، هیچت نەكردوە. هەر ئەوجۆرەی كە پادشایەک تۆی بۆ گوندێک نارد، بۆ كارێكی دیاریكراو. تۆ چووی و سەد كاری دیكەت جێبەجێ كرد، چونكە ئەو كارەی كە بۆی چووبووی بە جێت نەهێنا، وەک ئەوەیە كە چت بە جێ نەهێنابێ. كەوایە مرۆڤ بۆ كارێک هاتۆتە ئەم عالەمە و مەبەست ئەوە. كە ئەو بە جێ نەهێنی، كەوایە هیچت نەكردوە.

مرۆڤ توانایی ئەو كارەی هەیە، كە نە لە توانای ئاسمانەكان دایە، نە لە توانای زەوییەكان و نە كێوەكان. كە ئەو كارە بكا، زۆرداریی و نەفامیی لێی جیا دەبێتەوە. ئەگەر تۆ بڵێی كە « ئەگەر ئەو كارە ناكەم، چەندین كاری دیكەم پێدەكرێ » مرۆڤیان بۆ ئەو كارانەی دیكە نەخوڵقاندوە. وەهابێ كە تۆ شیرێكی پۆڵای هیندیی لە قیمەت نەهاتوو، كە بەس لە خەزێنەی پادشایان دەست دەكەوێ، هێناوتە و كردووتە ساتووری گۆشتی گەنیو ـ كە « من ئەو تیغە مەحتەل ناكەم، بەو چەندین مەسڵەحەت جێبەجێ دەكەم ». یان مەنجەڵی زێڕت هێناوە و شێلمی تێدا دەكوڵێنی ـ كە بە هەندێک لەو، سەد مەنجەڵ دەست دەكەوێ. یان كێردی گەوهەرنیشانت كردۆتە گوڵمیخی كوولەكەیەكی شكاو ـ كە من مەسڵەحەت دەكەم و كوولەكەی پێدادەكەم و ئەم كێردە مەحتەل ناكەم ـ جێی داخ و پێكەنین نیە؟ چونكە كاری ئەو كوولەكەیە بە گوڵمیخی دار و ئاسنیش كە نرخیان پووڵێكە جێبەجێ دەكرێ، چ ئاقڵێكە كە كێردی سەد دیناریی بەو خەریک بكەی؟

گریمان بیانوو دێنیەوە كە من خۆم خەریكی كارێكی بێهاوتا دەكەم، زانستی شەریعەت و حیكمەت و مەنتق و ئەستێرەناسی و پزشكی و غەیرە دەخوێنم. ئاخر، ئەوانە گشتی بۆ تۆن: ئەگەر شەریعەتە، بۆ ئەوەیە هەتا كەسێک نانت لە دەست نەڕفێنێ و جلت دانەكەنێ و تۆ نەكووژێ، هەتا تۆ بە سەلامەت بی. ئەگەر ئەستێرەناسییە، ئەحواڵی فەلەک و شوێن دانانیان لە زەوی، لە هەرزانیی و گرانیی و هێمنایەتیی و خۆف، هەموو پێوەندییان بە ئەحواڵی تۆوەیە و بۆ تۆیە. ئەگەر ئەستێرەیە، لە سەعد و نەحس، پێوەندی بە تالعی تۆوەیە و بۆ تۆیە. ئەگەر پزشكییە

بۆ سەلامەتی تۆیە کە فلانە دەرمان ئەو خاسیەتەی هەیە و فلانە گیا بۆ فلانە کار باشە. کە بیری لێبکەیەوە، ئەسڵ تۆی و ئەمانە فەرعی تۆن. کە فەرعی تۆ چەندین لێکدانەوە و شتی سەیر و سەمەرە و ئەحواڵی جۆراوجۆر و عالەمی سەرسوڕهێنەری بێنەهایەتی هەبێ، بڕوانە کە لە سەر تۆ کە ئەسڵی، چهـا حاڵەتی دەبێ! کە فەرعەکانی تۆ بەرز و نەوی بوونەوە و سەعد و نەحسیان هەبێ، تۆ کە ئەسڵی بڕوانە چها بەرز و نەوی بوونەوەی عالەمی رووح و سەعد و نەحس و سوود و زیانت دەبێ ـ کە فلانە رووح ئەو تایبەتمەندییەی هەیە و ئەمەی لە دەست دێ، فلانە کار لە تۆ دەوەشێتەوە.

تۆ جگە لەم چێشتە خۆشە و خۆراکە، خۆراکێکی دیکەت هەیە. لەم عالەمە دا ئەو خۆراکە ناسکەت فەرامۆش کردوە و خەریکی ئەمە خۆراکە پیسکەی و شەو و رۆژ لەش پەروار دەکەی. ئاخر، ئەم لەشە ئەسپی تۆیە و ئەم عالەمە ئاخوڕی ئەوە. خوراکی ئەسپیش خوراکی سوار نیە. ئەو دە سەری خۆی دا، خەو و خوراک و نێعمەتێکی هەیە. بەلام لەبەر ئەوە کە حەیوانییەت و چوارواییی بە سەر تۆ دا زاڵ بوە، تۆ لە سەر ئەسپی لەش، لە ئاخوڕی ئەسپەکان جێ ماوی و لە ریزی پاشایان و ئەمیران دا بێڕێز بووی ـ دڵت لەوێیە. بەلام چوونکە لەش زاڵە، حوکمی لەشت وەرگرتوە و ئەسیری ئەو ماویەوە.

چەشنی مەجنوون کە تەمای دیاری یاری گرتبوو. وشتری بۆ ئەو لایەنە لێدەخوری، هەتا هۆشی لە سەر خۆ بوو. کە تاوێک نوقمی لەیلی دەبوو و خۆ و وشتری فەرامۆش دەکرد ـ وشتر لە گوند بێچوویەکی هەبوو ـ هەلی دەست دەکەوت، دەگڕاوە و دەگەیشتەوە گوند. کە مەجنوون وەخۆ دەهاتەوە، دوو رۆژە رێ گەڕابۆوە. بەمجۆرە، سێ مانگ لە رێ دابوو. لە ئاکام، هاواری کرد کە « ئەم وشترە بەلای منە!» لە وشتر دابەزی و وەڕێ کەوت.

فەرمووی کە « سید بورهانەددینی موحەقێق قسەی دەفەرموو. یەکێک هات کە «پەسنی تۆم لە فلانی بیست! »

گوتی « بلا بزانم ئەو فلانە چ کەسە. ئەو پلەیەی هەیە کە من بناسێ و پەسنی من بکا؟ ئەگەر ئەو منی بە قسە ناسیبێ، کەوایە منی نەناسیوە. چونکە ئەم قسەیە نامێنێتەوە و ئەم دەنگ و ئاهەنگە نامێنێتەوە و ئەم لێو و دەمە نامێنێتەوە. ئەمە گشتی قایم بە غەیرە. ئەگەر بە کرداریش ناسیویەتی، هەروایە و ئەگەر جەوهەری منی ناسیوە، ئەودەم دەزانم کە ئەو دەتوانێ پەسنی من بکا و ئەو پەسنە هی منە. »

حەکایەتەکەی وەها دەبێ کە دەڵێن پادشایەک کوڕی خۆی سپاردبوو دەست

جەماعەتێکی ئەهلی هونەر، هەتا ئەو فێری زانستی ئەستێرەناسی و رەمڵ و غەیرە بکەن و بیکەنە مامۆستایەکی تەواو ـ سەرەڕای گەوجیی و نەفامیی ئەو.

رۆژێک پادشا ئەنگوستیلەیەکی دە مست نا، کوڕی خۆی تاقی کاتەوە کە « وەرە بڵێ چ دە مستم دایە؟ »

گوتی « ئەوەی کە هەتە، خڕە و زەردە و نێو بۆشە! »

گوتی « چونکە نیشانەکانت راست بوو، کەوایە حوکم بکە دەبێ چ بێ؟ »

گوتی « دەبێ بێژینگ بێ! »

گوتی « ئاخر، ئەم چەند نیشانە راستەت هەڵدا کە ئەقڵ تێیدا حەیران دەبێ بە قەووەتی خوێندن و زانست، ئەوەندەت بە مێشک دا نەهات کە بێژینگ دە مست دا جێی نابێتەوە؟ »

نووکە، وەهاش، زانایانی ئەهلی زەمان ورد دەبنەوە لە شتی دیکە کە پێوەندی بەوانەوە نیە، زۆریان زانیوە و ئەوەی کە گرینگە و لەو لە هەمووکەس نزیکترە، خۆیی ئەوە و خۆیی خۆی نازانێ. هەموو شتێک بە حەلاڵ و حەرام حوکم دەکا ـ کە ئەمە دەشێ و ئەو ناشێ و ئەمە حەلاڵە یا حەرامە ـ و خۆی نازانێ کە حەلاڵە یا حەرام، دەشێ یا ناشێ، پاکە یا ناپاکە!

کەوایە ئەو بۆشایی و زەردایی و نەقش و خڕایی، رواڵەتە ـ کە ئەگەر دە ئاگری باوێی، هیچی لێنامێنێتەوە، دەبێتە زاتێکی پاک لەم هەموو شتە. لەو هەموو نیشانانەی کە هەڵیدەدەن لە زانست و کردار و قەول، وەهایە و پێوەندی بە زاتی ئەوەوە نیە ـ کە دوای هەموو ئەوانە، پاشماوە ئەوە. نیشانەی ئەوان ئەمە دەبێ کە هەموو ئەوانە بڵێن و شەرحی بکەن و لە ئاکام، حوکم بکەن کە « مستت بێژینگی تێدایە! » چونکە لەوەی کە ئەسڵە خەبەریان نیە.

من باڵندەم، بولبولم، تووتیم. ئەگەر بە من بڵێن کە جۆرێکی دیکە بخوێنە، نەتوانم. چونکە زمانی من وەهایە، جۆری دیکە ناتوانم بخوێنم. » بە پێچەوانە ئەو کەسەی کە خوێندنی باڵندە فێر بوە، ئەو مەل نیە، دوژمن و راوچی مەلەکانە، دەخوێنێ و دەچریکێنێ هەتا ئەو بە مەل دابنێن، ئەگەر حوکم لەو بکەن کە جگە لەم خوێندنە جۆرێکی دیکە بخوێنە، دەتوانێ. چونکە ئەم دەنگە خواستراوەتەوە و هی ئەو نیە، دەتوانێ جۆرێکی دیکەش بخوێنێ. چونکە فێر بوە کە شمەکی خەڵک بدزێ و لە هەرماڵەی قوماشێک نیشان بدا.

# هەمووکەست خۆش بوێ!

گوتی: قازی عیزەددین سڵاوت دەنێرێ و هەمیشە پەسن و تاریفی تۆ دەکا.

فەرمووی: ئەگەر کەسێک لە هەق کەسێک دا بە چاکە بدوێ، ئەو خێر و چاکەیە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە و لە ڕاستی دا پەسن و تاریفی خۆی دەکا. وێنەکەی وەهایە کە کەسێک دەوروبەری ماڵی خۆی بکاتە ڕەیحان و گوڵستان، هەرجارێک کە سەیری بکا، گوڵ و ڕەیحان ببینێ. ئەو هەمیشە لە بەهەشتە، چونکە خووی گرتوە کە بە چاکە باسی خەڵک بکا، خەڵکیش بە خێر یادی دەکەن. کە خەریکی چاکەی کەسێک بوو، ئەو کەسە دەبێتە خۆشەویستی ئەو و کاتێک ئەوی بە بیر دا بێ، یادی خۆشەویستی کردوە و یادی خۆشەویست کردن گوڵ و گوڵستانە و رووح و راحەتە. بەڵام کە باسی خراپەی کەسێکی کرد، ئەو کەسە لەبەر چاوی دەکەوێ و کاتێک یادی ئەو بکا و خەیاڵی ئەو بێتە بەر زەینی، دەڵێی مار و دووپشک و دڕک و داڵ دێتە بەر زەینی.

نووکە، کاتێک دەتوانێ شەو و ڕۆژ گوڵ و گوڵستان ببینی و باغی ئیرەم ببینی، بۆچ لە نێو دڕک و مارستان دەگەڕێی؟ هەمووکەست خۆش بوێ، هەتا هەمیشە لە نێو گوڵ و گوڵستان دا بی! ئەگەر هەمووکەست پێ دوژمن بێ، خەیاڵی دوژمنانت دێتە بەر زەین: وەهایە کە شەو و ڕۆژ لە نێو دڕک و مارستان بگەڕێی.

کەوایە ئەولیا کە هەمووکەسیان خۆش دەوێ و بە چاکی دەبینن، بۆ غەیر نایکەن، بۆ خۆیانی دەکەن هەتا نەکا خەیاڵی غەوش و غەزەب بێتە بەر زەینیان. لەبەر ئەوە کە یادی خەڵک و خەیاڵی خەڵک لەم دونیایە دا ناچار و پێویستە، هەوڵیان دا کە لە یاد و زەینیان دا هەموو خۆشەویست و مەحبووب بن، هەتا بێزاریی لە غەزەب ڕێگایان لێ نەشێوێنێ.

کەوایە هەرچی لە هەق خەڵک دەیکەی و یادی ئەوان دەیەی لە خێر و لە شەڕ، گشتی دەگەڕێتەوە سەر خۆت.

پرسیاری کرد: هێشتا ئادەم نەهاتبوو، فریشتەکان پێشتر چۆن حوکمیان لە سەر فەسادی مرۆڤ دا؟

فەرمووی: ئەوەیان بە دوو شێوە گوتوە: یەک مەنقوول و یەک مەعقوول.

ئەوەی کە مەنقووڵە ئەوەیە کە فریشتەکان لە لەوحی مەحفووز خوێندیانەوە کە قەومێک دەردەکەون، وەها دەبن، بۆیە باسیان کردوە. شێوەی دووهەم ئەوەیە کە فریشتەکان بە ئەقڵ لێکیان داوە کە ئەو قەومە لە زەوی دەبن، کەوایە حەیوانن و بێشک ئەوە لە حەیوان دەوەشێتەوە: هەرچەند کە ئەم مانایە دەوان دایە و ناتقن، بەڵام کە حەیوانەتیی دەوان دابێ، ناچار خراپەی دەکەن و خوێن دەرێژن ـ کە ئەوە لە پێداویستییەکانی مرۆڤە.

قەومێکی دیکە مانای دیکە دەفەرموێن: دەڵێن کە فریشتەکان ئەقڵی مەحزن و تەواو خێر، ئەوان هیچ ئیختیارێکیان نیە. هەروەک تۆ لە خەو دا کارێک دەکەی و موختار نی، کەوایە تۆ هیچ رەخنەیەکت لە سەر نیە لە خەو دا ئەگەر کوفر دەکەی و ئەگەر تەوحید و ئەگەر زینا. فریشتەکان لە بێداریی دا وەهان و مرۆڤ بە پێچەوانەی ئەوانن: ئەوان ئیختیاریان هەیە و تەماح و هەوەس و هەموو شت بۆ خۆیان دەخوازن، تەمای خوێن دەگرن هەتا هەموو شت هی وان بێ ـ و ئەوە سفەتی حەیوانە.

کەوایە حاڵی ئەوان ـ کە مەلایکەن ـ دژی حاڵی مرۆڤە. کەوایە لەوانەیە بەم شێوەیە خەبەریان لەوان داوە کە وەها دەکەن، هەرچەند لەوێ گفت و زمانێک نیە، چارەنووسەکەی وەها دەبێ: ئەگەر ئەو دوو حاڵە دژە وە قسە بێن و خەبەر لە حاڵی خۆیان بدەن، وەها دەبێ. هەر ئەوجۆرەی کە شاعیر دەڵێ « ئەستێر کوتی کە من پڕ بووم لە مەی » ئەستێر قسە ناکا. ماناکەی ئەمەیە کە ئەگەر ئەستێر زمانی هەبا، لەم حاڵە دا وەهای دەگوت.

هەر فریشتەیەک لەوحێکی دە دەروون دا هەیە کە لەو لەوحەیە بە قەدەر قەووەتی خۆی، ئەحواڵی عالەم و ئەوەی کە دەبێ ببێ، پێشتر دەیخوێنێتەوە و کاتێک ئەوەی کە خوێندویەتییەوە و بە ئاشکرا پێکبێ، بڕوای ئەو بە باریتەعالا و ئەشقی ئەو و مەستیی ئەو زیاد دەبێ و سەری سوڕ دەمێنێ لە مەزنایەتیی و غەیبزانیی هەق. ئەو زێدەیی ئەشق و بڕوا و سەرسوڕمانە بێ وشە و قسە، سوبحان گوتنی ئەوە. هەروەک بەننایەک بە شاگردەکەی خۆی بڵێ لەوماڵەی کە سازی دەکەن، ئەوەند دار و ئەوەند خشت و ئەوەند بەرد و ئەوەند کای دەوێ. کە ماڵ تەواو بێ و هەر ئەوەندە کەرەسەی تێبچێ، بێ کەم و زیاد، شاگرد بڕوای پتر دەبێ. ئەوانیش لەمە دا وەک یەکن.

یەکێک لە شێخ شەمسەددینی تەورێزیی پرسی: مستەفا بەو عەزەمەتەی کە «ئەگەر تۆ نەبای فەلەکمان نەدەخوڵقاند! » بۆچ دەڵێ « بریا پێغەمبەر نەبام و نەهاتبامە سەر ئەم عالەمە »*

فەرمووی: لە گوندێک، پیاوێک ئاشقی ژنێک بوو. هەردووک ماڵ و رەشماڵیان لێک نزیک بوو و دەگەڵ یەک خەریکی عەیش و رابواردن بوون و لێک گەورە دەبوون و هەڵیاندەدا . ژیانیان لە یەکترەوە بوو هەروەک ماسی کە زیندوو بە ئاو بێ، گەلێک ساڵ پێکەوە بوون.

لەپڕ، هەقتەعالا دەوڵەمەندی کردن: مەڕی زۆر و گا و ئەسپ و ماڵ و زێڕ و دەستوپێوەند و غوڵامی کردنە رۆژیی. لەبەر رادەی سامان و نیعمەت، تەمای شاریان گرت و هەرکام سەرایەکی گەورەی پادشایانەیان کڕی و بە خێڵ و دەستوپێوەندەوە لەو سەرایانە نیشتەجێ بوون ـ ئەم لە لایەک و ئەو لە لایەک. کاتێک حاڵیان گەیشتە ئەو حاڵە، نەیاندەتوانی بەو عەیشە و رابواردنە رابگەن. دەروونیان لە ژوورەوە دەسووتا، بە نهێنی دەیانناڵاند و ئیمکانی یەکتر دواندنیان نەبوو، هەتا ئەم سووتانە گەیشتە غایەت و بە تەواوەتی لە ئاگری جیایی دا سووتان.

کە سووتان گەیشتە غایەت، ناڵەیان قەبووڵ کرا، ئەسپ و مەڕ لە کەمییان دا، بەرەبەرە گەیشتنەوە حاڵی یەکەمی خۆیان. دوای ماوەیەکی درێژ، هەر لەو گوندەی یەکەم کۆ بوونەوە و خەریکی عەیش و رابواردن و نزیکایەتی بوونەوە، یادی تاڵیی جیاییان دەکرد.

لەبەر ئەوە کە گیانی مەحەممەد تەنیا بوو، لە عالەمی قودس و وەسڵی هەقتەعالا هەڵیدەدا، لەو دەریای رەحمەتە دا هەروەک ماسی دەگەڕا. هەرچەند لەم عالەمە دا پلەی پێغەمبەرایەتی و رێبەرایەتی خەڵک و مەزنایەتی و پادشایەتی و ناوبانگ و سەحابەی هەبوو، بەڵام کاتێک بگەڕێتەوە سەر عەیشی پێشووی دەڵێ « بریا پێغەمبەر نەبام و نەهاتبامە سەر ئەم عالەمە ـ کە لەچاو ئەو وەسڵی مەتڵەقە، ئەمانە هەمووی بار و عەزاب و رەنجن. »

* یا لیت رب محمد لم یخلق محمدا

## نامە بۆ کێ بنووسم
## کە تۆ لەم گەڕەکانە دەگەڕێی؟

کاتێک دەتەوێ بچیە جێگایەک، لە پێشدا دڵت دەچێ و دەیبینێ و هەلومەرجەکەی هەڵدەسەنگێنێ. ئەوجار، دڵ دەگەڕێتەوە و لەش دەبا. نووکە، تەواوی ئەم خەڵکە، لە چاو ئەولیا و ئەنبیا، لەشن. دڵی عالەم ئەوانن. لە پێشدا ئەوان بۆ ئەو عالەم چوون و لە بەشەرییەت و گۆشت و پێست هاتنە دەر و سەر و ژێری ئەو عالەم و ئەم عالەمەیان پشکنی و گەلێک قۆناغیان تێپەڕاند هەتا لێیان دەرکەوت کە چۆن دەبێ ڕێگا ببڕن. ئەوجار هاتنەوە و خەڵک بانگەواز دەکەن کە « وەرن بۆ ئەو عالەمە ئەسڵییە ـ کە ئەم عالەمە وێرانییە وماڵێکی فانییە و ئێمە جێگەیەکی خۆشمان دیوەتەوە، خەبەرەکەی دەدەین بە ئێوە. »

کەوایە دەرکەوت کە دڵ، لە هەموو حاڵێک دا، هاوڕای دڵدارە و ئەو پێویستی بە قۆناغ برین و ترسی ڕێگر و پاڵانی یەستری نیە. لەشی بەستەزمانە کە لە قەیدی ئەوانە دایە.

لە هەرکوێ کە هەی و لە هەر حالێک دا کە هەی، هەوڵ بدە هەتا خۆشەویست بی و ئاشق بی. کاتێک خۆشەویستیی بوو بە ملکی تۆ، هەمیشە خۆشەویست دەبی ـ لە گۆڕ و لە حەشر و لە بەهەشت.

کاتێک گەنمت داچاندوە، بێشک گەنم دروێ و لە ئەنبار دا هەمان گەنمت دەبێ و لە تەنووریش دا هەر هەمان گەنم.

مەجنوون ویستی نامەیەک بۆ لەیلا بنووسێ. قەڵەمی بە دەستەوە گرت: « خەیاڵی تۆ نیشتەجێی چاوە، زمان لە ناوی تۆ بەتاڵ نیە و یادی تۆ لە ناخی گیان دا جێگرە. کەوایە نامە بۆ کێ بنووسم وەختایەک تۆ لەم گەڕەکانە دا دەگەڕێی؟ » قەڵەمی شکاند و کاغەزی دڕاند.

گەلێک کەس هەن کە دڵیان لێوڕێژ لەم قسانەیە، ئیللا بە لەفز و ڕستە ناتوانێ دەریبڕێ ـ هەرچەند ئاشق و داواکار و خوازیاری ئەمەیە. ئەوە سەیر نیە، بەڵکە

خۆی، ئەسڵ دڵە و نیاز و ئەشق و خۆشەویستی. وەها کە ساوا ئاشقی شیرە و یارمەتی لێوەردەگرێ و هێزی پێدەگرێ بەڵام ناتوانێ شیر شی بکاتەوە و توانای گوتنی نیە و بۆی دەرنابڕدرێ کە « من لە خواردنی شیر چ چێژێک وەردەگرم و بە نەخواردنی چلۆن لاواز و کۆڵەوار دەبم » هەرچەند گیانی داخواز و ئاشقی شیرە. کەچی باڵغ هەرچەند بە هەزار جۆر شیر لێک دەداتەوە و باسی لێوە دەکا، بەڵام ئەو چێژێک لە شیر نابا و حەزی لێناکا.

# ئەقڵ تەڵاق بدە؟

ئەم قسەیە، ئامان، مەڵێن کە تێگەیشتین! هەرچەند پتر تێگەیشتبی و لە بەرت کردبێ، لە تێگەیشتن گەلێک دووری. تێگەیشتنی ئەوە تێنەگەیشتنە، بەڵا و چارەڕەشیی و بێبەشیی تۆ لەبەر ئەو تێگەیشتنەیە. ئەو تێگەیشتنە بەندی تۆیە، لەو تێگەیشتنە دەبێ رزگار بی هەتا ببیە شتێک!

تۆ دەڵێی کە « من مەشکەم لە دەریا پڕ کردوە و دەریا دە مەشکەی من دایە! » ئەمە مەحاڵە. ئادی، ئەگەر بڵێی کە « مەشکەی من دە دەریا دا ون بوو » ئەمە باشە و ئەسڵ ئەمەیە.

ئەقڵ ئەوەندە باش و مەتلووبە کە تۆ بباتە بەر دەرگای پادشا. کە گەیشتیە بەر دەرگای ئەو، ئەقڵ تەڵاق بدە ـ کە ئەو ساتە ئەقڵ زیانی تۆیە و رێگرە. کە گەیشتیە ئەو، خۆت تەسلیمی ئەو بکە! تۆ کارت بە چۆن و چلۆن نیە. بۆ وێنە: دەتەوێ پارچەیەکی نەبڕاوە بکەیە قەبا یا جوببە. ئەقڵ تۆی هێنا لای جلدروو. ئەقڵ هەتا ئەم ساتە باشە کە جل بۆ جلدروو بێنی. نووکە، ئەم ساتە، دەبێ ئەقڵ تەڵاق بدەی و لای جلدروو دەستەڵاتی خۆ و زانستی خۆ تەرک بکەی. هەروەتر نەخۆش. ئەقڵی ئەو ئەوەندە باشە کە ئەو بۆ لای تەبیب ببا. کە بردیە لای تەبیب، دوای ئەوە، ئەقڵی ئەو دە کار دانیە و دەبێ خۆی تەسلیمی تەبیب بکا.

نەعرەتەکانی نهێنی تۆ، گوێچکەی ئەسحاب دەیبیسن ـ ئەو کەسەی کە شتێکی هەیە یا دە دەروونی دا گەوهەرێکی هەیە و دەردێک شاراوەیە، دیارە ـ ئاخر، لە نێو قەتاری وشترەکان دا، ئەو لۆکە مەستە دیاری دەدا ـ لە چاو و لە ئاکاریەوە و لە کەف و غەیری کەف. هەرچی کە بنی درەخت دەیخوا، لە سەر درەخت، لە لک و گەڵا و بەر دەردەکەوێ و ئەوەی کە نایخوا و سیس بوە، زەردایی و ژاکاوییەکەی کەی شاراوە دەمێنێتەوە؟

ئەو های و هوو بەرزە کە دەریدەبڕن، رازەکەی ئەوەیە کە لە قسەیەک گەلێک قسە تێدەگەن و لە حەرفێک گەلێک ئیشارە فام دەکەن. هەر ئەوجۆرەی کە کەسێک «وەسیت »* و کتێبی « تەنبیه » ـ ی* خوێندبێتەوە؛ کاتێک حەرفێک ببیسێ، چونکە شەرحەکەی خوێندۆتەوە، لەو یەک مەسەلەیە گەلێک ئەسڵ و مەسەلە فام دەکا، لە

سـەر ئـەو حـەرفـەی « تەنـبـیـهـ » هـای دەکا ـ یانی من لـه ژێرەوەی ئەمـە، گـەلێک شت تێدەگەم و دەیبینم و ئەمـەش لەبەر ئەوەیە کە من گەلێکم رەنج پێوەکێشاوە و شـەوم کردۆتە رۆژ و گەلێکم گەنج دەست کەوتوە. »

شـەرحی دڵ بێنەهایـەتە. ئەگـەر ئەو شـەرحـەی خـوێندبێـتـەوە، لە رازێک گـەلێک تێدەگا. ئەو کەسـەی کە سـەرەتایەتی، لەو لەفزە هەر بە قـەرا مانای لەفزەکە تێدەگا. ئەو چ خەبەرێکی هەیە و هـای و هووی چ دەکا؟

قسـە لە قـەدەر گـوێ لێگرتن، دێ. ئەگـەر وەرینەگرێ، حـیکمـەتیش دەرناکەوێ. ئەوەنـد کـە وەریدەگـرێ و دەیکاتە خـۆراک، حـیکمـەت دادەکـەوێ و دەنا نـا، دەڵێ «سەیرە! بۆچ قسەم بۆ نایە؟ »

وڵامی دەداتەوە « سەیرە! بۆچ وەریناگری؟ »

ئەوکەسەی کە هێزی گوێ گرتن نادا بە تۆ، مەیلی گوتنیش نادا بە وێژەر.

لە سـەردەمی مسـتەفا، کافـرێک غـوڵامـێکی هەبوو مـوسـڵمـان و خـاوەن گەوهەر. بەرەبەیانێک، خاوەنەکەی فەرمووی کە « بوخچەی بپێچەوە بچینە حەمام! »

لە رێ دا، مستەفا دەگەڵ سەحابە لە مزگەوت نوێژیان دەکرد. غوڵام گوتی « ئەی خـواجـە، ئەم بوخـچـە تاوێک بگرە هەتا نـوێژی دوانە بکەم، دوای ئـەوە لە خـزمـەتت دام! »

کـاتێک چوو نـێو مـزگەوتەوە، نوێژی کرد، مـسـتـەفا هاتە دەر و سـەحـابەکانیش هاتنە دەر. هـەر بە تەنیـا غـولام لـە مـزگـەوت مـاوە. خـواجـەکەی هەتا چێشـتـەنگاو چاوەڕوان بوو و بانگی دەکرد کە « ئەی غەلام، وەرە دەر! »

گوتی « نامهێڵن! »

کـاتێک لە رادە تێپـەڕی، خـواجـە سـەری دە مزگـەوت نا هەتا ببینێ کـێـیـە کـە نایهێڵێ. جگە لە کەوش و سێبەرێکی نەدیت و کەس نەدەجووڵاوە. گوتی « ئاخر، کێیە کە ناهێڵێ بێیە دەر؟ »

گوتی « ئەوکەسەی کە ناهێڵێ تۆ بێیە ژوور. خۆی، کەس ئەوە کە تۆ نایبینی. »

مرۆڤ هەمیشە ئاشقی ئەو شتەیە کە نەیدیوە و نیبیستوە و تێینەگەیشتوە و شەووڕۆژ، داوای ئەو دەکا: « بەندەی ئەوەم کە نایبینم. » و لەو شتەی کە تێگەیشتوە و دیتوویەتی مەلوولە و لێیرادەکا. لەبەر ئەوەیە کە فەلاسفە بینین ڕەد دەکەنەوە: چونکە دەڵێن، لەوانەیە کە لێی تێر بی و مەلوول بی و ئەمە ڕەوا نیە. » سوننیەکان دەڵێن کە « ئەوە کاتێکە کە ئەو بە یەک جۆر خۆ بنوێنێ. چونکە بە دەمێک سەد جۆر خۆ دەنوێنێ و بگرە سەدهەزار خۆ دەردەخا، کە قەت یەکیان وە یەک ناچێ. »

ئاخر تۆش ئێستا هەق دەبینی و شوێنەوار و کردەوە و هەر ساتێکی جۆراوجۆر دەبینی ـ کە کردەوەیەکی وەک کردەوەی دیکەی ناچێ: لە کاتی شادیی خۆ دەرخستنێکی دیکە. لە کاتی گریان دا خۆ دەرخستنێکی دیکە، لە کاتی خۆف دا دەرخستنێکی دیکە. چونکە کردەوەی هەق و دەرکەوتنی کردەوەکان و شوێنەوارەکانی ئەو جۆراوجۆرە و وەک یەک ناچن، کەوایە دەرکەوتنی زاتی ئەویش وەها دەبێ، وەک دەرکەوتنی کردەوەی ئەو: ئەو دەگەڵ ئەمە قەیاس بکە! تۆش کە بەشێکی سەر بە هێزی هەق، لە ساتێک دا هەزار جۆرت لێدێ و لە سەر یەک قەرار نی.

هەندێک بەندەی وا هەن کە لە قورئانەوە بەرەو هەق دەچن و هەندێکی وا هەن شازتر کە لە هەقەوە بەرەو قورئان دێن، قورئان لێرە دەبیننەوە، دەزانن کە ئەوە هەق ناردوویەتی.

تۆ جارێک بڵێ « خودا » و ئەوسا، لە سەری سوور بە و بوەستە! ـ هەتا تەواوی بەڵاکان بە سەرت دابارێن.

یەکێک هات، بە مستەفای گوت « انی احبک! »

گوتی « وریا بە کە دەڵێی چی! »

دیسان دووپاتی کردوە کە « انی احبک! »

گوتی « وریابە کە دەڵێی چی! »

گوتی « انی احبک! »

گوتی « نووکە، بوەستە کە بە دەستی خۆت دەتکووژم! هاوار بە حاڵت! »

یەکێک، لە سەردەمی مستەفا، گوتی کە « من ئەو دینەی تۆم ناوێ، وەڵڵا کە نامەوێ. ئەو دینە وەرگرەوە. ئەوەند کە لە سەر دینی تۆ بووم، ڕۆژێک نەحەساومەوە:

ماڵم چوو، ژنم چوو، منداڵم چوو، حورمەتم نەما و پیاوەتی و شەهوەتم نەما. »

گوتی « حاشا! ـ چونکە دینی ئێمە بچێ بۆ هەرکوێیەک، هەتا لە بن و بنەڕەتەوە هەڵینەکێشێ و ماڵەکەی گەسک لێنەدا و راینەماڵێ، ناگەڕێتەوە. »

چ مەعشووقێکە؟ هەتا دە تۆ دا موویەک لە خۆشەویستی خۆت تێدا مابێتەوە، رووی خۆی نیشانی تۆ نادا و لایقی وەسڵی ئەو نابی و وە خۆیت ناگرێ. دەبێ بە تەواوەتی لە خۆت و لە عالەم بێزار بی و ببی بە دوژمنی خۆت، هەتا دۆست رووت تێبکا. نووکە، دینی ئێمە لە نێو دڵێک کە قەراری گرت، هەتا ئەو بە هەق نەگەیەنێ و ئەوەی کە ناپێویست و خەوشە لێی جوێ نەکاتەوە، دەستی لێهەڵناگرێ.

پێغەمبەر فەرمووی « لەبەر ئەوە نەحەسایەوە و غەم دەخۆی، چونکە غەم خواردن رشانەوەی خۆشییەکانی پێشوویە. هەتا دە گەدەی تۆ دا لەو شتێک مابێتەوە، هیچت نادەنێ کە بیخۆی. »

لە کاتی رشانەوە دا کەس هیچ ناخوا. کاتێک لە رشانەوە بۆوە، ئەودەم تەعام دەخوا. تۆش سەبر کە و غەم بخۆ! ـ کە غەم خواردن رشانەوەیە. دوای رشانەوە، خۆشییەک سەر هەڵدەدا کە غەمی تێدانەبێ: گوڵێک کە دڕکی پێوەنەبێ، مەیەک کە خوماریی بە دواوە نەبێ.

ئاخر، لە دونیا، شەو و رۆژ داوای ئاسوودەیی و حەسانەوە دەکەی و پێکهێنانی لە دونیا دا مومکین نیە و سەرەڕای ئەوە یەک دەم بێ داوا نی. ئەو راحەتییەش کە لە دونیا دا دەستی دەخەی وەک برووسکێکە کە تێدەپەڕێ و نامێنێتەوە، ئەویش چ برووسکێک؟ برووسکێکی پڕ گللێرە، پڕ باران، پڕ بەفر، پڕ مەینەت.

بۆ وێنە کەسێک بە تەمای ئەنتالیایە و بەرەو قەیسەرییە دەچێ. هیوادارە بگاتە ئەنتالیا و هەوڵ دەدا، کەچی مومکین نیە کە بەم رێگایە دا بگاتە ئەنتالیا، ئیللا ئەوەکە بە رێگای ئەنتالیا دا بڕوا، هەرچەند شەل و زەعیفیش بێ، دیسان دەیگاتێ ـ چونکە ئاکامی رێگا ئەمەیە.

رێگای دونیا و ئاخرەت دژی یەکن. چونکە کاری دونیا بێ رەنج پێکنایە و کاری ئاخرەتیش، کەوایە ئەم رەنجە لە ئاخرەت بدە هەتا زایە نەبێ! تۆ دەڵێی کە « ئەی مەحەممەد، دینەکەم وەرگرەوە! ـ چونکە حەسانەوەم نیە. » دینی ئێمە کەسێک بەردەدا، هەتا بە ئامانجی نەگەیەنێ؟

دەڵێن مـامۆسـتـایەک لەبەر نەدارییی، لە وەرزی زسـتـان دا، جـوبـبەیەکی کـەتانی دەبەر کردبوو. سێڵاو ورچێکی لە کوێستان رەپاڵ خۆی دابوو، تێیدەپەڕاند و سەری وە بن ئاو کەوتبوو. منداڵەکان پشتیان دیت و گوتیان « مامۆستا، ئەوەتا کەوڵێک لە جۆبار کەوتوە و تۆ سەرماتە ـ بیگرەوە! »

مامۆستا لەبەر رادەی نیاز و سەرما خۆی بە ئاو دادا کە کەوڵ بگرێتەوە. ورچ توند چنگی لێداگرت، مامۆستا لە ئاو دا ئەسیری ورچ بوو.

منداڵەکان بانگیان دەکرد کە « مامۆستا! یا کەوڵەکەی بێنە دەر یا ئەگەر ناتوانی بەری بدە و خۆت وەرەوە! »

گوتی « من کەوڵ بەردەدەم، کەوڵ من بەر نادا، چ بکەم؟ »

شەوقی هەق کەی تۆ لێرە جێ دەهێڵێ؟ شوکر کە ئێمە لە دەست خۆمان دا نین، بە دەست هەقـەوەین. هەر ئەوجـۆرەی کـە سـاوا جگە لە شـیـر و دایک نازانێ. هەقتەعالا هیچ لەوێ جێی هێشت؟ هێنایە پێشتر، بۆ نان خواردن و یاریی کردن، لەوێشەوە کێشای هەتا گەیاندیە پلەی ئەقڵ، هەروەتر لەم حاڵەش دا ـ کە لە چاو عالەمی دیکە، منداڵێکە و ئەمە مەمکێکی دیکەیە ـ جێت ناهێڵێ و تۆ دەگەیەنێتە ئەو شوێنەی کە بزانی ئەمە ساوایەک بوو و هیچ نەبوو.

راوکەر ماسی گەورە دەستبەجێ ناکێشن. قولاپ کە لە گەروو گیری کردبێ، هەندێکی دەکێشن هەتا خوێنی بڕژێ و سست و زەعیف بێ، دیسان بۆی شل دەکەنەوە و دیسان دەیکێشنەوە هەتا بە تەواوی زەعیف بێ. قولاپی ئەشقیش کە دە زاری مرۆڤ بچەقێ، هەقتەعالا کەم کەمە دەیکێشێ هەتا ئەو هێز و ئەو خوێنە باتڵانەی کە دەو دایە، بەرە بەرە لە بەری بڕوا.

« لا الله الا الله » ئیمانی عامە، ئیمانی خاس « لاهو الا هو » یە. هەر ئەوجۆرەی کە کەسێک خەون دەبینێ کە بۆتە پادشا و لە سەر تەخت دانیشتوە و غولام و کوێخادەرک و میرەکان لە دەوروبەری وەستاون. دەڵێ کە « من دەبێ پادشا بم و پادشایەک نیە جگە لە من. » لە خەو دا وەها دەڵێ. کاتێک وە خەبەر بێ و کەس جگە لە خۆی لە ماڵ دا نەبینێ، ئەوجار دەڵێ کە « منم و جگە لە من کەس نیە. » نووکە، ئەمە چاوی بێداری دەوێ. چاوی خەواڵوو ناتوانێ ئەمە ببینێ و ئەمە ئەرکی ئەو نیە.

* وەسیت: ناوی کتێبێکی ئەبوو حامید مەحەممەدی غەزالی

* تەنبیه: (التنبیه فی فروع الشافعیه) ناوی کتێبێکی ئەبوو ئیسحاق ئیبراهیمی شیرازی، کە یەک لە پێنج کتێبی گرینگ و بەناوبانگی فێقهی شافەعییە.

## هەرکەس خۆشەویست بێ، باشە نەک بە پێچەوانە!

هەرکەس خۆشەویست بێ، باشە و نەک بە پێچەوانە: پێویست ناکا کە هەرکەس باش بوو، خۆشەویست بێ. باشیی بەشێکە لە خۆشەویستیی و خۆشەویستیی ئەسڵە. ئەگەر خۆشەویستیی هەبێ، بێشک باشییش دەبێ. بەشێکی ئەو لە تەواوەتی جیا نیە و بە ناچار تەواوەتییە.

لە سەردەمی مەجنوون، جوانی وا هەبوون لە لەیلا باشتر، بەڵام خۆشەویستی مەجنوون نەبوون. بە مەجنوونیان دەگوت کە « لە لەیلا جوانتر هەن، بۆت بێنین! » ئەو دەیگوت کە « ئاخر، من لەیلام بە روخسار خۆش ناوێ و لەیلا روخسار نیە. لەیلا لە دەستی من دا وەکوو جامێکە. من لەو جامە شەراب دەنۆشم. کەوایە من ئاشقی ئەو شەرابم کە دەینۆشم و ئێوە چاوتان لە پەیمانەیە ـ لە شەراب ئاگادار نین. ئەگەر من پەیمانەی زێڕینم هەبێ کە بە جەواهیر نەخشابێ و سرکەی تێدابێ یا غەیری شەراب شتێکی دیکە بێ، ئەوە بە چ کەلکی من دێ؟ کوولەکەی کۆنی شکاو کە شەرابی تێدابێ، لای من لەو پەیمانەیە باشترە و لە سەدی وەها پەیمانەیەک. »

ئەشق و شەوقێکی گەرەکە هەتا شەراب لە پەیمانە لێک بکاتەوە. هەر ئەوجۆرەی کە برسییەک دە رۆژ هیچی نەخواردوە و تێرێک بە رۆژێک پێنج ژەمی کردوە. هەردوو لە نان دەڕوانن: تێر روخساری نان دەبینێ و برسی روخساری گیان. چونکە ئەم نانە وەک پەیمانەیە و چێژی ئەو چەشنی شەراب. ئەو شەرابەش جگە بە چاوی مەیل و تاسە ناتوانی بیبینی. نووکە، مەیل و تاسە پێکبێنە هەتا رووبین نەبی و لە کەون و مەکان دڵبەر ببینی!

روخساری ئەم خەڵکە وەکوو پەیمانەن و ئەم عیلم و هونەر و زانستانە نەخشەکانی جامن. نابینی کە هەر جام دەشکێ، نەخشەکانیش نامێننەوە؟ کەوایە کار ئەو شەرابە دەیکا کە دە جامی قالبەکان دایە و ئەو کەسەی کە ئەو شەرابە دەنۆشی و دەیبینێ!

پرسیارکەر دەبێ دوو تێبینی بێنێتە نێو زەینەوە هەتا ببێتە پرسیارکەر: یەکێک

ئەوە کـە دڵنیـا بێ کـە « مـن لەوەی کـە دەیڵـێـم هەڵەم، جگـە لەمـە شـتـێـک هەیە » و دووهەم ئەوەکە بیر بکاتەوە کە « باشتر لەمە و سەرتر لەمە، قسە و حیکمەتێک هەیە کە من نایزانم. » ـ السوال نصف العلم ـ

هەرکەس رووی دە کەسێک کردوە و هەموو داواکاری هەقن و بەو هیوایە، عومری خۆیانی پێوە خەریک دەکەن. بەڵام هەڵسەنگێنەرێک پێویستە کە بزانێ لەم کۆمەڵە دا کێ ئەمینە و شوێن برینی کاشۆی پادشای پێوە دیارە، هەتا ببێتە گۆ و یەکپەرست و نوقمی ئاو بێ ـ کە ئاو زەفەری پێدەبا و ئەو زەفەر ناباتە ئاو.

مـەلەوان و مـەلەوەر، هـەردوو دە ئاو دان. بەڵام ئەمـەیان ئاو دەیبـا و هەڵیگرتوە، بەڵام مـەلەوان هـەڵگری هـێـزی خـۆیەتی و لە ئیـخـتـیـار خـۆی دایە. کـەوایـە هەر جووڵەیەک کە مەلەوەر بیکا و هەر کار و کردەوەیەکی لێدەرکەوێ، هی ئاوە و هی ئەو نیە، ئەو لەم نێوە دا بیانوویە. هەر ئەوجۆرەی کە لە دیوار قسە دەبیسی، دەزانی کە هی دیوار نیە، کەسێکە کە دیواری وە قسە هێناوە.

ئەولیا وەهان: بەر لە مەرگ، مردوون و حوکمی دەرک و دیواریان گرتوە. دەوان دا سەرەموویەک ژیان نەماوە، لە دەست هێزی هەق دا وەک سپەرن. جووڵەی سپەر لە سپەرەوە نیە. مانای « انا الحق » ئەمەیە. سپەر دەڵێ « من لە ئارا دا نیم. جووڵە هی دەستی هەقە. » ئەم سـپـەرە بە هەق دابنێن و دەگەڵ هەق بە شەڕ مەیەن ـ چونکە ئەوانەی کە برین لە وەها سپەرێک بدەن، لە راستی دا، دەگەڵ خودا بە شەڕ هاتوون و خۆیان لە خودا داوە. لە سەردەمی ئادەم هەتا ئێستا، بیستوومانە کە ئەوانە چیان بە سەر هات ـ لە فیرعەون و شەدداد و نەمروود و قەومی عاد و لووت و سەموود. وەها سپەرێک هەتا قیامەت قایمە. دەوران دەوران ـ هەندێک بە شێوەی پێغەمبەر و هەندێک بە شێوەی ئەولیا. هەتا پارێزکاران لە چارەڕەشان جیا بکرێنەوە و دوژمنان لە ئەولیا.

کەوایە هەر وەلییەک بەڵگەیە بۆ خەڵک. ئەگەر خەڵک لە قەدەر توانایان دەگەڵی بکەن، پلە و پایەیە بۆیان. ئەگەر دوژمنایەتی دەگەڵ بکەن، دوژمنایەتییان دەگەڵ هەق کردوە و ئەگەر دۆستایەتی بکەن، دۆستایەتییان دەگەڵ خودا کردوە. بەندەکانی خودا مەحرەمی حەرەمی هەقن ـ هەروەک خزمەتکاران. هەقتەعالا تەواوی رەگەکانی ژیان و شەهوەت و ریشەکانی خەیانەتی، بە تەواوەتی لەوان بڕیوە و پاکی کردوونەوە، بە ناچار بوونە خزمەتکاری عالەمێک و مەحرەمی راز.

فەرمووی ئەگەر پشتی لە خاکی چاکی پاکان کردوە، بەڵام لەبەر نکۆڵی و غافڵان نەیکردوە، رووی دە گیانی ئەوان کردوە. چونکە ئەم قسەیە کە لە زاری ئێمە دێتە دەر گیانی ئەوانە. ئەگەر پشت لە لەش بکەن و روو دەگیان، زیانی نیە.

# روخسار فەرعی ئەشقە!

روخسار فەرعی ئەشقە ـ بێ ئەشق ئەم روخسارە بایەخی نەبوو. فەرع ئەوەیە کە بەبێ ئەسڵ ناتوانێ هەبێ. کەوایە ئەڵڵا بە روخسار دامەنێن، چونکە روخسار فەرعە و ناکرێ بەو بڵێی فەرع.

گوتی کە « ئەشقیش بێ روخسار لە زەین دا ناگونجێ و خۆ ناگرێ، کەوایە فەرعی روخسارە. »

دەڵێین بۆ ئەشق بێ روخسار ناگونجێ؟ ئەشق هاندەری روخسارە، سەدهەزار روخسار لە ئەشقەوە سەرهەڵدەدا ـ هەم لە زەین دا و هەم لە راست دا. سەرەڕای ئەوەکە نەقش بێ نەققاش نابێ و نەققاشیش بێ نەقش نابێ، بەڵام نەقش فەرعە و نەققاش ئەسڵ. هەتا ئەشقی خانووی نەبێ هیچ موهەندیسێک روخسار و سیمای خانوو ساز ناکا و هەروەتر گەنم: ساڵێک نرخی زێڕی هەیە و ساڵێک نرخی خاک و روخساری گەنم هەر یەکە. کەوایە قەدر و نرخی گەنم بە ئەشقەوەیە و هەروەتر ئەو هونەرەی کە تۆ خوازیار و ئاشقی ئەوی و لای تۆ بایەخی هەیە فێری دەبی و هونەرێک کە داواکاری نەبێ، ئەو هونەرە فێر نابن و پێوەی خەریک نابن.

دەڵێن کە « ئەشق، ئاخر، هەژاریی و پێویستیی بە شتێکە ـ کەوایە پێویستیی ئەسڵ و لێپێویست فەرعە. »

گوتم « ئاخر، ئەو قسەیە کە تۆ دەیکەی، لە پێداویستییە. ئاخر، ئەم قسە لە پێداویستیی تۆ پەیدا بوو ـ چونکە مەیلی ئەم قسەت هەبوو، ئەم قسەیە زا. کەوایە پێویستیی پێشووترە و ئەم قسەیە لەو زا. کەوایە بێ ئەو، پێویستیی هەبوو. کەوایە ئەشق و پێویستیی فەرعی ئەو نین. »

گوتی « ئاخر، مەبەست لەو پێویستییە، ئەم قسەیە بوو. کەوایە چۆن مەبەست دەبێتە فەرع؟ »

گوتم « هەمیشە فەرع مەبەستە ـ چونکە مەبەست لە ریشەی درەخت کە ئەسڵە، فەرعی درەختە کە میوەیە. »

## هەتا نەیدۆزییەوە، لێیناگەڕێی!

هەموو شت تا لێینەگەڕێی، نایدۆزییەوە. جگە لەم دۆستە: هەتا نەیدۆزییەوە، لێیناگەڕێی.

داخوازی مرۆڤ ئەوەیە کە شتێکی نەدۆزراو بخوازێ و شەو و رۆژ لە هەوڵی دۆزینەوەی ئەو دابێ. جگە داخوازێک کە دۆزیبێیەتەوە و بە مراد گەیشتبێ و داخوازی ئەو شتە بێ و ئەوەش سەیرە. وەها داخوازێک لە زەینی مرۆڤ دا ناگونجێ و بەشەر ناتوانێ دە مێشکی دا بیگونجێنێ، چونکە داخوازی ئەو بۆ شتێکی نوێیە کە نەیدۆزیوەتەوە. ئەو داخوازەی کە دۆزیبێیەتەوە و بیخوازێتەوە، ئەمە داخوازی هەقە. چونکە هەقتەعالا هەموو شتی دۆزیوەتەوە و هەموو شتێک دە دەستەلاتی ئەو دایە و سەرەڕای ئەوە، هەقتەعالا خوازیارە ـ کە « هو الطالب و الغایب ».

کەوایە مەبەست لەمە ئەوەیە کە « ئەی مرۆڤ، ئەوەند کە تۆ داخوازی ئەمەی کە تازەسازە و ئەمەش خووی مرۆڤە، لە مەبەست دووری، چونکە داخوازی تۆ لە داخوازیی هەق دا فەنا دەبێ و داخوازی هەق بە سەر داخوازیی تۆ دا زاڵ دەبێ، تۆ ئەودەم خوازیار بە داخوازیی هەق دەبی. »

یەکێک گوتی « ئێمە هیچ بەڵگەیەکی بە بڕشتمان نیە کە وەلی هەق و بە هەق گەیشتوو کامەیە ـ نە قسە و نە ئاکار و نە کەرامات و نە هیچ شتێک. چونکە قسە لەوانەیە فێری بووبێ، ئاکار و کەرامات، رەبەنەکانیش هەیانە و ئەوان نهێنی ئاشکرا دەکەن و گەلێک شتی سەیر و سەمەرە بە سێحر نیشان دەدەن ... » و لەم بابەتانەی ژماردن.

فەرمووی کە « تۆ باوەڕت بە کەس هەیە یا نا؟

گوتی « ئەرێ وەڵڵا، باوەڕم هەیە و ئاشقم! »

فەرمووی کە « ئەو باوەڕەی تۆ لە هەق ئەو کەسە دا، بە هۆی بەڵگە و نیشانێک بوو یا هەروا لە خۆوە چاوت گێڕا و ئەو کەسەت هەڵبژارد؟ »

گوتی « حاشا کە بێ بەڵگە و نیشان بێ! »

فەرمووی کە « ئەی بۆ دەڵێی لە سەر باوەڕ هیچ بەڵگە و نیشانێک نیە و قسەی پێچەوانە دەکەی! »

یەکێک گوتی « هەر وەلییەک و هەر گەورەیەک لەم گومانە دایە کە ئەم نزیکییەی کە من بە هەق هەمە و ئەو عینایەتەی کە هەق دەگەڵ منی دەکا، هیچکەس نیەتی و دەگەڵ هیچکەسی ناکا. »

فەرمووی کە « کێ ئەم قسە گوت؟ وەلی گوتی یا غەیری وەلی؟ ئەگەر ئەم قسەیە وەلی گوتبێی، چونکە ئەو زانی کە هەر وەلییەک لە سەر ئەم باوەڕەیە لە هەق خۆی دا، کەوایە ئەو بەو عینایەتە تایبەت نەبوە. ئەگەر غەیری وەلی ئەم قسەی گوتبێ، کەوایە لە راستی دا وەلی و شازی هەق ئەوە ـ کە هەقتەعالا ئەم رازەی لە تەواوی ئەولیا شاردەوە و لەوی نەشاردەوە.

کەسێک وێنەی هێناوە کە « پادشایەک دە کەنیزی هەبوو. کەنیزەکان گوتیان: دەمانەوێ بزانین کە کێ خۆشەویستترە لای پادشا! »

شا فەرمووی « ئەم ئەنگوستیلە سبەی لە ماڵە هەرکەس بێ، ئەو خۆشەویستترە!»

رۆژی دوایی، وەکوو ئەو ئەنگوستیلەیە، دە ئەنگوستیلەی داوا کرد کە سازی بکەن و سەر و دانەیەکی دا بە کەنیزەکان.

فەرمووی کە « پرسیار هێشتا قایمە و ئەمە وڵام نیە و پێوەندی بەمەوە نیە. ئەم هەواڵە یەکێک لەو دە کەنیزە بیڵێ یا کەسێک لە دەرەوەی ئەو دەیە؟ ئەگەر لەو دە کەنیزە یەکیان کوتبێی، کەوایە ئەو زانی کە ئەو ئەنگوستیلە تایبەتی ئەو نیە و هەرکام لە کەنیزەکەکان یەکێکی وەک ئەویان هەیە، کەوایە ئەو هەڵبژاردە و خۆشەویستتر نیە. ئەگەر ئەو هەواڵە غەیری ئەو دە کەنیزە بیڵێن، کەوایە خۆی خزمەتکاری پادشا و خۆشەویستی ئەوە. »

یەکێک گوتی « ئاشق دەبێ زەلیل بێ و سووک بێ و سێبوور بێ ... » و لەم بابەتانەی هەڵدەدا.

فەرمووی کە « کەی ئاشق وایە؟ ئەگەر بێ داوای مەعشووق بێ، کەوایە ئەو ئاشق نیە. بە شوێن داوای خۆیەوە. ئەگەر بە داوای مەعشووق بێ، چونکە مەعشووق نایەوێ ئەو زەلیل و سووک بێ، کەوایە ئەو چۆن زەلیل و چرووک دەبێ؟ کەوایە دەرکەوت کە ئەحواڵی ئاشق روون نیە، ئیللا هەتا مەعشووق ئەوی چۆن بوێ.

ئەهلی رواڵەت دەڵێن کە « مرۆڤ گۆشتی حەیوان دەخوا و هەردووک حەیوانن! »

ئەمە خەتایە. بۆچی؟ چونکە مرۆڤ گۆشت دەخوا و ئەویش حەیوان نیە، جەمادە. چونکە کاتێک کوژراوە، حەیوانەتی تێدا نامێنێتەوە.

ئیللا غەرەز ئەوەیە کە شێخ مرید قووت دەدا، بێوێنە و هاوتا، زۆرم پێ سەیرە کارێکی وەها نادر.

یەکێک پرسیاری کرد کە « ئیبراهیم بە نەمروودی گوت: خودای من مردوو زیندوو دەکاتەوە و زیندوو دەمرێنێ. »

نەمروود گوتی کە « منیش یەکێک لە دەستەڵات دەخەم، وەهایە کە ئەوم مراندبێ و دەستەڵات دەدەم بە یەکێک وەهایە کە ئەوم زیندوو کردبێتەوە. »

ئەوسا، ئیبراهیم لەوێ دابەزی و بەوە بەزی و بەڵگەیەکی دیکەی دەست پێکرد کە « خودای من هەتاو لە رۆژهەڵات دەردێنێ و لە رۆژاوای دەنێ، تۆ بە پێچەوانەی ئەوە بکە! »

ئەو قسەیە لە رواڵەت دا، دژی ئەوە؟

فەرمووی کە « حاشا کە ئیبراهیم ببەزێ و وڵامی پێنەبێ، بەڵکە ئەوە قسەیەکە بە شێوەیەکی دیکە. یانی هەقتەعالا ئاولەمە لە رۆژهەڵاتی منداڵدان دەردێنێ و لە رۆژاوای گۆڕی دەنێ. کەوایە بەڵگەی ئیبراهیم هەر یەک قسە بوە.

هەقتەعالا هەردەم مرۆڤ سەرلەنوێ دەخوڵقێنێ و دە دەروونی ئەو دا شتێکی

دیکە، تازە تازە، پێکدێنێ کە یەکەم وەک دووهەم ناچێ و دووهەم وەک سێهەم. ئیللا ئەو لە خۆی غافڵە و خۆی ناناسێ.

سوڵتان مەحموود ئەسپێکی بەحرییان بۆ هێنابوو گەلێک باش و روخسارێکی لە رادەبەدەر جوان. رۆژی جەژن، سواری ئەو ئەسپە بوو. گشت خەڵک بۆ تەماشا لە سەربانەکان دانیشتبوون و سەیریان دەکرد. مەستێک لە ماڵ دانیشتبوو و بە زۆر بردیانە سەربان کە « تۆش وەرە هەتا ئەسپی بەحریی ببینی! »

گوتی « من بۆ خۆم خەریکم و نامەوێ و وازم لێی نیە. »

بە گشتی، چارەیەک نەبوو. کە هاتە سەربان و گەلێک مەست بوو، سوڵتان تێدەپەڕی. کاتێک مەست سوڵتانی لە سەر ئەو ئەسپەی بینی، گوتی « ئەو ئەسپە لای من چیە؟ ـ ئەگەر ئێستا شایەر بەندێکم پێهەڵبڵێ و ئەو ئەسپە هی من بێ، دەستبەجێ پێیدەبەخشم. »

کاتێک سوڵتان ئەمەی بیست، زۆر تووڕە بوو. فەرمووی کە دە زیندانی بکەن.

حەوتوویەک تێپەڕی. ئەو کابرایە کەسی ناردە لای سوڵتان کە « ئاخر، گوناهی من چی بوو و تاوانم چیە؟ شای عالەم بفەرمێ هەتا لە بەندەی روون بێتەوە! »

سوڵتان فەرمووی کە ئەو بێنن. گوتی « ئەی بێ چاو و رووی بێ ئەدەب، ئەو قسەت چۆن گوت و چۆنت وێرا؟ »

گوتی « ئەی شای عالەم، ئەو قسەیە من نەمگوت. ئەو دەمە، پیاوێکی مەست لە سەربان وەستابوو، ئەو قسەیە ئەو گوتی و رۆیشت. ئێستا، من ئەو نیم، من پیاوێکی ئاقڵ و وریام. »

شا پێیخۆش بوو. خەڵاتی کرد و لە زیندان رزگاری فەرموو.

هەرکەس پێوەندیی بە ئێمەوە گرت و لەم شەرابە مەست بوو، بۆ هەرکوێ کە بچێ، دەگەڵ هەرکەس کە دانیشێ و دەگەڵ هەر قەومێک قسە بکا، ئەو لە راستی دا دەگەڵ ئێمە دادەنیشێ و دەگەڵ ئەم جنسە تێکەڵاو دەبێ. چونکە قسەی ئەغیار ئاوێنەی لوتفی یارە و تێکەڵاویی دەگەڵ غەیری جنس دەبێتە هۆی خۆشەویستی و تێکەڵاویی دەگەڵ جنس.

ئەبووبەکر بە شەکر دەڵێ « ئوممی » ـ یانی شیرنی زگماک.

نووکە، میوەکانی دیکە فیز بە شەکر دەفرۆشن کە « ئێمە ئەو هەموو تاڵاییمان چێژتوە هەتا گەیشتووینەتە پلەی شیرنایی. تۆ چێژی شیرین چووزانی کە زەحمەتی تاڵاییت نەچێژتوە؟ »

## تەرکی خزمەت دژی مەحەببەت نیە!

هەندێک گوتوویانە « مەحەببەت دەبێتە هۆی خزمەت! » و وەها نیە. بەڵکە مەیلی مەحبووب داوای خزمەت دەکا و ئەگەر مەحبووب بیەوێ دڵدار خەریکی خزمەت دەبێ و خزمەتیشی لە دەست دێ. ئەگەر مەحبووب نەیەوێ، تەرکی خزمەت دەکا. تەرکی خزمەت دژی مەحەببەت نیە.

ئاخر، ئەگەر ئەو خزمەت نەکا، ئەو مەحەببەتە تێیدا خزمەت دەکا. چونکە ئەسڵ مەحەببەتە و خزمەت فەرعی مەحەببەتە. ئەگەر سەردەست[ی کەوا] بجووڵێتەوە، ئەو جووڵە هی دەستە. ئیللا پێویست نیە کە ئەگەر دەست بجووڵێتەوە، سەردەستیش بجووڵێتەوە. بۆ وێنە کەسێک جوببەیەکی گەورەی هەیە، وەها کە دە جوببە دا دەگەوزێ کە جوببە ناجووڵێتەوە ـ لەوانەیە. ئیللا جووڵانەوەی جوببە مومکین نیە، بێ جووڵەی کەسێک.

هەندێک جوببەیان بە کەس داناوە و سەردەست بە دەست و کەوش و پاچەی شاڵواریان بە پێ داناوە. ئەم دەست و پێیە، سەردەست و پێتاوەی دەست و پێیەکی دیکەیە. دەڵێن « فلان ژێردەستی فلانە » و « فلان دەستی بە زۆر شت رادەگا » و «فلان قسە دەستی دەداتێ. » بێشک غەرەز لەو دەست و پێیە، ئەم دەست و پێیە نیە.

ئەو ئەمیرە هات و ئێمەی کۆ کردەوە و خۆی رۆیشت ـ هەر ئەوجۆرەی کە هەنگ، مێو و هەنگوینی کۆ کردەوە و خۆی رۆیشت، فڕی. چونکە وجوودی ئەو شەرت بوو. ئاخر، بەقای ئەو شەرت نیە. دایک و باوکەکانی ئێمە وەک هەنگن کە داواکەر و داواکراو و ئاشق و مەعشووق لێک کۆ دەکەنەوە و خۆیان لەپڕ دەفڕن. هەقتەعالا ئەوانی کردۆتە هۆ لە کۆ کردنەوەی مێو و هەنگوین دا. مێو و هەنگوین دەمێننەوە و باغەوان. ئەوان خۆشیان لەو باغە دەرناکەون. ئەمە وەها باغێک نیە کە بکرێ لێی دەرکەوی، ئیللا لە گۆشەیەکی باغ بۆ گۆشەیەکی دیکە دەچن.

لەشی ئێمە وەک شەڵخەیەکە و مێو و هەنگوینی ئەشقی هەقی تێدایە. هەنگەکان ـ دایک و باوکەکان ـ هەرچەند هۆن، بەڵام تەربیەت لە باغەوان وەردەگرن و شەڵخە

باغەوان سازی دەکا.

هەقتەعالا روخسارێکی دیکەی دا بەو هەنگانە. ئەودەم کە ئەو کارەیان دەکرد، بەرگی دیکەیان دەبەر دابوو بە پێی ئەو کارە. کە چوونە عالەمی دیکە، بەرگیان گۆڕی. چونکە لەوێ کاری دیکەیان لێدەوەشێتەوە، دەنا ئەو کەسە هەر ئەوەیە کە پێشتر بوو. وەها کە بۆ وێنە کەسێک چوو رەزم و بەرگی شەڕی دەبەر کرد و چەکی لە خۆ بەست و خوودی دە سەر کرد، چونکە رۆژی شەڕ بوو. بەلام کە بێتە بەزم، ئەو بەرگانە دادەکەنێ، چونکە خەریکی کارێکی دیکە دەبێ، دەنا کەس هەر ئەو کەسەیە، ئیللا چونکە تۆ ئەوت دەو بەرگە دا دیوە، کاتێک یادی بکەی، دەو بەرگ و بەو بیچمە دەتەوێ بیهێنیە بەر زەین ـ هەرچەند سەد بەرگیشی گۆڕیبێ.

کەسێک ئەنگوستیلەیەکی لە شوێنێک ون کرد. هەرچەند لەوێ لایبەرن، ئەو لە دەوروبەری ئەو شوێنە دەگەڕێ ـ یانی « من لێرەم ون کردوە! » وەها کە خاوەن تازیە لە دەوری گۆڕ دەگەڕێ و بە دەوری خاک دا بێخەبەر تەواف دەکا و رایدەمووسێ ـ یانی « ئەنگوستیلەکەم لێرە ون کردوە. » ئەو کەی ئەو شوێنە جێ دێلێ؟ هەقتەعالا گەلێک سەنعەتی کرد و دەستەلاتی خۆی نواند هەتا رۆژێک و دوو، رووح لە قالب بدا بۆ حیکمەتی خودایی. مرۆڤ ئەگەر بە قالبەوە ساتێک لە گۆڕ دابنیشێ، ترسی ئەوە هەیە کە شێت بێ. کەوایە چلۆنە کاتێک لە داوی روخسار و کۆلکەی قالب بفڕێ، کەی لەو شوێنە دەمێنێتەوە؟ هەقتەعالا ئەوەی بۆ ترساندنی دلەکان و زیاد کردنی خۆف، کردە نیشانە هەتا خەلک خۆفی گۆڕ و خاکی رەش بیانگرێ. وەها کە لە رێگا، کاتێک لە شوێنێک لە کاروانێک بدەن، ئەوان دوو سێ بەرد لە سەریەک دادەنێن، بۆ نیشانە: یانی ئێرە شوێنی مەترسییە. ئەو گۆڕەش، هەروایە، نیشانەیەکی هەستپێکراوە بۆ شوێنی مەترسی. ئەو خۆفە شوێن لە سەر دلیان دادەخا، پێویست ناکا بە عەمەل بێ. بۆ وێنە ئەگەر بلێن کە « فلان کەسە لە تۆ دەترسێ » بێ ئەوەی کە کارێک بکا تۆ مێهرێک لە هەق ئەو دا هەست پێدەکەی بێشک. بەلام ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمە بلێن کە « فلانە هیچ ترسی لە تۆ نیە و تۆ لە دلی ئەو دا سامێکت نیە » بە دوای ئەوە دا، بێ ئەوەی کە کارێکی کردبێ دە دلت دا لێی توورە دەبی.

ئەو راکردنە لەبەر خۆفە. هەموو عالەم رادەکەن، ئیللا راکردنی هەرکەس بە پێی حالی ئەو کەسەیە. لە مرۆڤ دا جۆرێک و لە گیایەکان دا جۆرێک و لە رووحەکان دا جۆرێکی دیکە. راکردنی رووح بێ هەنگاو و بێ نیشانەیە. ئاخر، سەیری بەرسیلە

بکە کە چەندەی راکرد هەتا گەیشتە سیوادی تریێ! هەر کە شیرین بوو، دەستبەجێ، بەو پلەیە دەگا. ئیللا ئەو راکردنە وە بەرچاو نایە و هەست پێناکرێ. ئیللا کە بگاتە ئەو پلەیە، دەردەکەوێ کە گەلێک رایکردوە هەتا گەیشتۆتە ئێرە. هەر ئەوجۆرەی کە کەسێک دەچێتە نێو ئاو و کەس چوونەکەی نابینێ. کە لەپڕ سەر لە ئاو دەرکێشێ، دەردەکەوێ بە بن ئاو دا رۆیشتوە کە گەیشتۆتە ئێرە.

## مەحەببەت لە تەرازوو دا ناگونجێ!

سـەرتر بوونی ئەبووبەکـر لە خـەڵکی دیکە نەک لـەبەر نوێژی زۆر و ڕۆژووی زۆرە، بەڵکە لەبەر ئەوەیە کە عینایەتی پێکراوە و ئەویش مەحەببەتی ئەوە.

لـە قـیـــامـــەت، کـــاتێک نوێژەکـــان بێـنن، لە تـەرازووی بنێن و ڕۆژووکـــان و سـەدەقـەکانیش. بەڵام کـاتێک مـەحـەببـەت بێنن، مـەحـەببـەت لە تەرازوو دا ناگونجێ. کەوایە ئەسڵ مـەحەببـەتە. نووکە، ئەگەر مـەحەببەت دە خـۆت دا دەبینی، ئەو زیاد بکە هەتا پتـر بێ! کـاتێک سـەرمـایەت دە خـۆت دا دیت ـ کە ئـەویش داوایە ـ ئەو بە داوا، زیاد بکە! دەنا ئەگەر زیادی نەکەی، سەرمایە لە کیست دەچێ.

کەمـتر لە زەوی نی. زەوی بە هـەڵگێڕ و وەرگێڕ کردن بە پێمـەڕە، شێـوی دەکەن و گیـای دەدا. ئـەگـەر تەرکی بکەن، ڕەقـەن دەبێ. کـەوایە کـاتێک دە خـۆت دا داوایەکت دیت، دێـی و دەڕۆی و مـــەڵێ کـــە « لـەم ڕۆیشـــتـنە چ فـایدە؟ » تۆ بڕۆ، فـایدە خـــۆی دەردەکـەوێ. ڕۆیشـتـنی کـەسێک بەرەو دوکـان، جگە لە حـاجـەت دان نیـە: هـەقـتـەعـالا بژیو دەدا ـ کە ئەگەر لە ماڵ دانیشێ، لەو داوایە بێنیاز بێ، بژیوی ناگا. سـەیرە، ئەو سـاوایەی کـە دەگری، دایک شیری دەداتێ. ئەگـەر بە مێشکی دابێ کـە « چ فایدەیەک لەو گـریانەی من دایە و چۆن دەبێـتـە هـۆی شیـر دان » لە شـیر بێبـەش دەبێ. ئێـسـتـا دەبینین کە لەبەر ئەو هۆیە، شیر بەو دەگا.

ئاخـر، ئەگـەر کەسـێک بیـر لەوە بکاتەوە کە « لەم ڕکووع و سجـوودە چ فـایدەیەک هـەیە، بۆچ بیکەم؟ » لای ئەمـیـرێـک و سـەرۆکێک کـە ئەم خـزمـەتەی دەکـەی و ڕکووع دەکەی و چۆک دادەدەی، ئاخـر ئەو ئەمیـرە ڕەحمـەتت پێدەکا و کوتە نانێکت دەداتێ. ئەو شتـەی کە دە ئەمیـر دا ڕەحـمـەت دەکا پێست و گـۆشتی ئەمیر نیـە. دوای مەرگ، ئەو پێست و گۆشتـە دەمێنێتەوە، لە خـەو و لە بێهـۆشیش دا، بەڵام ئەم خزمـەتە زایە دەبێ لای ئەو. کـەوایە زانیـمـان کـە، ڕەحـمـەت دە ئەمـیـر دایە و وەبەر چاو نایە و نابیـندرێ. کـەوایـە چۆن دەکـرێ دە پێسـت و گـۆشـت دا شـتـێک خـزمـەت بکەین کـە نایبـینین، لە دەرەوەی گـۆشت و پێسـتـیش دا مـومکینە و ئەگـەر ئەو شـتـەی کـە دە پێست و گـۆشت دایە شـاراوە نـەبا، ئەبووجـەهل و مـسـتـەفـا یەک دەبوون. کـەوایە فەرقێک دە نێوان ئەوان دا نەدەبوو.

ئەم گوێیە لە رواڵەت دا، کەڕ و ژنەوا، یەکێکە ـ فەرقێک نیە. ئەو هەر قالبێکە و ئەم هەر قالبێک. ئیللا ئەوەی کە ژنەوایی ـ یە دەو دا شاراوەیە، ئەو وەبەر چاو نایە. کەوایە ئەسڵ ئەو عینایەتەیە. تۆ کە ئەمیری، تۆ دوو غولامت هەبێ: یەک خزمەتێکی زۆری کردوە و بۆ تۆ گەلێک سەفەری کردوە و ئەوی دیکە تەوەزەلە لە بەندایەتی دا. ئاخر، دەبینم کە مەحەببەتت پتر بەو تەوەزەلە هەیە هەتا خزمەتکارەکە. هەرچەند ئەو بەندە خزمەتکارەی وە پشت گوێ نادەی، بەلام وا هەڵدەکەوێ.

لە سەر عینایەت ناتوانی حوکم بکەی. ئەم چاوی راست و چاوی چەپ هەردووک لە رواڵەت دا یەکن. سەیرە، چاوی راست چ خزمەتێکی کردوە کە چەپ نەیکردبێ؟ و دەستی راست چ کارێکی کردوە کە چەپ نەیکردبێ؟ هەروەتر پێی راست؟ بەلام عینایەت بە چاوی راست درا و هەروەتر هەینی لە چاو باقی رۆژەکان سەرووتر کرا. نووکە، ئەو هەینی ـ یە چ خزمەتێکی کرد کە رۆژەکانی دیکە نەیانکرد؟

ئەگەر کوێرێک بڵێ کە « منیان وەها کوێر خولْقاندوە، ببوورن! » بەو قسەیە کە «کوێرە » و « ببوورن » کەلکی پێناگا و لەو رەنجە رزگاریی نایە. ئەو کافرانەی کە دە کوفر دان، ئاخر لە رەنجی کوفر دان و دیسان کە چاو لێدەکەین، ئەو رەنجەش عەینی عینایەتە. چونکە ئەو لە راحەتی دا خودا فەرامۆش دەکا، کەوایە لە رەنج دا یادی دەکا.

کەوایە دۆزەخ پەرستگا و مزگەوتی کافرانە، چونکە لەوێ یادی هەق دەکەن ـ هەروەک لە زیندان دا و لە کوێرەوەریی و ددان ئێشە دا. کە رەنج دابێ، غەفلەت دەدڕێ، ئیقرار بە حەزرەتی هەق دەکا و دەناڵێنێ کە « یارەب، یارەحمان و یاهەق! » چاک بۆوە، دیسان پەردەی غەفلەت دادەکەوێ، دەڵێ « کوا خودا؟ نایبینمەوە، نایبینم، لە چی بگەڕێم؟ » چۆنە کە لە کاتی رەنج دا دیتت و دیتتەوە، ئێستا نایبینیەوە؟ بەلام چونکە لە رەنج دا دەیبینی، رەنجت لێ دادێن هەتا ناوی خودا بەری. چونکە عالەم و ئاسمان و زەوی و مانگ و هەتاو و ئەستێرەکان و چاک و خراپی بۆ ئەوە خولْقاند کە یادی ئەو بکەن و بەندایەتی ئەو بکەن و شوکرانەبژێری ئەو بن. کاتێک کافرەکان لە راحەتی دا نایکەن و مەبەست لە خولْقانیش یادی ئەوە، کەوایە دەچنە جەهەننەم هەتا یادی بکەن.

بەلام بۆ دیندارەکان رەنج پێویست نیە. ئەوان لەو راحەتییە دا، لەو رەنجە غافڵ نین و ئەو رەنجە دایم بە حازر دەبینین. هەروەک منداڵێکی ژیر کە جارێک پێی لە فەللاقە ببەستن، بەس بێ. فەللاقە لە یاد ناکا. بەلام منداڵی گەوج فەرامۆشی دەکا.

کەوایە ئەو هەر دەم فەللاقەی دەوێ. هەروەتر، ئەسپێکی زیرەک ئەگەر جارێک مامزەی تێکوترێ، پێویست بە مامزەی دیکە ناکا، سوار بە فەرسەخ دەبا و چزووی ئەو مامزە فەرامۆش ناکا، بەڵام ئەسپی گێژ هەردەم مامزەی دەوێ، ئەو شیاوی باری خەڵک نیە، شیاکەی لێ بار دەکەن.

# تۆ وێنەی خۆتی!

لە سەردەمی عومەر، پیاوێک بوو کە زۆر پیر ببوو، وەها کە کچەکەی شیری دەدایە و وەک منداڵی ساوا بە خێوی دەکرد. عومەر بەو کچەی فەرموو کە « لەم زەمانە دا، ئەوەندی تۆ خزمەتی باوکت دەکەی هیچ منداڵێک ئەو ئەمەگەی نەداوەتەوە. »

ئەو وڵامی داوە کە « راست دەفەرمووی. بەڵام دە نێوان ئەمەگی من و ئەمەگی باوکی من دا جیاوازییەک هەیە، سەرەڕای ئەوە کە لە خزمەت کۆتایی ناکەم ـ کاتێک کە باوکم منی بە خێو دەکرد و خزمەتی دەکردم، لەرزی تێدەکەوت کە نەکا بەڵایەکم بە سەر بێ، کەچی من خزمەتی باوکم دەکەم و شەو و رۆژ دوعا دەکەم و مردنی ئەو لە خودا داوا دەکەم هەتا زەحمەتەکەی لە سەر شانم بێتەوە. من ئەگەر خزمەتی باوکم دەکەم، ئەو لەرز تێکەوتنی ئەو بۆ من، ئەوەی لە کوێ بێنم؟ »

عومەر فەرمووی کە « من حوکمم لە سەر رواڵەت کرد و تۆ کاکڵەکەیت گوت. »

فەقێ ئەوەیە کە ئاگاداری کاکڵی شتەکان بێ و هەقیقەتەکەی بزانێ. حاشا لە عومەر کە سەری لە هەقیقەت و رازی کارەکان دەرنەچووبێ! ئیللا سیرەتی سەحابە وەها بوو کە خۆی بشکێنێتەوە و پەسنی کەسی دیکە بکا.

گەلێک کەس هەن کە هێزی حوزووریان نیە و لە غەیبەت دا حاڵیان خۆشترە. هەر ئەوجۆرەی کە هەموو رووناکی رۆژ لە هەتاوە. ئەگەر کەسێک تەواوەتی رۆژ سەیری هەتاو بکا، هیچ کارێکی لە دەست نایە و چاوی زەق دەبێتەوە. بۆ ئەو واباشترە کە خۆ بە کارێکەوە خەریک بکا ـ و ئەویش غەیبەتە لە سەیری هەتاو. هەروەتر، لای نەخۆش باسی تەعامی خۆش هان دانی ئەوە بۆ هێز هاتنەوە بەر و کرانەوەی ئیشتیا، هەرچەند حوزووری ئەو خۆراکانە زیانی بۆ ئەو هەبێ.

کەوایە دەرکەوت کە بۆ داوا کردنی هەق، لەرز و ئەشق گەرەکە. هەرکەس لەرزی نەبێ، لە سەری واجبە خزمەتی لەرزاوەکان بکا. هیچ میوەیەک لە ساقەتی درەخت ناڕوێ، چونکە لەرزیان نیە. سەر لکەکان دەلەرزێن. بەڵام ساقەتی درەختیش بە هێزە بۆ سەرلکەکان و بۆ خاتری میوە لە برینی تەور لە ئەمان دایە و کاتێک لەرزەی

ساقەتی دار لە تەورەوە بێ، بۆ ئەو نەلەرزان باشترە و وەستاویی چاکتر، هەتا خزمەتی لەرزاوەکان بکا. چونکە « معین الدین »ە، « عین الدین » نیە ـ بە هۆی میمێک کە زیاد بوو لە سەر « عین » ئەو زیادییەی « میم » کەموکوورییە. هەر ئەوجۆرەی کە شەش قامک هەبێ. هەرچەند زیادە، بەڵام کەموکوورییە. ئەحەد کەماله و ئەحمەد هێشتا لە پلەی کەمال دانیە. کە ئەو « میم »ە نەمێنێ، بە تەواوەتی دەبێتە کەمال. یانی هەق موحیتی هەموو شتێکە، هەرچی لێ زیاد بکەی، کەموکوورییە. ژمارەی یەک دەگەڵ هەموو ژمارەیەک هەیە و بەبێ ئەو، هیچ ژمارەیەک مومکین نیە.

سەید بورهانەددین فایدەی دەفەرموو. گەوجێک دە نێو قسەی ئەو دا گوتی کە «ئێمە قسەیەکمان دەوێ بێوێنە! »

فەرمووی کە « تۆ بێوێنەی؟ وەرە هەتا قسەی بێوێنە ببیسی! »

ئاخر، تۆ وێنەی خۆتی. تۆ ئەمە نی. ئەو کەسەی تۆ سێبەری تۆیە. هەر ئەوجۆرەی کە کەسێک مرد دەڵێن « فلانی رۆیشت » ئەگەر ئەو ئەمە با، کەوایە چوو کوێ؟ کەوایە دەرکەوت کە رواڵەتی تۆ وەک دەروونی تۆیە، هەتا لە رواڵەتی تۆ ئیستدلالی دەروون بکەن.

هەر شتێک کە وەبەر چاو دێ، لەبەر خەستییە. وەها کە هەناسە لە گەرما دا نابیندرێ، ئیللا کە سەرما داهات، لەبەر خەستی، وەبەر چاو دێ.

لە سەر نەبی واجبە کە باسی هێزی هەق بکا و بانگەوازیی سزا. ئیللا لە سەر ئەو واجب نیە کە ئەو کەسە بگەیەنێتە پلەی ئیستعداد. چونکە ئەوە کاری هەقە و هەق دوو سفەتی هەیە: قەهر و لوتف. ئەنبیا نوێنەری هەردووکیانن. ئیمانداران نوێنەری لوتفی هەقن و کافران نوێنەری قەهری هەق. ئەوانەی کە دانی پێدا دێن، خۆیان دە ئەنبیا دا دەبیننەوە و دەنگی خۆیان لەوەوە دەبیسن و بۆنی خۆیان لەو دا دەزانن. کەوایە کەس مونکری خۆی نابێ. لەبەر ئەوەیە ئەنبیا بە ئوممەت دەڵێن کە «ئێمە ئێوەین و ئێوە ئێمەن. دە نێوان ئێمە دا بێگانەیی نیە. »

کەسێک دەڵێ کە « ئەمە دەستی منە » هیچ داوای شایەتی لێناکەن ـ چونکە ئەندامێکی پێوەلکاوە. بەڵام ئەگەر بڵێ « فلانی کوڕی منە » داوای شایەتی لێدەکەن ـ چونکە بەشێکی پێوەنەلکاوە.

## هیوا بەرمەدە!

حەزرەتی رەسووڵ فەرمووی: خرابترین زانایان ئەوانەن کە بۆ لای حاکمان دەچن و باشترین حاکمان ئەوانەن کە بۆ لای زانایان دەچن. میرێک کە بچێتە بەر دەرگای هەژارەکان، میرێکی شایەنە و چ ناحەزە بۆ هەژارێک کە بچێتە بەر دەرگای میر.*

خەڵک لە رواڵەتی ئەو قسەیە گەیشتوون کە « نابێ زانا بچێتە زیارەتی میر هەتا لە رێزەی خراپانی عالەم دا نەبێ ». ماناکەی ئەوە نیە کە پێیانوابوە، بەڵکە ماناکەی ئەوەیە کە « شەڕڕی عالەم ئەو کەسەیە کە یارمەتی لە دەستەڵاتدار وەرگرێ و لێهاتوویی و بەرژەوەندیی ئەو بە هۆی دەستەڵاتدارەکانەوە بێ و لە ترسی ئەوان، لە پێشدا ئەو نیەتەی فێرە خۆ کردبێ کە میرەکان خەڵاتم دەدەنێ و رێزم دەگرن و پلە و پایەم پێدەسپێرن ». کەوایە ئەو بە هۆی میرەکانەوە پێگەیشتوە و لە نەزانینەوە بە گەیشتۆتە زانیاریی و کاتێک بوو بە زانا لە ترس و سیاسەتی ئەوان بەئەدەب دەبێ و بەم پێیە دەچێتە پێش سەرکەوتوو یا سەرنەکەوتوو. بە گشتی چ میر بە رواڵەت بچێتە زیارەتی ئەو، یا ئەو بچێتە زیارەتی میر، ئەو زیارەتکەرە و میر زیارەتکراو. بەڵام کاتێک زانا لە هەوڵی ئەوە دابووبێ کە بە هۆی دەستەڵاتداران بە زانیاریی نەگەیشتبێ، بەڵکە زانستی ئەو یەکەم و ئاخر هەر بۆ خودا بێ و شێوە و شێوازی ئەو بۆ رێگای خێر بێ، کە مەیلی ئەو هەر ئەوەیە و جگە لەوەی پێناکرێ ـ هەروەک ماسی کە جگە لە ئاو نەتوانێ بژی و بمێنێتەوە. وەها زانایەک ئەگەر بچێتە لای میر بە رواڵەت زیارەتکراوە و میر زیارەتکەر، چونکە لە تەواوی حاڵەتەکان دا میر لەو وەردەگرێ و یارمەتی لێدەخوازێ؛ ئەو وەک هەتاوی پرشنگدارە، کاری ئەو عەتا و بەخشینە.

مستەفا کافرەکانی تێکشکاندبوو و کێشەوە و تاڵانی کردبوو، گەلێک دیلی گرتبوو، بەندی لە دەست و پێ کردبوون و لە نێو ئەو دیلانە دا، یەکیان مامی ئەو بوو ـ عەبباس. ئەوان تەواوەتی شەو لە بەند دا و لە بێدەستەڵاتی و چارەڕەشی دا دەگریان و دەپاڕانەوە و هیوایان لە خۆ بڕیبوو و چاوەڕوانی تیغ و کوشتن بوون. مستەفا چاوی لێکردن و پێکەنی. ئەوان گوتیان « دیتت کە بەشەرییەت دەو دا هەیە

و ئەوەی کە ئیدعای دەکرد دە من دا بەشەرییەت نیە، بە پێچەوانەی راستی بوو؟ نووکە چاو لە ئێمە دەکا، ئێمە لەو بەند و کۆت و زنجیرە دا بە ئەسیری خۆی دەبینێ، شاد دەبێ ـ هەر ئەوجۆرەی کە نەفسانییەکان کاتێک بە سەر دوژمن دا زاڵ دەبن و ئەوان بە زەلیلی خۆیان دەبینن، شاد دەبن و بەزم دەگێرن. »

مستەفا دەروونی ئەوانی خوێندەوە، گوتی « نا ـ حاشا کە من لەبەر ئەوە پێبکەنم کە دوژمن بە زەلیلی بەردەست ببینم یا زیان بە ئێوە بگەیەنم و لەوە شاد بم! بەڵکە، لەوە پێکەنینم دێ کە بە چاوی سەر دەبینم قەومێک لە تون و دۆزەخ و دووکەڵدانی رەش، بە کۆت و زنجیر، بە کێشەکێش و بە زۆر، بۆ لای بەهەشت و رزوان و گوڵستانی ئەبەدییان دەبەم، کەچی ئەوان هات و هاواریانە کە بۆچی ئێمە لەو مەترسی و تەنگژەیە، بۆ ئەو گوڵشەن و پەناگایە دەبەی؟ پێکەنینم دێتێ. سەرەڕای ئەمە، لەبەر ئەوەی کە ئێوە هێشتا ئەو روانگەیەتان تێداپێکنەهاتوە لەمەی کە دەڵێم، تێبگەن و بە ئاشکرا ببینن. هەقتەعالا دەفەرمێ کە بە ئەسیرەکان بڵێ «ئێوە لە پێشدا لەشکرتان کۆ کردەوە و شەوکەتێکی زۆر و لە سەر پیاوەتی و پاڵەوانەتی و شەوکەتی خۆتان بڕوایەکی تەواوتان هەبوو. بە خۆتان گوت کە ئێمە وەها دەکەین، موسڵمانەکان وەها تێکدەشکێنین و دەیانبەزێنین و قادرێک لە خۆتان قادرتر نەدەدیت و قاهرێک لە سەرووی قەهری خۆتان نەدەناسی. بەناچار، ئەوەی کە تەگبیرتان لێکردبۆوە کە وەها بێ، تەواوی بە پێچەوانەی ئەوە. دیسانیش ئێستاش کە خۆفتان رێنیشتوە، لەو عیللەتە تۆبەتان نەکردوە: هیوابڕوان و لە سەرووی خۆتان قادرێک نابینن. کەوایە دەبێ لە حاڵی شەوکەت و دەستەڵات من ببینن و خۆتان بە بەزیوی من دابنێن هەتا لە کارەکانتان دا سەرکەوتوو بن و لە حاڵی خۆف دا هیوابڕاو لە من مەبن ـ کە قادرم ئێوە لە خۆف رزگار بکەم و هێمن بکەمەوە. ئەوکەسەی کە لە مانگایەکی سپی گایەکی رەش دەردێنێ، دەتوانێ لە مانگای رەشیش گای سپی دەربێنێ. نووکە، لەو حاڵە دا کە ئەسیرن، هیوا لە حەزرەتی من مەبڕن، هەتا دەستتان بگرم! نووکە، هەقتەعالا دەفەرموێ کە ئەی ئەسیرەکان، ئەگەر لە مەزهەبی یەکەم پاشگەز بنەوە و لە خۆف و ترس دا من ببینن و هەموو حاڵێک دا خۆتان بە بەزیوی من دابنێن، من ئێوە لەو خۆفە رزگار دەکەم و هەر ماڵێک کە لێتان بە تالان چوە و فەوتاوە، هەمووتان دەدەمەوە ـ بەڵکە پتر لەو و باشتر لەو ـ و لە ئێوە خۆش دەبم و دەوڵەتی ئاخرەتیش لە دەوڵەتی دونیاتان زیاد دەکەم. »

عەبباس گوتی « تۆبەم کرد و لەوەی کە بووم پاشگەز بوومەوە! »

مستەفا فەرمووی کە « ئەو ئیدعایە کە دەیکەی، هەقتەعالا داوای نیشانەت لێدەکا! »

عەبباس گوتی « بیسمیللا! چ نیشانەیەکت دەوێ؟ »

فەرمووی کە « لەو مالانەی کە ماوتن، پێشکەشی لەشکری ئیسلامی بکە، هەتا لەشکری ئیسلام قەوەت بگرێ - ئەگەر بوویە موسلمان و چاکەی ئیسلام و موسلمانییت دەوێ! »

گوتی « یا رەسووڵ، چم بۆ ماوەتەوە؟ هەموویان بە تالان بردوە. حەسیرێکی شڕیان بەجێ نەهێشتوە! »

فەرمووی کە « دیتت راست نەبووی و لەوەی کە بووی پاشگەز نەبوویەوە! پێتبڵێم کە چەندەت ماڵ هەیە و بە کێت سپاردوە و لە کوێ شاردۆتەوە و ناشتووتە؟ »

گوتی « حاشا! »

فەرمووی کە « ئەوەندەت مالی بژاردە بە دایکی فەزل نەسپاردوە و دە دیوار دا نەتشاردۆتەوە و وەسیەتت نەکردوە بە وردی کە ئەگەر هاتمەوە بە خۆمی دەسپێریەوە و ئەگەر بە سلامەت نەهاتمەوە بە فلانە بەرژەوەندەی دەدەی و ئەوەند بە فلان و ئەوەندی بۆ تۆ بێ؟ »

کاتێک عەبباس ئەوەی بیست، قامکی بەرز کردەوە و بە راستییەکی تەواو ئیمانی هێنا و گوتی « ئەی پێغەمبەر، بە هەق، من پێمەوابوو بەخت رووی تێکردووی لە دەوری فەلەک - چونکە پێشینیانی وامان هەبوون لە پادشاکان - وەک هامان و شەددا و نەمروود و غەیرە. کە ئەوەت فەرموو، لێم دەرکەوت و تێگەیشتم کە ئەو بەختە هی ئەو سەرەیە کە ئیلاهی و رەببانییە. »

مستەفا فەرمووی « راست دەکەی. ئەوجارە بیستم کە ئەو زوننارە شکەی کە دە دەروونت دابوو شکا و زرینگەی گەیشتە گوێم. من گوێیەکی شاراوەم هەیە لە عەینی گیان دا، کە هەرکەس زوننای شک و شرک و کوفری بشکێ، من بە گوێی شاراوەم دەیبیسم و زرینگەی دەگاتە گوێی گیانی من. نووکە، راستە کە راست بوویەوە و ئیمانت هێناوە. »

خوداوەندگار بۆ شی کردنەوە فەرمووی کە « من ئەمەم بە ئەمیر پەروانە بۆ ئەوە گوت کە، تۆ لە پێشدا موسلمانێک بووی کە دەتگوت خۆم فەدا دەکەم و ئەقڵ و را و

تەگبیری خۆم بۆ بەقای ئیسلام و پەرەگرتنی ئەهلی ئیسلام فەدا دەکەم، هەتا ئیسلام بمێنێتەوە. چونکە بڕوات بە رای خۆت کرد و هەقت نەدیت و هەمووت لە هەقەوە نەزانی، لەبەر ئەوە هەقتەعالا هەر ئەو هۆیە و ئەو هەوڵەی تۆی کردە هۆی کەمایەسی ئیسلام ـ کە تۆ دەگەڵ تاتار بوویە یەک و یارمەتیان دەدەی هەتا شامییەکان و میسرییەکان فەنا بکەی و وەلاتی ئیسلام وێران بکەی. کەوایە ئەوەی کە هۆی بەقای ئیسلام بوو، کردت بە هۆی کەمایەسی ئیسلام. کەوایە لەو حاڵەتە دا، روو لە خودا بکە ـ کە شوێنی خۆفە ـ و سەدەقەی بدە هەتا تۆ لە حاڵەتی خراپ ـ کە خۆفە ـ رزگار بکا و هیوای لێمەبڕە هەرچەند تۆی لەو حاڵەتە تووشی وەها بەلایەک کرد! ئەو تاعەتەت بە هی خۆت زانی بۆیە تووشی ئەو بەلایە بووی. نووکە، لەو بەلایەش دا، هیوابڕاو مەبە و بپاڕێوە ـ کە ئەو قادرە لەو تاعەتەی کە بوو بە بەڵا، لەو بەلایە تاعەت پەیدا بکا و تۆ لەوە پەشیمان بیەوە و ئەسبابێک پێکبێنێ کە تۆ دیسان بۆ پەرەگرتنی ئەهلی موسڵمانەتی هەوڵ بدەی و ببێتە هۆی قەوەتی موسڵمانەتی. »

خوداوەندگار فەرمووی کە « من ئەوەم بە ئەمیر پەروانە گوت هەتا لەمە تێبگا و لەو حاڵەتە دا سەدەقەی بدا و بپاڕێتەوە ـ کە لە حاڵەتی بەرزیی دابەزیوەتە سەر نزمی و دەبێ لەم حاڵەتە دا هیوادار بێ. »

هەقتەعالا بە مەکرە: روخساری جوان ساز دەکا و دە دەروونیان دا روخساری دزێو ـ هەتا مرۆڤ لەخۆبایی نەبێ کە « من رایەکی باش و کارێکی باشم لێدەرکەوت و رووی تێکردم »

باش دیاری دەکەی و لە راستی دا، دزێوە. دزێو دیاری دەکەی و لە راستی دا، باشە. کەوایە بە ئێمە هەرشتێک وەها بنوێنە کە هەیە، هەتا دە داو نەکەوین و گومڕا نەبین.

* قال النبی علیەالسلام شر العلماء من زار الامراء و خیر الامراء من زار العلماء نعم الامیر علی باب الفقیر و بئس الفقیر علی باب الامیر.

## ئەقڵی کولل موحتاج نیە!

مستەفا دەگەڵ سەحابە دانیشتبوو. کافرەکان رەخنەیان دەست پێکرد.

فەرمووی کە « ئاخر، ئێوە هەمووتان لە سەر ئەو رایەن کە لە عالەم یەکێک هەیە کە ئەو خاوەنی وەحی ـ یە، وەحی بۆ ئەو دێتە خوار، بۆ هەرکەسێک نایەتە خوار و ئەو کەسە عەلامەت و نیشانەی هەیە، لە ئاکار و لە قسەکانی دا، لە سیمای دا، لە هەموو بەشەکانی ئەو دا نیشانە و عەلامەتی ئەوە هەیە. نووکە، کاتێک ئەو نیشانەتان دیوە، روو لەو بکەن و توند بیگرن، هەتا دەسگرۆی ئێوە بێ! »

ئەوان، هەموو دەبەزان و قسەی پتریان پێنەدەما، دەستیان بۆ شیر دەبرد و دیسان دەهاتنەوە و ئەسحابەکانیان ئازار دەدا و لێیاندەدان و سووکایەتیان پێدەکردن.

مستەفا فەرمووی کە « سەبر بکەن، هەتا نەڵێن کە بە سەر ئێمە دا زاڵ بوون، بە زاڵ بوون بە سەریان دا دەیانەوێ کە دین ئاشکرا بکەین! خودا دەیەوێ ئەو دینەی ئاشکرا بکا. »

سەحابە ماوەیەکی زۆر بە نهێنی نوێژیان دەکرد و ناوی مستەفایان بە نهێنی دێنا. هەتا دوای ماوەیەک، وەحی هات کە « ئێوەش شیر هەڵکێشن و شەڕ بکەن! »

مستەفا کە « ئوممی » پێدەڵێن، لەبەر ئەوە نایڵێن کە توانایی بە سەر خەت و زانست دا نەبوو. یانی لەبەر ئەوە پێیدەڵێن ئوممی کە خەت و زانست و حیکمەتی ئەو زگماک بوو، نەک فێرکراو. کەسێک کە رەقەم لە سەر قەمەر بدا، ئەو ناتوانێ خەت بنووسێ؟ لە عالەم دا چ هەیە کە ئەو نەیزانێ؟ چونکە هەموو لەو فێر دەبن.

ئەقڵی جزوو دەبێ چ شتێکی سەیری هەبێ کە ئەقڵی کولل نەیبێ؟ ئەقڵی جزوو ئەو لێهاتووییەی نیە کە لەخۆیەوە شتێکی نوێ ئیختراع بکا کە وەکی ئەو یا جنسی وەک ئەوی نەدیبێ. ئەوەی کە خەڵک نووسراوەیان نووسیوە و هەندەسەی نوێ و

بنیاتی نوێیان ناوه، نووسراوەی نوێ نین: جنسی ئەویان دیوه، لێی زیاد دەکەن. ئەو کەسانەی کە لەخۆوە نوێ ئیختراع دەکەن، ئەوان ئەقڵی کوللن. ئەقڵی جزوو شیاوی بار هێنانە، موحتاجە بە تەعلیم. ئەقڵی کولل موعەلیمە، موحتاج نیە.

هەروەتر، تەواوی پیشەکان کە بپشکنی، سەرچاوە و سەرەتاکەی وەحی بوە و لە ئەنبیاوە فێری بوون و ئەوان ئەقڵی کوللن. حەکایەتی قالاو ـ کاتێک قابیل، هابیلی کوشت و نەیدەزانی چ بکا، قالاو، قالاوێکی کوشت و خاکی هەڵکەند و قالاوی تێدا ناشت و خاکی بە سەر داکرد. ئەو لەو فێرە گۆڕ هەڵکەندن و ناشتن بوو و هابیلی ناشت و هەروەتر تەواوی پیشەکان.

هەرکەس کە ئەقڵی جزووی هەیە، موحتاجی فێر بوونە و ئەقڵی کولل داهێنەری هەموو شتەکانە و ئەوان ئەنبیا و ئەولیان کە ئەقڵی جزوویان بە ئەقڵی کولل وەسڵ کردوە و بۆتە یەک. بۆ وێنە دەست و پێ و چاو و گوێ و تەواوی هەستەکانی مرۆڤ قابیلن کە لە دڵ و لە ئەقڵ فێر بن: پێ لە ئەقڵ فێرە رۆیشتن دەبێ، دەست لە دڵ و ئەقڵ فێرە گرتن دەبێ، چاو و گوێ دیتن و بیستن فێر دەبن. بەڵام ئەگەر دڵ و ئەقڵ نەبن، ئەو هەستانە هیچ دەستەڵاتێکیان دەبێ و دەتوانن کارێک بکەن؟ نووکە، هەر ئەوجۆرەی کە ئەم لەشە لەچاو ئەقڵ و دڵ، پیس و خەستە و ئەوان لەتیفن و ئەم پیسە بەو لەتیفە قایمە و ئەگەر لوتف و تەڕ و تازەیی هەیە لەوەوە هەیەتی، بێ ئەو مەحتەلە و چەپەڵە و پیسە و ناڕەوایە، هەروەتر ئەقڵەکانی چووکیش لە چاو ئەقڵی کولل کەرەسەن، لەو فێر دەبن و لەو فایدە وەردەگرن و پیس و خەستە لەچاو ئەقڵی کولل.

یەکێک گوتی « بە هیممەت یادمان بکە! ئەسڵ هیممەتە. ئەگەر قسە نەبێ، با نەبێ، قسە فەرعە. »

فەرمووی « ئاخر، ئەم هیممەتە لە عالەمی رووحەکان بوو، بەر لە عالەمی لەشەکان. کەوایە ئێمەیان بۆ عالەمی لەش لەخۆوە هێناوە؟ ئەمە مەحاڵە. کەوایە قسە بەکارە و پڕ فایدە. دەنکی قەیسی ئەگەر تەنیا ناوکەکەی لە زەوی بچێنی، شتێک ناڕوێ. کە بە توێکڵەوە بیچێنی، دەڕوێ. کەوایە زانیمان رواڵەتیش بەکارە.

نوێژیش لە دەروون دایە، بەڵام ناچار دەبێ بە رواڵەتیش دەریبڕی و رکووع و سوجدە بکەی بە نواندن، ئەوسا بەهرەی لێوەردەگری و بە ئامانج دەگەی.

نوێژی ڕواڵەت کاتییە، دایم نیە. چونکە رووح عالەمی دەریایە، ئەو نەهایەتی نیە. لەش بەستێن و ویشکاییە ـ تەنگەبەرە و دیاریکراو. کەوایە نوێژی دایم بەس بۆ رووحە. کەوایە رووح رکووع و سوجدەی هەیە، بەڵام بە ڕواڵەت. ئەو رکووع و سوجدەیە دەبێ دەربڕی چونکە مانای پێوەندیی بە ڕواڵەتەوە هەیە، هەتا هەردووک پێکەوە نەبن فایدەی نادەن.

ئەمە کە دەڵێی « ڕواڵەت فەرعی مانایە » و « ڕواڵەت رەعیەتە و دڵ پادشا » ئاخر ئەو ناوانە زیاد کراون. چۆن دەڵێی ئەمە فەرعی ئەوە؟ هەتا فەرع نەبێ، ناوی «ئەسڵ» کوا دەردەکەوێ؟ کەوایە ئەو ئەسڵی ئەم فەرعەیە و ئەگەر فەرع نەبا، ئەو خۆی ناوی نەدەبوو. کە دەڵێی ژن، ناچار پیاو پێویستە و کە دەڵێی رەب، ناچار بەندە پێویستە و کە دەڵێی حاکم، مەحکومێک پێویستە.

# شەڕی یەکەم دەگەڵ خۆ بکە!

« ناوی ئەو لاوە چیە؟ »

« سەیفەددین! »

فەرمووی « سەیف هەتا دە کالان دایە: ناکرێ ببینی چ سەیفێکە. سەیفەددین ئەوەیە کە بۆ دین شەڕ بکا و هەوڵی ئەو بە تەواوەتی بۆ هەق بێ و خێر لە خەتا بدۆزێتەوە و هەق لە باتڵ جیا بکاتەوە. ئیللا شەڕی یەکەم دەگەڵ خۆی بکا و ئەخلاقی خۆی خاوێن بکاتەوە. لە خۆیەوە دەست پێبکا و هەموو نەسیحەتان بە خۆی بڵێ ـ چونکە « ئاخر، تۆش بەشەری، دەست و پێت هەیە و گوێ و هۆش و چاو و زار. ئەنبیا و ئەولیاش کە دەوڵەتیان دەست کەوت و بە ئامانج گەیشتن، ئەوانیش بەشەر بوون و وەک من، گوێ و ئەقڵ و زمان و دەست و پێیان هەبوو. چ مانایەکی هەیە کە ئەوان ڕێ بدەن و دەرگا بکەنەوە بەڵام بۆ من نا؟ گوێی خۆی بابدا و شەو و ڕۆژ شەڕ دەگەڵ خۆی بکا کە « تۆ چت کردوە و لە تۆوە چ شتێک رووی داوە کە قەبووڵ ناکرێی؟ » هەتا ببێتە سەیفوڵڵا و زمانی هەق.

بۆ وێنە، دە کەس دەیانەوێ بچنە نێوماڵێکەوە. نۆ کەس ڕێ دەدەن و کەسێک لە دەرێ دەمێنێتەوە و ڕێی نادەن. بێشک ئەو کەسە لای خۆی بیر دەکاتەوە و دەناڵێنێ کە « سەیرە! من چم کردوە کە ڕێیان نەدامە ژوور؟ چ بێ ئەدەبییەکم کردوە؟ » دەبێ کە تاوان بخاتە سەر خۆی و خۆی بە تاوانبار و بێ ئەدەب بزانێ، نەک ئەوە کە بڵێ « ئەوە هەق دەگەڵم دەیکا، من چ بکەم؟ ویستی ئەو وەهایە، ئەگەر ویستبای ڕێی دەدام » ـ ئەم کینایەتە جوێن دانە بە هەق و شیر وەشاندن لە هەق. کەوایە، بەم مانایە « سیف علی الحق ـ ە » نەک « سیف الله ».

هەقتەعالا بێبەرییە لە خزم و کەس و کار. هیچکەس ڕێی دەو نەکەوت، ئیللا بە بەندایەتی نەبێ. مومکین نیە کە بڵێی ئەو کەسەی کە ڕێی دە هەق کەوت، لە من خزمتر و ناسیاوتر و هی ئەوتر بوو لە من. کەوایە نزیکایەتی ئەو ناگونجێ، ئیللا بە بەندایەتی نەبێ. ئەو « معطی علی الاطلاق ـ ە »، داوێنی دەریای پڕ لە گەوهەر کرد و دڕکی بە جلی گوڵ داپۆشی و رووح و حەیاتی بەخشی بە مشتێک خاک، بێ غەرز و پێشینەیەک و تەواوی بەشەکانی عالەم بەهرەیان لێبرد.

کەسێک کە ببیسێ لە فلانە شار کەریمێک هەیە کە لە رادەبەدەر دەبەخشێتەوە و خێر دەبەشێتەوە، بەو هیوایە بۆ وێ دەچێ کە بەهرەی لێوەرگرێ. کەوایە چونکە خەلاتی هەق وەها ناوبانگی دەرکردوە و هەموو عالەم ئاگاداری لەتفی ئەون، بۆچ گەدایی لێنەکەی و تەماحی خەلات و بەخشینەوەت لێینەبێ؟ تەوەزەلانە دابنیشی کە « ئەگەر ئەو دەیەوێ، با خۆی بمداتێ! » و هیچ داوا نەکەی. سەگ کە ئەقڵ و هزری نیە، کاتێک برسی بێ و نانی نەبێ، دێتە لای تۆ و کلکی دەجوولێنێتەوە ـ یانی « نانم دەیە! ـ کە من نانم نیە و تۆ هەتە. » ئەوەندە دەزانێ. ئاخر تۆ لە سەگ کەمتر نی ـ کە ئەو بەوە رازی نابێ کە لە سەر خۆڵەمێش وەربکەوێ و بڵێ کە « ئەگەر دەیەوێ، خۆی نانم بداتێ. » دەلاڵێتەوە و کلک دەجوولێنێتەوە. تۆش کلکت بجوولێنەوە و لە هەق بخوازە و گەدایی لێبکە! ـ کە لای وەها بەخشێنەرێک گەدایی کردن گەلێک مەتلووبە. کە بەختت نیە، لە کەسێک بەخت بخوازە کە خاوەنی بەختە و خاوەنی دەوڵەت.

هەق گەلێک لە تۆ نزیکە. هەر بیر و فکرێکی دەکەیەوە، ئاو ئاگادارە ـ چونکە ئەو بیر و خەیاڵە ئەوە کە بوونی دەداتێ و لە بەرابەر تۆی رادەگرێ. ئیللا لە بەر نزیکی زۆر، ناتوانی ببینی. بۆ سەیرە! ـ هەر کارێکی کە دەکەی، ئەقڵی تۆ دەگەڵ تۆیە و لەو کارە دا دەستی هەیە و هیچ ئەقڵ نابینی. هەرچەند بە شوێنەوار دەیبینی، ئیللا زاتەکەی ناکرێ ببینی. بۆ وێنە کەسێک دەچێتە حەمام، گەرم دادێ، دەچێتە هەر لایەکی حەمام، ئاگری دەگەڵە و لەبەر تینی ئاگر گەرمای دەبێ، بەڵام ئاگر نابینێ. کاتێک بێتە دەر و بچێتە توونخانە ئاگر بە ئاشکرا دەبینێ و دەزانێ کە بە ئاگر گەرم داهاتوە، دەزانێ کە تینی حەمامیش لە ئاگرەوە بوە. وجوودی بەشەریش حەمامێکی سەمەرەیە، لەو دا تینی ئەقڵ و رووح و نەفس، هەمووی هەیە. ئیللا کاتێک لە حەمامی وجوود بێیە دەر و روو دەو دونیا بکەی، بە ئاشکرا زاتی ئەقڵ ببینی و چاوت بە زاتی نەفس و زاتیی رووح بکەوێ، تێدەگەی کە ئەو زیرەکیی و تێگەیشتنە لەبەر تینی ئەقڵ بوە ـ بە ئاشکرا و ئەو مەکر و فرِ و فێڵە لە نەفسەوە بوە و حەیات بە هۆی رووحەوە بوە. ـ بە ئاشکرا زاتی هەرکامیان دەبینی. بەڵام مادام لە حەمام دای، ئاگر ناکرێ بە چاو ببینی، ئیللا بە شوێن داخستنی دەبیندرێ. وەها کە کەسێک قەت ئاوی رەوانی نەدیوە، ئەو بە چاوی بەستراو دە ئاو باوێن، شتێکی تەرِ و نەرم لە لەشی بدا، بەڵام نەزانێ کە چیە. کە چاوی بکەنەوە، بە ئاشکرا دەزانێ کە ئاو بوە. لە پێشدا بە شوێن داخستنی دەیزانی، ئێستا زاتی دەبینێ.

کەوایە گەدایی لە هەق بکە و حاجەتی لێبخوازە ـ کە هیچ زایە نابێ.

لە سەمەرقەند بووین. خارەزمشا، سەمەرقەندی گەمارۆ دابوو و لەشکری کێشابوو، شەڕی دەکرد. لەو گەڕەکە، کچێکی لێبوو گەلێک خاوەن جەمال، وەها کە لەو شارە دا هاوتای نەبوو. هەردەم، دەمبیست کە دەیگوت « خودایا، کەی ڕەوایە کە من بدەیە دەست زاڵمان؟ دەزانم کە قەت بە ڕەوای نابینی و باوەڕت پێدەکەم. »

کاتێک شاریان تالان کرد و هەموو کەسیان بە دیل دەبرد و کەنیزەکانی ئەو ژنەیان بە دیل دەبرد، ئەو هیچ ئازارێکی پێنەگەیشت و سەرەڕای ئەو هەموو جوانییە، کەس چاوی لەو نەدەکرد.

هەتا بزانی کە هەرکەس خۆی بە هەق بسپێرێ، لە بەڵا بە دوور دەبێ و سلامەت دەمێنێتەوە و حاجەتی هیچکەس لە حەزرەتی ئەو دا زایە نەبوە.

دەروێشێک منداڵی خۆی فێر کردبوو کە هەرچی دەویست، باوکی دەیگوت کە «لە خودات بوێ! » چونکە دەگریا و داوای ئەو شتەی لە خودا دەکرد، ئەودەم شتەکەی بۆ حازر دەکرد.

هەتا بەمجۆرە گەلێک ساڵ تێپەڕی. ڕۆژێک منداڵ بە تەنێ لە ماڵ بوو، ئیشتیای حەلیمی کرد، وەک عادەتی پێشوو گوتی « ئیشتیام لە حەلیمە! »

لە نەکاو، قاپێک حەلیم لە غەیبەوە حازر بوو. منداڵ تێر خواردی.

کاتێک دایک و باوک هاتنەوە گوتیان « چت ناوێ؟ »

گوتی « ئاخر، داوای حەلیمم کرد و خواردم. »

باوکی گوتی « ئەلحەملای کە بەم پلەیە گەیشتی و باوەڕ و بڕوات بە هەق قەوەتی گرت. »

دایکی مریەم کاتێک مریەمی زاند، نەزری کردبوو دەگەڵ خودا کە ئەو وەقفی ماڵی خودا بکا و هیچ کارێکی دیکەی پێنەکا. لە گۆشەیەکی مزگەوتی دانا. زەکەریا دەیەویست پێیڕابگا و ئەوانی دیکەش دەیانەویست. کێشە لە نێوانیان دا پەیدا بوو.

ئەو سەردەمە، عادەت وەها بوو کە هەرکەس دارێک دە ئاو باوێن، داری هەرکەس لە سەر ئاو بمێنێتەوە، ئەو شتە هی ئەو دەبێ. بە هەڵکەوت فاڵی زەکەریا راست دەرچوو. گوتیان « هەقی خۆیەتی. »

زەکەریا هەمووی رۆژێ تەعامێکی بۆ دەبرد. لە گۆشەی مزگەوت لە جنسی ئەو تەعامەی چاو پێدەکەوت. گوتی « ئەی مریەم، ئاخر، وەسی تۆ منم. ئەوەی لە کوێی دێنی؟ »

گوتی « کاتێک موحتاجی تەعام بم هەرچی بخوازم، هەقتەعالا دەینێرێ. »

کەرەم و رەحمەتی ئەو بێنەهایەتە و هەرکەس بڕوای پێکرد، هیچ زایە نەبوو.

زەکەریا گوتی « خودایا، لەبەر ئەوە کە حاجەتی هەمووکەس پێکدێنی، منیش ئارەزوویەکم هەیە، وەدی بێنە و منداڵێکم بدەیە کە دۆستی تۆ بێ و بێ هاندانی من نزیکایەتی دەگەڵت هەبێ و خەریکی تاعەتی تۆ بێ! »

هەقتەعالا یەحیای هێنا وجوود ـ سەرەڕای ئەوە کە باوکی پشتی چەما بوو و زەعیف ببوو و دایکی کە بە جحێڵی نەدەزا و گەلێک پیر بوو، چوو دە حەیزەوە و زگی پڕ بوو.

هەتا بزانی کە هەمووی ئەوانە، لای دەستەڵاتی هەق، بیانوویە و هەموو لەوەوەیە و حاکمی موتڵەق لە شتەکان دا ئەوە.

ئیماندار کەسێکە کە بزانێ لە پشت ئەم دیوارە کەسێکە کە یەکبەیەک ئاگاداری حاڵی ئێمەیە و دەیبینێ ـ هەرچەند ئێمە ئەو نابینین ـ و ئەمەی لێ یەقینە. بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە دەڵێ « نا ـ ئەوانە هەمووی حەکایەتن. » و باوەڕ ناکا. رۆژێک دابێ کە چون گوێچکەی بابدەن، پەشیمان بێتەوە و بڵێ « ئاخ، خراپم گوت و خەتام کرد! کەچی هەمووی هەر ئەو بوو. من ئەوم رەد دەکردەوە. »

بۆ وێنە تۆ دەزانی من لە پشت دیوارم و رەباب لێدەدەی. بێشک راناوەستی و دەیژەنی ـ چونکە رەبابژەنی.

ئەم نوێژەش، ئاخر، بۆ ئەوە نیە کە هەموو رۆژێ هەستیەوە و رکووع و سوجدەی بکەی، ئیللا غەرز لەمە ئەوەیە کە دەبێ ئەو حاڵەتەی کە لە نوێژ دەردەکەوێ، هەمیشە دەگەڵ تۆ بێ: ئەگەر لە خەو دابی و ئەگەر بەخەبەر بی و ئەگەر بنووسی و ئەگەر

بخـوێنیـەوە، لە هەمـوو حـاڵێک دا، خـاڵی نەبی لە یادی هەق. کـەوایە ئەو گـوتن و خامۆشیی و خواردن و خەوتن و تووڕەیی و عەفو و هـەموو حاڵەکان، گەڕانی ئاشە کـە دەگـەڕێ. بێـشک ئەو گـەڕانەی ئەو لەبەر ئـاوە، چونکە خـۆی بێ ئاویش بـە تاقی کـردۆتەوە. کـەوایە ئەگـەر ئاش ئـەو گـەڕانـە لە خـۆوە ببـینێ، عـەینی جـەهل و بێخەبەرییە. کەوایە ئەو گەڕانە مەیدانی تەنگە، چونکە ئەحواڵی ئەو عالەمەیە. بە هەق بناڵە کە « خودایە، جگە لەو خول و گەڕەم، گەڕێکی دیکەی ـ رووحانییم ـ بدەیە! چونکە هەمـوو حـاجـەتێک لای تۆ حـاسڵ دەبێ و کـەرەم و رەحـمـەتی تۆ لە سـەر جەمیعی بوونەوەران عامە. »

کەوایە حاجەتەکانی خۆت دەمبەدەم باس بکە و بێ یادی ئەو مەبە ـ کە یادی ئەو قـەوەت و پەڕ و باڵ دەدا بە مـەلی رووح. ئەگەر ئەو ئاواتە کوللیـە حاسڵ بوو، نووری عەلا نوورە. بە هەر حاڵ، بە یاد کردنی هەق، کەم کەم دەروون رووناک دەبێ و تۆ لە عـالەم دەبڕێیـەوە. بۆ وێنە هەر ئەوجـۆرەی کـە مـەلێک بیـەوێ بۆ ئاسـمـان بفـڕێ، هەرچەند ناگاتە ئاسمان، بەڵام دەمبەدەم لە زەوی دوور دەکەوێتەوە و لە مەلەکانی دیکە سـەرتر دەکەوێ. یا بۆ وێنە هۆقـقـەیەک مـیسکی تێدابێ و زارکی تـەنگ بێ. دەستی تێدەنێی، ناتوانی میسکی لێدەربێنی، ئیللا کە دەست بۆنخۆش دەبێ و لوتت پێیخۆش دەبێ. کەوایە یادی هەقیش وەهایە: هەرچەند بە زاتی ناگەی، بەڵام یادی لە سەر تۆ شوێن دادەخا و گەلێک فایدە لە زیکری ئەو پێکدێ.

# ئەقڵ ئەوەیە هەمیشە بێقەرار و نائارام بێ!

گوتمان بە مەولانا « فلانی ئارەزووی کردوە کە ئێوە ببینێ و دەیگوت کە دەمەوێ خوداوەندگار ببینم. »

خوداوەندگار فەرمووی کە « خوداوەندگار ئەم ساعەتە نابینێ بە هەقیقەت. چونکە ئەوەی کە ئەو ئارەزووی دەکا کە « خوداوەندگار ببینم » ئەوە دەمامکی خوداوەندگار بوو. خوداوەندگار ئەم ساعەتە، بێ دەمامک نابینێ.

هەروەتر، گشت ئارەزووکان و خوشەویستییەکان و مەحەببەتەکان و بەزەییەکان کە خەڵک هەیانە، بە باوک و دایک و دۆستان و ئاسمانەکان و زەوییەکان و باغەکان و هەیوانەکان و عیلمەکان و عەمەلەکان و تەعامەکان و شەرابەکان، هەموو ئارەزووی هەقیان هەیە و ئەو شتانە هەمووی دەمامکن. کاتێک لەم عالەمە تێپەڕن و ئەو شایە بێ ئەم دەمامکانە ببینن، تێدەگەن ئەوانە هەموو دەمامک و رووپۆش بوون، مەتلووبەکەیان لە راستی دا ئەو یەک شتە بوە: هەموو گیر و گرفتەکانیان چارەسەر دەکرێ و هەموو پرسیار و موشکلێک کە دە دڵیان دابوو وڵامی دەبیسن و هەموو ئاشکرا دەبن. وڵامی هەقیش وەها نابێ کە هەر موشکلێک جیا جیا وڵام داتەوە: بە وڵامێک، تەواوی پرسیارەکان بە جارێک دەردەکەوێ و موشکیل حەل دەبێ. وەها کە لە زستان دا، هەرکەس دە جل و دە کەوڵ و دە کورسی و دە ئەشکەوتێکی گەرم خزیبێن و پەنایان گرتبێ و هەروەتر، تەواوی درەخت و گیایەکان و غەیرە، لە ژاری سەرما بێ بەرگ و بەر بوون و جلەکانیان بردۆتە دەروون و شاردوویانەتەوە هەتا سەرما زیانیان پێنەگەیەنێ. کاتێک بەهار وڵامی ئەوان بە ئاشکرا بفەرموێ، تەواوی پرسیارە جۆراوجۆرەکانی ئەوان، لە ئەحیا و نەبات و مەوات، بە جارێک، حەل دەبێ و ئەو سەبەبانە لا دەچن و هەموو سەر دەردەکێشن و دەزانن کە هۆی ئەو بەڵایانە چ بوە.

هەقتەعالا ئەو دەمامکانەی بۆ مەسڵەحەت خوڵقاندوە ـ کە ئەگەر جەمالی هەق بێ دەمامک روو دەربخا، ئێمە تاقەت ناهێنین و بەهرەی لێوەرناگرین. بە هۆی ئەو دەمامکانە، یارمەتی و سوود وەردەگرین. ئەم هەتاوە دەبینی کە لەبەر شۆقی دەڕۆین و دەبینین و چاک و خراپ لێک دەکەینەوە و پێی گەرم دەبینەوە و درەختەکان و

باغەکان بەری پێدەگرن و میوەکانی کاڵ و ترش و تاڵ بە تینی ئەو دەگەن و شیرین دەبن، کانەکانی زێڕ و زێو و لەعل و یاقووت لەبەر شوێن داخستنی ئەو دەردەکەون؟ ئەگەر ئەم هەتاوە کە ئەوەندە قازانج دەگەیەنێ، نزیکتر بێتەوە هیچ قازانجی نابێ و بگرە هەمووەکەوێ، پڕ درەخت و پڕ گوڵ و شیناوەرد و رازاوەی دەکا و کاتێک بێ دەمامک خۆ دەربخا، سەر و ژێر و زەڕە زەڕەی دەکا.

پرسیارکەرێک پرسیاری کرد کە « ئاخر، لە زستانیش دا هەر ئەم هەتاوەیە؟ »

گوتی « غەرەزمان لێرە نموونە هێنانەوەیە. هاووێنە شتێکی دیکەیە و نموونە شتێکی دیکە. هەرچەند ئەقڵ بە راستی لەو شتە ناگا، بەڵام ئەقڵ کەی لە هەوڵ دان دەوەستێ؟ ئەگەر ئەقڵ دەست لە هەوڵ بەربدا، ئەوە ئەقڵ نیە. ئەقڵ ئەوەیە کە هەمیشە، شەو و رۆژ، بێقەرار و نائارام بێ بۆ فکر و هەوڵ و تێکۆشان لە تێگەیشتنی خودا ـ هەرچەند پەی پێنابەن و شیاوی تێگەیشتن نیە.

ئەقڵ هەروەک پەروانەیە و مەعشووق وەک شەم. هەرچەند پەروانە خۆی لە شەم بدا دەسووتێ و دەفەوتێ، بەڵام پەروانە ئەوەیە کە هەرچەند بسووتێ و ئازاری پێبگا، لە شەم ئارام نەگرێ. ئەگەر حەیوانێک هەبێ وەک پەروانە و لە شۆقی شەم ئارام بگرێ و خۆ بە شۆقی دانەدا، ئەوە پەروانە نیە. ئەگەر پەروانەش خۆ لە شۆقی شەم بدا و پەروانە نەسووتێ، ئەویش شەم نیە. کەوایە مرۆڤیش کە لە هەق ئارام بگرێ و هەوڵ نەدا، ئەو مرۆڤ نیە و ئەگەر بتوانێ لە هەقیش بگا، ئەویش هەق نیە. کەوایە مرۆڤ ئەوەیە کە بەتاڵ لە هەوڵ نیە و بە دەوری نووری هەق دا دەگەڕێ، بێ ئارام و بێقەرار، و هەقیش ئەوەیە کە مرۆڤ بسووتێنێ و بفەوتێنێ و هیچ ئەقڵێک پەی پێنەبا.

## ئاوێنە بێ نەقشە ـ
## نەقشێک لە ئاوێنە دەرکەوێ، نەقشی غەیرە!

ئەمیر پەروانە گوتی کە « مەولانا بەهائەددین وەلەد بەر لەوەی کە خوداوەندگار روو دەربخا، عوزری بەندەی دەخواست کە: مەولانا لەبەر ئەوە حوکمی کردوە کە ئەمیر نەیەتە زیارەتی من و دڵی نەیەشێ کە ئێمە حاڵەتی جۆراوجۆرمان هەیە. حاڵەتێک قسە دەکەم، حاڵەتێک نایکەم، حاڵەتێک خەمی خەڵک، حاڵەتێک گۆشەنشینی و خەڵوە، حاڵەتێک نوقم بوون و سەرسوڕمان. نەکا ئەمیر لە حاڵەتێک دا بێ کە نەتوانم دڵی بدەمەوە و دەرفەتم نەبێ کە دەگەڵی قسە بگۆڕمەوە و بدوێم. کەوایە وا باشترە ئێمە کە دەرفەتمان هەبوو و توانیمان بە دۆستان رابگەین و قازانجیان پێبگەیەنین، ئێمە بچین و دۆستان زیارەت بکەین. »

ئەمیر گوتی: مەولانا بەهائەددینم ولاّم داوە کە « من لەبەر ئەوە نایەم کە مەولانا بە من رابگا و بمدوێنێ، بەڵکە لەبەر ئەوە دێم کە سەربەرز بم و لە ریزی بەندەکان دابم. لەمانەی کە هەتا ئێستا روویان داوە، یەکیان ئەمەیە کە مەولانا سەرقاڵ بوو و رووی خۆی نەنواند و هەتا درەنگانێک لە چاوەڕوانی دا رایگرتم هەتا تێبگەم کە ئەگەر موسڵمانان و پیاوچاکان دێنە بەر دەرگای من، چاوەڕوانیان رادەگرم و زوو رێیان نادەم، وەها سەخت و دژوارە. مەولانا تاڵایی ئەوەی پێ چێژتم و منی ئەدەب کرد هەتا دەگەڵ هی دیکە وانەکەم. »

مەولانا فەرمووی « نا، بەڵکە ئەوەی کە من ئێوەم چاوەڕوان راگرت، عەینی عینایەت بوو.

دەگێڕنەوە کە هەقتەعالا دەفەرموێ کە « ئەی بەندەی من، حاجەتی تۆم لە حاڵەتی دوعا و ناڵە دا زوو وەدیدێنا، بەلاّم دەنگی ناڵەی تۆم پێخۆشە. لەبەر ئەوە وەدی هاتنی وە درەنگی دەکەوێ هەتا زۆر بناڵی ـ چونکە دەنگ و ناڵەی تۆم پێخۆشە. »

بۆ وێنە، دوو گەدا هاتنە بەر دەرگای کەسێک: یەکیان خۆشەویست و لە سەر دڵان، ئەوی دیکە گەلێک رەزاگران. خاوەنماڵ بە غولاّمەکان دەڵێ کە « زوو، دەستبەجێ، پەنجەیەک نان بدەن بەو رەزاگرانە هەتا لەبەر دەرگای ئێمە ئاوارە بێ!» و ئەوی دیکە کە خۆشەویستە وەعدەی دەداتێ کە « هێشتا چێشت پێنەگەیوە، سەبر

بگره هەتا بگا و بکوڵێ. »

زۆرم پێخۆشە دۆستان ببینم و تێرتێر چاویان لێکەم و ئەوانیش لە من. چونکە ئەگەر لێرە دۆستانی خاوەن گەوهەر یەکتریان باش باش دیتبێ، لەو عالەم کە حەشر بکرێن، ناسیاوییان پتەوتر دەبێ و یەکتر زوو دەناسنەوە و دەزانن کە ئێمە لە داری دونیا پێکەوەبووین و پێک خۆش دەبنەوە. چونکە مرۆڤ یاری خۆی زوو بزر دەکا. نابینی لەم عالەمە دا کە دەگەڵ کەسێک بوویە دۆست و گیانی گیانی و لای تۆ یۆسفێکە، بە کردەوەیەکی ناحەز لەبەر چاوت دەکەوێ و ئەو بزر دەکەی و روخساری یۆسفی دەبێتە گورگ؟ هەر ئەوەی کە بە یۆسفت دەدیت، نووکە وەک گورگی دەبینی. هەرچەند کە روخساری نەگۆڕاوە و هەر ئەوەیە کە دەدیت، بەم ئاکارە دەرخراوەی بزرت کرد. سبەی کە حەشری دیکە سەرهەڵبدا و ئەم زاتە ببێتە زاتێکی دیکە، ئەگەر ئەوت باش نەناسیبێ و باش باش نەچووبیە نێو زاتی ئەوەوە، چلۆن دەتوانی بیناسییەوە؟

ئاکام: دەبێ یەکتر باش باش ببینن، لەو سفەتە چاک و خراپانەی کە دە هەر مرۆڤێک دا رۆنراوە، تێپەڕن و بچنە نێو زاتی ئەوەوە و باش باش بیبینن ـ چونکە ئەو سفەتانەی کە خەڵک لە یەکتری هەڵدەدەن، سفەتەکانی ئەسڵی ئەوان نین.

حەکایەتێکیان گێڕاوە. کەسێک گوتی کە « من فلانە پیاوەی باش دەناسم، نیشانەکانی هەڵدەم؟ »

گوتیان « فەرمووو! »

گوتی « کەرداری من بوو، دوو گای رەشی هەبوو! »

نووکە، ئێستاش، بەم پێودانەیە. خەڵک دەڵێن کە « فلانە دۆستمان دیت و دەیناسین. » و هەر نیشانەیەک کە دەیدەن وەهایە کە حەکایەتی دوو گای رەشی دابێ. ئەوە نیشانەی ئەو نیە و ئەو نیشانە بە کەلکی هیچ نایە. نووکە، دەبێ لە چاکە و خراپەی مرۆڤ تێپەڕن و لە زاتی ئەو رۆبچن کە چ زات و چ گەوهەرێکی هەیە ـ چونکە ئەوەیە دیتن و ناسین.

خەڵکم لا سەیرە کە دەڵێن « ئەولیا و ئاشقانی عالەمی لامەکان ـ کە جێگایەکیان نیە و دیمەنێکیان نیە و بێ وێنە و چلۆنایەتیین ـ چلۆن ئەشقبازیی دەکەن و یارمەتی و هێزی لێوەردەگرن و شوێنیان لە سەر دادەخا؟ »

ئاخر شەووڕۆژ بەوەوە خەریکن. ئەو کەسەی کە کەسێکی خۆش دەوێ یارمەتی لێوەردەگرێ. ئاخر ئەو یارمەتییە لە لوتف و بەخشین و زانست و زیکر و فیکر و شادیی و خەمی ئەو وەردەگرێ و هەموو ئەوانە هی عالەمی لامەکانن و ئەو پەیتاپەیتا لەم مانایانە یارمەتی وەردەگرێ و شوێنی لە سەر دادەخا و پێی سەیر نیە، بەڵام پێی سەیرە کە چۆن ئاشقی عالەمی لامەکان دەبن و یارمەتی لێوەردەگرن.

حەکیمێک مونکیری ئەو مانایە بوو. رۆژێک ئازاری گرت و کەوت و ئازارەکەی زۆری کێشا. حەکیمێکی ئیلاهی چوە زیارەتی. گوتی « ئاخر، چ دەخوازی؟ »

گوتی « سلامەتی! »

گوتی « سیمای ئەم سلامەتییە بڵێ بزانم چۆنە، هەتا بتدەمێ! »

گوتی « سلامەتی سیمای نیە و بێ وێنەیە. »

گوتی « نووکە، ئەگەر سلامەتی بێ وێنەیە، چۆنی داوا دەکەی؟ ئاخر، بڵێ کە سلامەتی چیە؟ »

گوتی « ئەوە دەزانم کە کاتێک سلامەتی بێ، هێزم دێتەوە بەر و قەڵەو دەبم و سوور و سپی هەڵدەگەڕێم و تازە دەبمەوە و دەپشکوێم. »

گوتی « من لە نەفسی سلامەتی دەپرسم، زاتی سلامەتی چیە؟ »

گوتی « نازانم، بێ وێنەیە. »

گوتی « ئەگەر ببیە موسڵمان و لە مەزهەبی یەکەم وەرگەڕێی، چارەت دەکەم و ساغت دەکەمەوە و سلامەتییت دەدەمەوە! »

لە مستەفایان پرسی کە « سەرەڕای ئەوە کە ئەم مانایانە بێ وێنەن، بەڵام بە هۆی سیما دەکرێ لەو مانایانە فایدە وەرگرین؟ »

فەرمووی « ئەوەش سیمای ئاسمان و زەوی! بە هۆی ئەم سیمایە، فایدەی وەربگرە لەو مانا کوللییە! »

کە گەشتی چەرخی فەلەک و بارینی هەورەکان لە کاتی خۆی دا و هاوین و زستان و ئاڵوگۆڕی ڕۆژگار دەبینی، هەمووی بە پێی سەواب و حیکمەت؟ ئاخر، ئەو هەورە جەمادە چ دەزانێ کە دەبێ بە وەختی خۆی بباریێ؟ و ئەم زەوییە دەبینی چلۆن دانێک وە خۆ دەگرێ و دە هێندی دەداتەوە؟ ئاخر، ئەوە کەسێک دەیکا. ئەو ببینە بە هۆی ئەم عالەمە و یارمەتی لێوەرگرە! هەر ئەوجۆرەی کە لە قالبی مرۆڤ یارمەتی وەردەگری، لە مانای مرۆڤ، لە مانای عالەم، یارمەتی وەربگرە، بە هۆی رواڵەتی عالەم!

کە پێغەمبەر مەست دەبوو و لە خۆوە قسەی دەکرد، دەیگوت « قال الله! » ئاخر، لە روانگەی رواڵەتی زمـــانەوە دەیگوت ئەو، بەڵام ئەو دە ئارا دا نەبوو. وێژەر لە راستی دا، هەق بوو. چونکە ئەو یەکەمی خۆی دیتبوو کە چەندە قســەنەزان و بێخەبەر بوو، نووکە وەها قسەیەکی لێدەزێ، دەزانێ کە هەر ئەوەی یەکەم نیە، ئەوە دەستەڵاتی هەقە. وەها کە مستەفا خەبەری لە پێشووی خۆی دەدا، چەندین هەزار ساڵ، لە ئادەم و ئەنبیای رابوردوو هەتا ئاخری چاخی عالەم کە چ دەبێ و عەرش و کورسی و خــەلەء و مــەلەء. وجــوودی ئەو هی دوێنێ بوو. بێــشک ئەم خــەبەرانە، وجوودی دوێنێی سازکراوی ئەو نەیدەگوت. سازکراو چۆن خەبەر لە قەدیم دەدا؟ کەوایە دەرکەوت کە ئەو نەیدەگوت، هەق دەیگوت.

هەق لە دەنگ و قسە بێبەرییە. قسەی ئەو لە دەرەوەی وشە و دەنگە. بەڵام قسەی خۆی لە هەر دەنگ و وشەیەک و لە هەر زمانێک کە بیەوێ، هەڵیدەڕێژێ. لە ڕێگاکان کاروانسەرایان ساز کردوە، لە سەر حەوزەکان پیاوی بەردین یا مەلی بەردینیان دامەزراندوە کە ئاو لە زاریان دێتە دەر و دەڕژێتە حەوزەوە، هەر ئاقڵێک دەزانێ کە ئاو لە زاری مەلی بەردین نایەتە دەر، لە شوێنێکی دیکەوەیە.

کە دەتەوێ کەسێک بناسی، وە قسەی بێنە! لە قسەی ئەو، ئەو دەناسی بەڵام ئەگەر ڕێگر بێ و کەسێک پێیگوتبێ کە « پیاو لە قسەوە دەناسن » ئەو قسەکەی رادەگرێ، هەتا نەیناسنەوە.

هەروەک ئەو رووداوەی کە منداڵ لە سارا بە دایکی گوت کە « لە شەوی تار دا

ڕەشاییەکی بەسام، وەک دێو ڕوو دەردەخا و زەندەقم دەچێ. »

دایک گوتی کە « مەترسە! کە ئەو سیمایەت دیت، بە جەرگەوە شاڵاوی بۆ بەرە! بۆت دەردەکەوێ کە خەیاڵە. »

گوتی « دایە! ئیدی ئەگەر ئەو ڕەشاییەش دایکی وەهای پێگوتبێ، من چ بکەم؟ »

نووکە، ئەگەر بەویان گوتبێ کە « قسە مەکە، هەتا دەرنەکەوی » من چۆن بیناسمەوە؟

گوتی « لە حوزووری ئەو دا بێدەنگ بە و خۆتی پێ بسپێرە و سەبر بگرە! لەوانەیە وشەیەک لە زاری دەرپەڕێ و ئەگەریش نەهاتە دەر، لەوانەیە لە زمانی تۆوە دەرپەڕێ بەبێ ویستی تۆ، یا لە مێشکی تۆ دا قسە و بیرێک دەرکەوێ، لەو بیر و قسەیەیە پەی بە حاڵی ئەو بەری. چونکە ئەو شوێنی لە سەر تۆ داناوە و ئەمەش وێنەکەی ئەوە، ئەحواڵی ئەوە کە لە دەروون تۆ دا پەیدا بوە. »

شێخ مەحەممەدی سەررەزی لە نێوان مریدەکانی دانیشتبوو. مریدێک ئیشتیای بریانی کردبوو. شێخ ئیشارەی دا کە « بریانی دەوێ، بۆی بێنن! »

گوتیان « شێخ، چۆنت زانی کە ئەو بریانی دەوێ؟ »

گوتی « چونکە سی ساڵە کە من ویستێکم نەبوە و خۆم لە هەموو ویستێک خاوێن کردۆتەوە و پاکم، هەروەک ئاوێنەیەکی بێ نەقش، ساف و سادەم. کاتێک بریانی هاتە نێو بیری منەوە و ئیشتیام کرد و لێم پێویست کرا، زانیم کە ئەوە هی فلان کەسەیە. »

چونکە ئاوێنە بێ نەقشە. ئەگەر نەقشێک لە ئاوێنە دەرکەوێ، نەقشی غەیرە.

عەزیزێک چلەنشین بوو بۆ داوای مەبەستێک. دەنگی غەیبی هات کە « وەها مەبەستێکی بەرز بە چلە پێکنایە. لە چلە دەرکەوە، هەتا نەزەری گەورەپیاوێک وە تۆ کەوێ، ئەو مەبەستەت پێکدێ! »

گوتی « ئەو گەورەیە لە کوێ بدۆزمەوە؟ »

گوتیان « لە مزگەوتی جامعە! »

گوتی « له نێو ئەو هەموو خەڵکە، ئەو چۆن بناسمەوە کە کامەیانە؟ »

گوتیان « برۆ ئاو بگێڕە! ئەو تۆ دەناسێتەوە و نەزەرت لێدەکا. نیشانەش ئەوە بێ کە هەر چاوی بە تۆ بکەوێ گۆزەت لە دەست بەربێـەوە و بێـهۆش بی، بزانـە کـە ئەو نەزەری لێکردووی. »

وەهای کرد. گۆزەی پڕ لە ئاو کرد و بوو بە ئاوگێڕی جەماعەتی مزگەوت و بە نێو ریزەکـان دا دەگـەڕا. لەپڕ، حـاڵەتێکی تێدا پێکهـات، نەعـرەتەیەکی لێـدا و گـۆزە لە دەستی کەوت و بێهۆش لە گۆشەیەک مایەوە.

خـەڵک، هـەمـوو رۆیشتن. کە وەخـۆ هاتەوە، خـۆی بە تەنیـا دیتـەوە. ئەو شـایە کـە نەزەری لێکردبوو لەوێی نەدیت، بەڵام بە مەبەستی خۆی گەیشتبوو.

خـودا پیـاوی وەهـای هـەن کـە لەبەر رادەی گـەورەیی و غـەیرەت، روو لە هـەندێک دەرناخـەن. بەڵام داواکاران دەگەیەنێتـە مـەبەسـتی پڕلەمـەترسی و خەڵاتیان دەکەن. وەها پادشاگەلێک، گەلێک نادرن و نازەنین.

گوتمان « گەورەکان وەها دێنە لات؟ »

گوتی « ئێمە لامان نەماوە. درەنگ ماوەیەکە کە ئێمە لامان نیە. ئەگەر دێن بۆ لای ئەو نەقشکراوە دێن کە بڕوایان پێهێناوە. »

بە عیسایان گوت « دێینە ماڵە تۆ. »

گوتی « ئێمە لە عالەم دا، ماڵمان لە کوێ بوە و کەی هەمانبوە! »

دەگێڕنەوە کـە عیسـا لـە سارایەک دەگەڕا. بارانێکی قورس دایدایە. چوو لە لانەی گـوێرەش، لە کـونجی ئەشـکەوتێک پەنای گرت هـەتا باران لێیکاتەوە. وەحی هات کـە «لە لانی گوێرەش دەرکەوە! ـ کە بێچووکانی ئەو لەبەر تۆ حەسانەوەیان نیە. »

وڵامی داوە کـە « یارەب! بێـچـووی گـوێرەش پەنای هـەیە و جـێگای هـەیە بەڵام منداڵی مریەم نە پەنای هەیە و نە جێگا و نەماڵ و نە پلە؟ »

خودا فـەرمووی « ئەگەر بێچووی گوێرەش مـاڵی هـەیە، بەڵام وەها خۆشـەویسـتێک کـە تۆ لە مـاڵەکـەی دەر دەکـا نیـەتـی. تۆ وەها دەرکـەرێکت هـەیە، ئەگـەر مـاڵت نیـە نەغەمە؟ ـ کە لوتفی وەها دەرکەرێک و لوتفی ئەم خەڵاتە کە تەنیا لە تۆ تایبەت کراوە

کە دەرت دەکا و بەرەو خۆی بانگت دەکا و لامەکان دەکاتە مەکانی تۆ، سەدهەزار هەزار ئاسمان و زەوی و دونیا و ئاخرەت و عەرش و کورسی دێنێ.

فەرمووی « ئەوە کە ئەمیر هات و ئێمە زوو رووومان نەنواند، نابێ کە دڵی بێشێ. چونکە مەبەستی ئەو لەو هاتنە رێزنان لە نەفسی ئێمە بوو یا رێز لێنان لە خۆی: ئەگەر بۆ رێز لێنان لە ئێمە بوو، کە پتر دانیشت و چاوەڕوان ماوە، رێزی ئێمە چوو سەرتر و ئەگەر غەرەزی رێزی خۆی بوو و داواکاری خێر، کە پتر دانیشت و ئازاری چاوەڕوانیی چێژت، خێری پتر دەبێ. کەوایە لەبەر لەبەر هەر مەبەستێک هاتبێ، ئەو مەبەستە دووهەند و پتر بوو. کەوایە دەبێ دڵخۆش و شاد بێ. »

## غەوواسی گەرەکە هەتا
## گەوهەر دەرکەوێ!

گوتی « ئێمە تەواوی ئەحواڵی مرۆڤمان یەک بە یەک زانی و سەرەمووییەک لە مەزاج و تەبیعەت و ساردیی و گەرمیی ئەومان لێ شاراوە نیە، کەچی تێنەگەیشتم ئەوەی کە دەو دا دەمێنێتەوە، ئەو چیە؟ »

فەرمووی « ئەگەر زانین هەر بە قسە پێکهاتبا خۆ پێویستی بەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانە نەدەبوو و کەس خۆی ئەزیەت نەدەدا و خۆی فەدا نەدەکرد.

« بۆ وێنە کەسێک هاتە سەر بەحر. جگە لە ئاوی سوێر و نەهەنگ و ماسی چ نابینێ. دەڵێ « ئەم گەوهەرە لە کوێیە؟ مەگەر گەوهەر هەر نەبێ. »

« گەوهەر هەر بە دیتنی بەحر، کەی دەست دەکەوێ، نووکە، ئەگەر سەدهەزار جار ئاوی دەریا جام جام هەڵنجێ، گەهەر نادۆزێتەوە. غەوواسی گەرەکە هەتا گەوهەر دەرکێشێ، ئەویش نە هەر غەوواسێک: غەوواسی بەختەوەریی، چالاکیی!

« ئەم زانست و هونەرانە هەروەک هەڵنجانی ئاوی دەریایە بە جام. رێگای دۆزینەوەی گەوهەر چەشنی دیکەیە. گەلێک کەس هەن رازاوە بە گشت هونەرەکان و خاوەنی ماڵ و خاوەنی جەماڵ، ئیللا دەو دا ئەو مانایە نیە. هەروەتر گەلێک کەس هەن کە رواڵەتیان کرێتە، جوانیی روخسار و زمانوێژیی و رەوانبێژییان نیە، ئیللا ئەو مانایە دەمێنێتەوە کە دەوان دا هەیە. ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ پێی موشەررەف و موکەررەم کراوە و بە هۆی ئەوەوە سەرووترە لە تەواوی گیانلەبەرەکان. پڵینگ و نەهەنگ و شێر و گیانلەبەرانی دیکە هونەر و خاسیەتیان زۆرە، ئیللا ئەو مانایە کە دەمێنێتەوە، دەوان دا نیە. ئەگەر مرۆڤ پەی بەو مانایە بەرێ، خۆی پلەبەرزیی خۆی پێکدێنێ، دەنا لەو پلەبەرزییە چی دەست ناکەوێ.

« تەواوی ئەم هونەر و جوانییانە وەک پێوەنانی گەوهەر بە پشت ئاوێنەوەن. رووی ئاوێنە لێی بێبەرییە. رووی ئاوێنە سەفای دەوێ. ئەوەی کە رووی ناحەزی هەیە، تەماح لە پشتی ئاوێنە دەکا، چونکە رووی ئاوێنە بە غەمزەیە و ئەو کەسەی کە جوانڕوویە رووی ئاوێنە بە سەد گیان داوا دەکا، چونکە رووی ئاوێنە نوێنەری

جوانیی ئەوە.

یۆسفی میسری، دۆستێکی لە سەفەر هاتەوە. گوتی « چت بۆ من بە دیاری هێناوە؟ »

گوتی « چ هەیە کە تۆ نەتبێ و موحتاجی بی؟ ئیللا لەبەر ئەوەی کە لە تۆ جوانتر هیچ نیە، ئاوێنەم هێناوە هەتا هەردەم رووی خۆتی تێدا موتالاّ بکەی. »

چ هەیە کە هەقتەعالا نەیبێ و موحتاجی بێ؟ لای هەقتەعالا، دڵێکی روون پێویستە هەتا خۆی تێدا ببینێ!

شارێک کە هەرچیت بوێ بیدۆزییەوە، لە جوانڕوویان و لەززەت و داوا و شتی رازاوەی جۆراوجۆر، ئیللا کە ئاقڵێکی تێدا نادۆزییەوە ـ بریا بە پێچەوانەی ئەمە با! ـ ئەو شارە وجوودی مرۆڤە. ئەگەر سەدهەزار هونەری تێدابێ و ئەو مانایەی تێدا نەبێ، ئەو شارە وێران چاتر. وە ئەگەر ئەو مانایە هەیە و رواڵەتی رازاوەی نیە، خەم نیە: رازی ئەو دەبێ ئاوەدان بێ.

مرۆڤ لە هەر حاڵەتێک دا کە هەیە، رازی ئەو خەریکی هەقە و ئەو خەریک بوونە رواڵەتییەی ئەو بەرگریی لە مەشغووڵییەتی دەروون ناکا. هەروەک ژنێکی زگپڕ لە هەر حاڵەتێک دابێ، لە ئاشتی و شەڕ و خواردن و خەوتن، ئەو منداڵە دە زگی ئەو دا هەڵدەدا و هێز و هەست وەردەگرێ و دایک ئاگای لێی نیە. مرۆڤیش هەڵگری ئەو رازەیە. هەقتەعالا ئەو لە زوڵم و نەزانین دا راناگرێ. لە هەڵگری سیمایەکی مرۆڤانە دۆستایەتی و هاوەدەنگی و هەزار ناسیاویی پێکدێ، لەو رازەی کە مرۆڤ هەڵگری ئەوە لات سەیرە کە دۆستایەتی و ناسیاویی دەرکەوێ؟ جا بزانە دوای مەرگ، چیهای لێ دەردەکەوێ!

راز دەبێ ئاوەدان بێ. چونکە راز هەروەک رەگی درەختە: سەرەڕای ئەوە کە نادیارە، شوێنی ئەو لە سەر لکەکان دیارە. ئەگەر یەک دوو لک بشکێن، چونکە ریشە پتەوە، سەر هەڵدەداتەوە، ئیللا ئەگەر ریشەی سست بێ، نە لک دەمێنێتەوە و نە پۆ.

مستەفا لە کاتی دەسنوێژ هەڵگرتن دا فەرمووی کە « نوێژ راست نیە، ئیللا بەم دەسنوێژە » مەبەست ئەوە نیە ـ دیاریکراو، دەنا دەبا دەسنوێژی کەس راست نەبا،

چونکە شەرتی راستیی نوێژ، دەسنوێژی مستەفا بوو و بەس، ئیللا غەرەز ئەوەیە کە هەرکەس جنسی ئەم دەسنوێژە هەڵنەگرێ، نوێژەکەی راست نابێ.

وەها کە دەڵێن « ئەوە تەبەکی هەنارە » یانی چی؟ یانی کە هەنار ئەمەیە و بەس؟ نا، مەبەست ئەوەیە کە لە جنسی هەنارە.

گوندییەک هاتە شار و میوانی شارییەک بوو. شاریی هەڵوای دایە و گوندیی بە ئیشتیاوە خواردی و گوتی « ئەی شاریی، من شەو و رۆژ فێرە گێزەر خواردن بووم. ئێستا کە تامی هەڵوام چێژت، لەززەتی گێزەرم لەبەر چاو کەوت. نووکە، دەزانم، هەڵوام دەست ناکەوێتەوە و ئەوەی هەشمبوو دڵم لێی سارد بۆوە، چارەی چیە؟ »

چونکە گوندیی هەڵوای چێژت، دوای ئەوە، مەیلی شار دەکا، چونکە شاریی دڵی برد. ناچار بە شوێن دڵ دا دێ.

هەندێک هەن سڵاو دەکەن و سڵاوەکەیان بۆنی دووکەڵی لێدێ. هەندێک هەن سڵاو دەکەن و سڵاوەکەیان بۆنی میسکی لێدێ. ئەمە کەسێک بۆی دەردەکەوێ کە لووتێکی هەبێ.

دەبێ یار بە تاقی کەیەوە، هەتا ئاکام پەژیوانیی نەبێ. سوننەتی هەق وەهایە. نەفسیش ئەگەر ئیدعای بەندایەتی بکا، بێ تاقی کردنەوە لێی قەبووڵ مەکە! لە دەسنوێژ دا ئاو دە لووت دەکەن، دوای ئەمە دەیچێژن. هەر بە بینین قەناعەت ناکەن. یانی لەوانەیە روخساری ئاو لە سەر جێی خۆی بێ بەڵام تام و بۆنی گۆڕابێ. ئەمە تاقی کردنەوەیە بۆ راستیی ئاو. ئەوسا، دوای تاقی کردنەوە، بە رووی دادەکەن.

ئەوەی کە تۆ دە دڵت دا بیشارییەوە لە چاک و خراپ، هەقتەعالا ئەو لە رواڵەتی تۆ دەردەخا. هەرچی لە بنی درەخت دا شاردرابێتەوە، شوێنەواری لە لک و پۆیەکانی دەردەکەوێ. ئەگەر هیچکەس لە زاتی تۆ ئاگادار نەبێ، ئەدی رەنگی رووی خۆت چ لێدەکەی؟

## لەش وەک مریەمە
## و
## عیسایەک دە ئێمە دایە!

ئەمیر پەروانە گوتی « ئەمە چ لوتفێکە کە مەولانا تەشریفی هێناوە؟ چاوەڕوانییم نەدەکرد و بە دڵم دانەدەهات. کەی شایەنی ئەوەم؟ من دەبا شەووڕۆژ، دەستەونەزەر، لە ریز و سرەی نۆکەران و خزمەتکارانی ئەو دابام. هێشتا شایەنی ئەوە نیم، ئەمە چ لوتفێک بوو؟ »

فەرمووی « ئەمە لەبەر ئەوەیە کە ئێوە هیممەتێکی بەرزتان هەیە. سەرەڕای ئەوە کە پلەیەکی ئازیز و گەورەتان هەیە و خەریکی کاری قورس و بەرزن. لەبەر بەرزیی هیممەتی خۆتان خۆ بە خەتاکار دەزانن و پێی رازی نین و لە سەر خۆتان کاری زۆرتان پێویست کردوە. سەرەڕای ئەوە کە ئێمە دڵمان هەمیشە لە خزمەت دابوو، بەڵام ویستمان کە بە رووش خۆ دەرخەین، چونکە روو متمانەیەکی گەورەی هەیە. متمانەی چی؟ خۆی شەریکی مێشکە. هەر ئەوجۆرەی کە کار بەبێ مێشک ناکرێ، بێ توێکڵیش ناگونجێ. وەها کە ئەگەر دەنکێک بێ توێکڵ دە زەوی بنێی، هەڵنادا ـ بەڵام کە بە توێکڵەوە لە زەوی بنێژی، هەڵدەدا و دەبێتە درەختێکی بەرز. کەوایە، لەبەر ئەوە، لەشیش ئەسڵێکی گەورەیە و پێویستە و بێ ئەو کار سەر ناگرترێ و مەبەست پێکنایە. ئەسڵ مانایە لای ئەو کەسەی کە مانا بزانێ و مانا کرابێتەوە.

دەروێشێک چوە لای پادشایەک. پادشا پێیگوت کە « ئەی زاهید! »

گوتی « زاهید تۆی! »

گوتی « من چۆن زاهیدم؟ کە هەموو دونیا هی منە. »

گوتی « نا، بە پێچەوانە دەیبینی. دونیا و ئاخیرەت و مڵکت، هەمووی هی منە و لە دەستەڵاتی من دایە. تۆی کە بە پارووەیەک و پەڕۆیەک قانع بووی. »

[رۆژهەڵات و رۆژاوا هی خـــودایە، روو لە هەر لایەک بکەن رووتان دە خـــودا

کردوه] *

روویەکە جیاواز و بە برەو کە بێ برانەوەیە و هەرمانە. ئاشقان خۆیان فەدای ئەم روویە دەکەن و داخوازی پاداش نین. باقی هەروەک چوارویێن.

فەرمووی « هەرچەند چوارویێن، بەڵام موستەهەقی خەڵاتن و هەرچەند لە ئاخوڕ دان، مەقبوولّی میراخورن ـ کە ئەگەر بیەوێ لەم ئاخوڕەی رادەگوێزێ و دەیباتە تەویلەیەکی تایبەتی: هەر ئەوجۆرەی کە لە سەرەتا دا ئەو نەبوو، خوڵقاندیان و لە تەویلەی وجوود هێنایانە جەمادیی و لە تەویلەی جەمادیی بۆ گیایی و لە گیایی بۆ حەیوانیی و لە حەیوانیی بۆ ئینسانیی و لە ئینسانیی بۆ مەلەکیی... کەوایە ئەوانەی بۆ ئەمە کرد هەتا ئیقرار بکەی چونکە ئەو لەم جۆرە تەویلانەی زۆرە، باشتر لە یەکدی. ئەمەی بۆ ئەوە کرد کە ئیقرار بکەی بەو تەبەقانەی دی کە لە پێش دێن ـ بۆ ئەوەی نەکرد کە ئینکاری بکەی و بڵێی هەر ئەمەیە. وەستایەک سەنعەت و فەرهەنگ بۆ ئەوە نیشان دەدا کە بڕوای پێبکەن و فەرهەنگی دیکەی کە نیشان نەداوە ئیقراری پێدەکەن و ئیمانی پێدێنن. هەروەتر، پادشایەک خەڵات و دەسخۆشانە دەدا و مەحەبەت دەکا، بۆ ئەوە مەحەبەت دەکا کە چاوەڕوانی شتی دیکەی لێبکەن و کیسە بۆ هیواکانیان بدروون. بۆ ئەوە نادا کە بڵێن ئەمەیە، پادشا ئیدی خەڵات نادا، هەر ئەوەندەی هەیە و دەبێ بەوەندە قەناعەت بکەن. قەت. پادشا ئەگەر بزانێ کە وا دەڵێن و وا دەزانن، خەڵاتتان ناکا.

زاهید ئەوەیە کە ئاخر ببینێ و ئەهلی دونیا ئاخوڕ. بەڵام ئەوانەی کە شازن و عارفن نە ئاخر دەبینن و نە ئاخوڕ، ئەوان چاویان بە یەکەم کەوتوە و سەرەتای کار دەزانن. هەر ئەوجۆرەی کە زانایەک گەنم داچێنێ، دەزانێ کە گەنم شین دەبێ. چونکە، لە سەرەتاوە ئاخری دیت. هەروەتر، جۆ و برینج و غەیرە. کە یەکەمی دیت، ئەو ناڕوانێتە ئاخر. ئاخر لە سەرەتا دا لێی دیار کراوە. ئەوان نادرن. ئەو کەسانەش کە ئاخر دەبینن، ئەوانە لە ناوەند دان و ئەوانەی کە لە ئاخوڕ دان ئەوانەش چوارویێن.

دەردە کە ڕێبەری مرۆڤە لە هەر کارێک دا کە هەیە. هەتا دەردی ئەو کارە و تاسە و ئەشقی ئەو کارەی دە دەروون دا سەر هەڵنەدا، تەمای ئەو کارە ناگرێ و ئەو کارەی بێ دەردە بۆ جێبەجێ نابێ ـ چ دونیا بێ، چ ئاخرەت، چ بازرگانی، چ پادشایەتی، چ زانست، چ ئەستێرەناسی و غەیرە. هەتا ژانی زان لە مریەم دا سەری

هەڵنەدا، تەمای ئەو درەختەی بەختی نەکرد. ئەو ژانە ئەوی بردە لای درەخت و درەختی ویشک بەری هێنا. لەش هەروەک مریەمە و هەرکاممان عیسایەکمان هەیە. ئەگەر دەرد لێمان دەرکەوێ، عیساکەمان دەزێ و ئەگەر دەرد نەبێ، عیساش بەو رێگا نهێنییە دا کە هات، دیسان دەگەڕێتەوە سەر رەچەڵەکی خۆی، ئیللا ئێمە مەحرووم دەمێنینەوە و بێبەش لەو.

* سوورەی بەقەرە ئایەی ١١٥

## هۆی ئاوەدانی، غەفلەتە!

ئەم قورئانخوێنە قورئان دروست دەخوێنێتەوە. ئادی، رواڵەتی قورئان دروست دەخوێنێتەوە بەڵام لە ماناکەی بێخەبەرە. هۆیەکەی ئەوەیە، ئەودەم کە ماناکەی بۆ دەردەکەوێ رەدی دەکاتەوە، کوێرانە دەیخوێنێتەوە.

وێنەکەی: پیاوێک کەوڵی سەگاوی بە دەستەوەیە، کەوڵێکی باشتر لە هی ئەو دێن، رەدی دەکاتەوە. کەوایە زانیمان کەوڵناس نیە. کەسێک پێیگوتوە کە ئەمە کەوڵی سەگاوە، ئەویش بە تەقلید بە دەستیەوە گرتوە.

هەروەک منداڵ کە بە گوێز یاریی دەکەن. ئەگەر کاکڵی گوێز یا رۆنی گوێزیان بدەیەی، رەدی دەکەنەوە ـ « چونکە گوێز ئەوەیە کە خللەخلی بێ! ئەوە دەنگ و خللەی نیە. »

ئاخر، خەزێنەکانی خودا گەلێکن و زانستەکانی خودا گەلێک. ئەگەر قورئانی بە زانستەوە دەخوێنێتەوە، قورئانی دیکە بۆ رەد دەکاتەوە؟

بە قورئانخوێنێکم دەکوت کە « قورئان دەڵێ: ئەی رەسوول بە ئوممەتەکەت بڵێ ئەگەر دەریا بۆ نووسینەوەی وشەکانی خودا ببێتە جەوهەر، بەر لەوەی کە وشەکانی خودا کۆتایی پێبێ دەریا وشک دەبێ.* ئێستا بە پەنجا دەرم جەوهەر دەکرێ ئەم قورئانە بنووسیەوە! » ئەمە رازێکە لە زانستی خودا. هەموو زانستی خودا هەر ئەمە نیە. عەتتارێک لە کوتە کاغەزێک دا دەرمانی پێچاوە. تۆ دەڵێی هەموو دوکانی عەتتار دەوە دایە؟ ئەمە گەوجایەتییە. ئاخر، لە سەردەمی مووسا و عیسا و غەیرەش، قورئان هەبوو، کەلامی خودا هەبوو. بە عەرەبی نەبوو. باسی ئەوەم بۆ دەکرد، دیتم قورئانخوێن گوێی پێنابزوێ، جێم هێشت و رۆیشتم.

دەگێڕنەوە: لە سەردەمی رەسووڵ، لە ئەسحابە هەرکام کە سوورەتێک یا نیو سوورەتی لەبەر با، بە گەورەیان دادەنا و بە ئەنگوست نیشانیان دەدا کە «سوورەتێکی لە بەرە! » چونکە ئەوان قورئانیان دەخوارد. مەنێک نان خواردن یا دوو مەن، گەلێک زۆرە، مەگەر هەر دە دەمی بنێن و نەیجاون و فرێی بدەنەوە: [ئاوا] هەزار خەرواریش دەکرێ بخۆی.

قـەومێک خـودا چاوەکانـی بە غەفلـەت بەسـتن هەتا ئەم عـالەمـەیان پێ بنیـات بنێ. ئەگەر هـەندێک لە عالەمی دیکە غـافڵ نەکا، هیچ عـالەمێک ئاوەدان نابـێتەوە. غـەفلەت بینـا و ئاوەدانی پێکدێنێ. ئاخـر، ئەم سـاوایە بە غـەفلەت گـەورە دەبـێ و هەڵدەدا و کاتێک ئەقڵـی بە کەمـاڵ بگا، ئیدی هـەڵنادا. کۆڵەکەی ئەم دونیایە غـەفلەتە و وریایی ئەم دونیایە ئافەتە. کەوایە هۆی ئاوەدانی غەفلەتە و هۆی وێرانی وریایی.

ئەوەی کـە من دەیڵێم، لە دوو بـەدەر نیە: یا لەبەر ئێرەیی دەیڵـێم یا لەبەر بەزەیی. حاشـا کە ئێرەیی بێ! بـۆ ئەوەی کە ئێرەیی بایەخی هـەبێ، دەبێ حەسرەت بۆ شـتێک بخـوازی کـە چ بـایەخی نیـە! ئیللا لە رادەی بەزەیی و رەحـمـەتە کـە دەمـەوێ یاری خۆشەویست لە روخسـارەوە بەرەو مانا رابکێشین.

دەگێڕنەوە: کەسێک لە رێی حەج دا، کەوتە بیاوان و تینوایەتییەکی زۆر بە سەری دا زاڵ بوو. هـەتا لە دوورەوە چاوی بـە خـێـوەتێکی چووک و کـۆن کـەوت. چوە وێ. ژنێکی دیت. ئـەو کـەسـە هەرای کرد کە « مـیوانم. خـۆشـەویستی خـودا! » دابەزی و دانیشت و ئاوی ویست. ئاویان پێدا. خواردیەوە. ئەو ئاوە لە ئاگر گەرمـتر و لە خوێ سوێرتر. لێو و زاری هـەتا ئەو شوێنەی کە چوە خوار، هەموو داپڵۆخاند.

پیـاو لەبەر بەزەیی، ئەو ژنـەی نەسیـحـەت کـرد و گوتی « ئێـوە هەقـتـان بە سـەر منەوەیە لەبەر ئەو راحـەتییـەی کە لە ئێوەوە پێمگەیوە ـ بەزەییم وەکوڵ هاتوە. ئەوەی کـە بە ئێـوەی دەڵێم دڵسـۆزانـە وەریگرن: نووکـە بەغـدا نزیکە و کـووفـە و واسـێت و غەیرە و شـارەکانی گەورەی دیکە. ئەگـەر گردەنشینیش بن، بە خشکە خشکە و تللۆر و خللۆر دەتوانن خـۆتان بگەیەنێن ئەوێندەرێ ـ کە لەوێ ئاوی شیـرینی فێنک گـەلێک زۆرە » و تەعـامی جـۆراوجـۆر و حـەمـام و نیـعمـەت و خـۆشیـی و لەززەتەکـانی ئەو شارانەی بۆ ژمارد.

دوای تاوێک، ئەو عـەرەبە کە پیـاوەکەی بوو هاتەوە. چەندێک مـشکی دەشـتی راو کـردبـوو. ئەمـری کـرد و ژن سـازی کـرد و بەشـێکیشـیـان دا بە مـیوان. مـیوان هـەر ئەوجۆرەی کە دەبا، بە قێز و بێز، لێی خوارد.

دوای ئەوە کـە نیـوەشـەو، مـیوان لە دەرەوەی خـێوەت خـەوت. بیسـتی ژن بە پیـاو دەڵێ کـە « هیچ دەزانی ئەو مـیـوانە چەندە پەسن و باسـی دەکـرد؟ » و حـەکـایەتی

میوانی بە تەواوی بۆ مێرد گێڕاوە.

عەرەب گوتی « ئافرەت! نەکەی گوێ لە شتی وا بگری! ـ کە حەسوود لە عالەم دا زۆرن. کە ببینن هەندێک بە حەسانەوە و دەوڵەت گەیشتوون، ئێرەیی پێدەبەن و دەیانەوێ کە ئاوارەیان بکەن و لەو دەوڵەتە مەحرووم. »

نووکە، ئەم خەڵکە وەهان. کە کەسێک لەبەر بەزەیی نەسیحەتیان بکا، بە ئێرەیی دادەنێن، ئیللا ئەوە کە ئەسڵێکی تێدابێ، لە ئاکام روو دە مانا دەکا. ئەگەر لە رۆژی ئەلەستەوە دڵۆپێکیان تکاندۆبێتە سەری، لە ئاکام ئەو دڵۆپە ئەو لە دڵەکوتە و کوێرەوەرییە رزگاری دەکا.

وەرە! ئاخر، چەندە لە ئێمە دووری و بێگانە و گیرۆدەی تاسە و سەوداکان؟

ئیللا دەگەڵ قەومێک چ قسەیەک بکا کە جنسی ئەو قسەیان نەبیستوە نە لە کەسێک و نەک لە شێخی خۆیان؟

روو دە مانا کردن هەرچەند سەرەتا هەندە جوان دیاری نادا، ئیللا هەرچەند کە تێپەڕێ، شیرینتر دیاری دەدا، بە پێچەوانەی رواڵەت: لە پێشدا جوان دیاری دەدا، هەرچی پتر دەگەڵی دانیشی، ساردتر دەبییەوە. رواڵەتی قورئان لە کوێ و مانای قورئان لە کوێ؟ سەیری مرۆڤ بکە: روخساری ئەو لە کوێ و مانای ئەو لە کوێ؟ ـ کە ئەگەر مانای ئەو رێی دە روخساری بکەوێ، ساتێک بەر دەرگاکەی بەرنادەن.

مەولانا شەمسەددین دەیفەرموو کە: کاروانێکی گەورە بەرەو شوێنێک دەچوون. ئاوەدانییان نەدەدیتەوە و ئاویش نەبوو. لە نەکاو، چاڵاوێکیان دیتەوە بێ دۆڵچە. سەتڵێکیان دەست کەوت و گوریس و ئەو سەتڵەیان دە چاڵاو خست. سەتڵ نەما. یەکی دیکەیان نارد، ئەویش نەما، دوای ئەوە ئەهلی کاروانیان لە گوریس دەبەست و دەیانناردنە نێو چاڵاو و نەدەهاتنەوە سەر.

ئاقڵێک بوو، گوتی « بڵا من بچم! » ئەویان رۆهێشت. نزیک بوو بگاتە بنی چاڵاو، رەشاییەکی بە سام دەرکەوت. ئاقڵ کوتی رزگارییم نایە. بڵا هەتا ئەقڵم وە کار خەم و لە خۆ نەچم، هەتا بزانم چم بە سەر دێ.

رەشایی گوتی « درێژدادڕیی مەکە! تۆ ئەسیری منی، رزگارییت نایە، ئیللا بە وڵامی راست. بە شتێکی دیکە رزگارییت نایە! »

گوتی « بفەرمووو! »

گوتی « لە شوێنەکان کوێ خۆشترە؟ »

ئاقڵ بیری کردەوە من ئەسیر و بێچارەی ئەوم، ئەگەر بڵێم بەغدا یا غەیرە، وەها دەبێ کە توانجم لە جێگەی ئەو دابێ. گوتی « ئەو شوێنە خۆشترە کە لەوێ هاودەمێکت هەبێ ـ ئەگەر بنی زەوی بێ و ئەگەر کونی مشک بێ، ئەوێ خۆشترە. »

گوتی « بژی! بژی! رزگار بووی. مرۆڤ لە دونیا هەر تۆی. نووکە، من تۆ رزگار دەکەم و ئەوانی دیکەش بە بەرەکەتی تۆ رزگار دەکەم. دوای ئەمە خوێنێک نارێژم. هەموو خەڵکی عالەمم بە خۆشەویستی تۆ بەخشی. » دوای ئەوە، ئەهلی قافڵەی لە ئاو تێراو کردن.

نووکە، غەرەز لەوە مانایە. هەر ئەو مانایە دەتوانی بە رواڵەتی دیکەش بگێڕییەوە. ئیللا لاساکەرەوەکان هەر ئەو نەقشە دەبینن. زەحمەتە قسە دەگەڵ کردنیان. نووکە، هەر ئەو قسەیان بە شێوەیەکی دیکە پێبڵێی، نایبیسن.

* سوورەی ئەلکەهەف ئایەی ۱۰۹

# حەوسەد پەردەیە لە تاریکی
# و
# حەوسەد لە نوور!

هەر زانستێک کە بە خوێندن و کەسب لە دونیا دەست کەوێ، ئەوە زانستی ئەبدانە و ئەو زانستەی کە دوای مەرگ دەست دەکەوێ، زانستی ئەدیانە. زانینی «اناالحق » زانستی ئەبدانە، بوونە « اناالحق » زانستی ئەدیان. شۆقی چرا و ئاگر دیتن زانستی ئەبدانە، سووتان لە ئاگر و لە شۆقی چرا دا زانستی ئەدیان. ئەوەی کە ئەو روانگە و بینینەی هەبێ زانستی ئەدیانی هەیە و بێشک دیویەتی و دەزانێ باقی زانستەکان زانستی خەیاڵن. عیلمی یەقینە، عەینی یەقین نیە.

بۆ وێنە موهەندیسێک بیری کردەوە و بینای فێرگەیەکی هێنا خەیاڵەوە. هەرچەند ئەو بیرە راست و خێرە، بەڵام خەیاڵە. هەقیقەت ئەوەیە کە فێرگە بەرز بێتەوە و بینا بکرێ.

نووکە، لە خەیاڵەوە تا خەیاڵ جیاوازی زۆرە: خەیاڵی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی سەرووتر لە خەیاڵی ئەسحابەکانە و لە نێوان خەیاڵ و خەیاڵ جیاوازی زۆرە. موهەندیسی زانا خەیاڵی بنیات نانی خانوویەکی کرد و غەیری موهەندیسێکیش خەیاڵی کرد. جیاوازی زۆرە. چونکە خەیاڵی موهەندیس لە هەقیقەت نزیکترە. هەروەها لەو لاشەوە، لە عالەمی هەقیقەتەکان و بینین: لە بینینەوە هەتا بینین جیاوازی زۆرە.

کەوایە ئەوەی کە دەڵێن « حەوسەد پەردەیە لە تاریکی و حەوسەد لە نوور » هەرچی عالەمی خەیاڵە، پەردەی تاریکییە و هەرچی عالەمی هەقیقەتە، پەردەی نوورە. بەڵام لە نێوان پەردەکانی تاریکی دا ـ کە خەیاڵە ـ هیچ جیاوازییەک ناتوانی بەدی بکەی و بیهێنیە بەر چاو. لەبەر رادی لوتف، سەرەڕای جیاوازییەکی گەورە و قووڵ، لە هەقیقەتەکانیش دا ناتوانی لەو جیاوازییانە تێبگەی.

# حەفتاودوو میللەت لە شەڕن!

هەر تایفەیەک تایفەیەکی دیکە ڕەد دەکاتەوە. ئەوانە دەڵێن کە « ئێمە هەقین و وەحی ئێمە راستە و ئەوان باتڵن! » و ئەوانیش بەمانە وەها دەڵێن. هەروەتر حەفتاودوو میللەت یەکتر ڕەد دەکەنەوە، ئەوجار وێگڕا دەڵێن کە « هەموو وەحیان نیە! » کەوایە لە نەبوونی وەحی دا هاوبڕوان و لەم هەموانە، یەکیان ڕێگایە ـ لە سەر ئەوەش هاوبڕوان. نووکە، هەڵسەنگێنەرێک، زیرەکێک، ئیماندارێک دەبێ بزانێ کە ئەو یەکە کامەیانە.

پرسیاری کرد « ئەمانەی کە نازانن زۆرن، ئەوانەی کە دەزانن کەمن. »

فەرمووی « ئەگەر خەریکی هەڵسەنگاندن بین دە نێوان ئەوانەی کە نازانن و گەوهەرێکیان نیە دەگەڵ ئەوانەی کە هەیانە ماوەیەکی درێژ دەخایەنێ. ئەوانەی کە نازانن، هەرچەند زۆرن، بەڵام ئەگەر هەندێکیان بناسی، هەمووت ناسیون. ئەوجۆرەی کە ئەگەر مشتێ گەنم بناسی، هەموو ئەنبارەکانی عالەم دەناسی و ئەگەر کوتە شەکرێکت چێژتبێ، ئەگەر سەد جۆر هەڵوای ساز بکەن لە شەکر، دەزانی کە شەکری تێدایە ـ چونکە شەکرت ناسیوە. کەسێک کە شاخەیەک شەکر بخوا چۆن شەکر ناناسێتەوە؟ مەگەر دوو شاخی هەبێ.

ئێوە ئەگەر ئەم قسەتان پێ دووپات کردنەوەیە، لەبەر ئەوەیە کە ئێوە دەرسی یەکەم تێنەگەیشتوون. کەوایە پێویستە هەموو رۆژێک ئەمەتان پێبڵێمەوە. هەر ئەوجۆرەی کە مامۆستایەک بوو، سێ مانگ منداڵێکی لە لا بوو لە « ئەلف هیچی لە سەر نیە » تێنەپەڕیبوو. باوکی منداڵ هات کە « ئێمە لە خزمەت کۆتایی ناکەین و ئەگەر کۆتاییەکمان کردوە بفەرموو کە پتر خزمەت بکەین! »

گوتی « نا ـ خەتای ئێوە نیە. بەڵام منداڵ لەمە تێناپەڕێ! » ئەوی بانگ کرد و گوتی « بڵێ: ئەلف هیچی لە سەر نیە! »

گوتی « هیچی نیە! » نەیدەتوانێ بڵێ « ئەلف »

مامۆستا گوتی « حاڵ ئەمەیە کە دەیبینی. کە لەمە تێنەپەڕی و ئەمە فێر نەبوو من چۆن دەتوانم دەرسی نوێی لێدابدەم؟ »

گوتی: که گوتمان « الحمدلله رب العالمين »، لەبەر ئەوە نیە که نان و نیعمەت کەم بوە. نان و نیعمەت بێنەهایەتە، بەڵام ئیشتیا نەماوە و میوانەکان تێر بوون. لەبەر ئەمە دەگوترێ « الحمدلله » و ئەم نان و نیعمەتە وەک نان و نیعمەتی دونیا ناچێ. چونکە نان و نیعمەتی دونیا بەبێ ئیشتیا، ئەوەندی کە پێتخۆشە، بە زۆر، دەتوانی بیخۆی: چونکە جەمادە، بۆ هەرکوێی بکێشی دەگەڵ تۆ دێ، رووحێکی نیە کە لە شوێنی نابەجێ بەری بگرێ. بە پێچەوانەی ئەمە، نیعمەتی خودا کە حیکمەتە، نیعمەتێکی زیندوویە ـ هەتا ئیشتیات دەیبا و مەیلت هەیە، بۆ لای تۆ دێ و دەبێتە خۆراکی تۆ و کاتێک مەیل و ئیشتیا نەما، ناتوانی ئەو بە زۆر بخۆی و بیکێشی. ئەو رووی بە چارشێو دادەپۆشێ و رووی نیشانی تۆ نادا.

حەکایەتی کەراماتیان دەفەرموو. گوتی « یەکێک لێرەوە بە رۆژێک یان بە ئانێک بچێتە کابە، هێندە سەیر و کەرامات نیە. بای سەموونیش ئەم کەراماتەی هەیە: بە دانێک و بە ئانێک، هەرکوێ کە بیەوێ بچێ. کەرامات ئەوەیە کە تۆ لە حاڵی نزمەوە بۆ حاڵی بەرز بەرێ و لەوێوە بۆ ئێرە سەفەر بکەی و لە نەزانین بەرەو ئەقڵ و لە جەمادیی بەرە حەیات. وەها کە لە پێشدا خاک بووی، جەماد بووی، تۆیان بۆ عالەمی گیا هێنا، لە عەلەمی گیا سەفەرت کرد بۆ عالەمی عەلەقە و ئاولەمە، لە عەلەقە و ئاولەمە بەرەو عالەمی حەیوانیی و لە حەیوانییەوە بۆ عالەمی ئینسانیی سەفەرت کرد، کەرامات ئەمەیە. هەقتەعالا وەها سەفەرێکی لە تۆ نزیک کردەوە. لەم مەنزڵ و رێگایانە کە هاتی، هیچ لە یاد و زەینی تۆ دا نامێنێتەوە کە پێیداهاتووی ـ لە کام رێگاوە هاتی و چۆن هاتی. وە تۆیان هێنا و بە ئاشکرا دەبینی کە هاتووی. هەروەتر، تۆ بۆ سەد عالەمی دیکەی جۆراوجۆر دەبەن. مونکیر مەبە و ئەگەر خەبەری لێبدەن، قەبووڵی بکە! »

قاپێکی پڕ لە ژاریان بۆ عومەر هێنا بە دیاری. گوتی « ئەمە بە کەلکی چی دێ؟ » گوتیان « ئەمە بۆ ئەوە دەبێ ئەگەر بە مەسڵەحەتی نەزانن کەسێک بە ئاشکرا بکووژن، لەمە کەمێکی دەدەنێ بە شاراوەیی دەمرێ و ئەگەر دوژمنێک بێ کە بە شەمشیر نەکرێ بیکووژی بە کەمووچکەیەک لەمە، بە نهێنی ئەو دەکووژن. »

گوتی « شتێکی گەلێک زەریفتان هێناوە، بمدەنێ بێخۆم ـ دە من دا دوژمنێک هەیە مەزن، شەمشیر نایگاتێ و لە عالەم دا لەو دوژمنترم کەس نیە. »

گوتیان کە « پێویست ناکا هەمووی بخۆی ـ کەمووچکەیەک بەسە. ئەمە بۆ سەدهەزار کەس بەسە. »

گوتی « ئەو دوژمنەش کەسێک نیە، هەزار پیاوی دوژمنە و سەدهەزار کەسی سەرنخوون کردوە. » وەریگرت و قاپەکەی هەموو خوارد.

ئەو تاقمەی لەوێ بوون، وێکڕا بوونە موسڵمان و گوتیان کە « دینی تۆ هەقە! » عومەر گوتی « ئێوە بوونە موسڵمان و ئەم کافرە هێشتا نەبۆتە موسڵمان. »

نووکە، مەبەستی عومەر لەو ئیمانە، ئەم ئیمانی ئاسایی نیە. ئەو، ئەو ئیمانەی هەبوو و زیادتریش، بەگرە ئیمانی سەدیقانی هەبوو. بەڵام مەبەستی ئەو ئیمانی پێغەمبەران و خاسان و عين اليقين بوو و داوای ئەوی دەکرد.

وەها کە: ناوبانگی شێرێک بە دونیا دا بڵاو ببۆوە. خەڵک بۆ سەیر، لە ڕێگای دوورەوە بە تەمای ئەو مێشەیە بوون بۆ دیتنی شێر. یەک ساڵە ڕێ، کوێرەوەرییان کێشا و مەنزڵیان بڕی. کە گەیشتنە مێشەکە و شێریان لە دوورەوە بینی، وەستان و نەیانتوانی بچنە پێش. گوتیان « ئاخر، ئێوە ئەو هەموو هەنگاوەتان هەڵێناوەتەوە بە ئەشقی ئەم شێرە و ئەم شێرە تایبەتمەندییەکی هەیە کە هەرکەس بە جەرگەوە لێی بچێتە پێش و بە ئەشقەوە دەستی پێدابێنێ، هیچ ئازارێکی پێناگەیەنێ و ئەگەر کەسێک لێی بترسێ و هەراسان بێ، شێر لێی تووڕە دەبێ و بگرە شاڵاویش بۆ هەندێکان دەبا کە چ گومانێکی خراپم لێدەکەن؟ شتێکی کە وەهایە. یەکساڵ هەنگاوت هەڵێناوە، نووکە نزیک شێر بوونەوە، ئەمە چ وەستانێکە؟ هەنگاوێک بەرنە پێش! »

کەس وەرەی نەبوو هەنگاوێک بۆ پێشەوە هەڵێنێتەوە. گوتیان « ئەو هەموو هەنگاوەمان هەڵێناوە، چەند هاسان بوو. یەک هەنگاو لێرە ناتوانین هەڵگرین. »

نووکە، مەبەستی عومەر لە ئیمان، ئەو یەک هەنگاوە بوو ـ کە هەنگاوێک لە حزوور شێر دا، بەرەو شێر هەڵێنێتەوە و ئەو هەنگاوە گەلێک نادرە، جگە لە کاری خاسان و نزیکان نیە و هەنگاو خۆی ئەمەیە ـ باقی شوێنی هەنگاون. ئەو ئیمانە جگە لە پێغەمبەران بە کەس ناگا ـ کە دەستیان لە گیانی خۆیان شوشت.

یار شــتـێکی خـۆشــە، چوونکە یار لە خــەیاڵی یار هێـز دەگـرێ و هـەڵدەدا و دەبووژێتـەوە. چەند سـەیرە مـەجنوون کە خەیاڵی لەیلا هێزی دەدایە و بۆی دەبوو بە خـۆراک؟ لە شـوێنێک کـە خـەیاڵی خـۆشـەویسـتی مـەجـازیی ئەم هـێـز و شــوێن داخستنەی هەبێ، یاری هەقیقیبیت چەند پێ سـەیر دەبێ کە چ هێز و توانایەک، بە خەیاڵی ئەو دەبەخشێ، لە حوزوور دا و لە غـەیبەت دا؟ چ خـەیاڵێک؟ ئەو خۆی گیانی هەقیقەتەکانە. بەو ناڵێن خەیاڵ!

عالەم قایم بە خەیاڵە و بەم عالەمە دەڵێن هەقیقەت ـ لەبەر ئـەوەی کە دەبیندرێ و هەست پێدەکرێ ـ و ئەو مانایانە کە ئەم عالەمە فەرعی ئەوە، پێیدەڵێی خەیاڵ؟ کار بە پێچەوانەیە. خەیاڵ، ئەم عالەمەیە ـ کە ئەو مانایە سـەدی وەک ئەم عالەمە ساز دەکا، دەڕزێ و خەراپ دەبێ و دەفەوتێ و دیسان عالەمێکی نوێ ساز دەکاتەوە و ئەو کۆن نابێ. بێبەرییە لە تازە و کۆنە. فەرعەکانی ئەو بە تازە و کۆن دەناسرێن و ئەو کە خوڵقێنەری ئەمانەیە لە هەردووکیان بێبەرییە و لەوپەڕی هەردووکیانە.

موهەندیسێک ماڵێک لە مێشکی دا هەڵدەسـەنگێنێ و خـەیاڵ دەکا کـە درێژایی چەندە و بەرینایی چەند بێ و هەیوانی چۆن و حەوشی چۆن. بەمە ناڵێن خـەیاڵ ـ کە ئەو هـەقـیـقـەتە لـەم خــەیاڵە دەزێ و فـەرعی ئـەم خــەیاڵەیە. ئـادی، ئەگـەر غـەیری مەهەندیسێک لە زەینی دا وەها نەقشێک بێنێتـە خـەیاڵ و مێشکەوە، بەوە دەڵێن خەیاڵ. هـەروەکی باویشە، خەڵک بە وەها کەسێک کە بەننا نیە و ئەو زانستـەی نیە، پێیدەڵێن کە « خەیاڵ پڵاوە! »

## هەمووی ئەم دونیایە یەک ماڵە!

ئەم وەهم و دەروونی مرۆڤە وەکوو داڵانە. لە پێشدا دێنە داڵان، لە دوایی دەچنە نێو ماڵ. هەمووی ئەم دونیایەش وەکوو ماڵێکە. هەرچی بێتە ژوور ـ کە داڵانە، بێشک لە ماڵیش دەردەکەوێ و پەیدا دەبێ. بۆ وێنە، ئەو ماڵەی کە تێیدا دانیشتووین، روخسارەکەی دە دڵی موهەندیس دا پەیدا بوو، لە دوایی بوو بە ماڵ. کەوایە گوتمان هەمووی ئەم دونیایە یەک ماڵە، وەهم و بیر و فکرەکان داڵانی ئەم ماڵەن. هەرچی لە داڵان دیتت دەرکەوت، بە راستی بزانە کە لە ماڵیش دەردەکەوێ و ئەم هەموو شتە کە لە دونیا دەردەکەون، لە خێر و لە شەڕ، لە پێشدا هەموویان لە داڵان دەرکەوتوون، لە دوایی لێرە.

هەقتەعالا چونکە دەیەوێ شتی جۆراوجۆر ـ لە غەرایب و عەجایب و باغات و بێستان و مێرغوزار و زانست و نووسراوەکانی جۆراوجۆر ـ لە عالەم دەرکەون، ویستی ئەو و داوای ئەویان دە دەروونیان دەنێ هەتا لەو ئەمانە دەرکەون. هەروەتر، ئەوەی دەم عالەمە دا دەیبینی بزانە کە لەو عالەمیش دا هەیە. بۆ وێنە هەرچی لە نم دا دەیبینی بزانە کە دە دەریا دا هەیە ـ چونکە ئەم نمە لەو دەریایەوەیە و هەروەتر، ئەم خوڵقانی ئاسمان و زەوی و عەرش و کورسی و عەجایبی دیکە، هەقتەعالا داوای ئەوی دە رووحی پێشینیان نابوو، بەناچار، عالەم لەوەوە پەیدا بوو.

خەڵک کە دەڵێن « عالەم قەدیمە » کێ گوێ لە قسەکەیان دەگرێ؟ هەندێک دەڵێن کە « سازکراوە » و ئەوانیش ئەولیا و ئەنبیان ـ کە ئەوان قەدیمتر لە عالەمن و هەقتەعالا داوای خوڵقانی عالەمی دە رووحی ئەوان نا و لە دوایی عالەم پەیدا بوو. کەوایە ئەوان بە هەقیقەت دەزانن کە سازکراوە، لە روانگەی خۆیانەوە خەبەر دەدەن. بۆ وێنە ئێمە کە لەم ماڵە دا دانیشتووین تەمەنی ئێمە شێست و حەفتایە، دیتوومانە کە ئەم ماڵە نەبوە، چەندساڵێکە کە ئەم ماڵە ساز کراوە. ئەگەر لەم ماڵە دا جرۆجانەوەر پەیدا بن لە دەرک و دیواری ئەم ماڵە، وەک دووپشک و مشک و مار و گیانلەبەرانی چووک کە لەم ماڵە دا دەژین، ئەوان کە پەیدا بوون ماڵیان ئاوەدان چاو پێکەوتوە، ئەگەر ئەوان بڵێن کە « ئەم ماڵە قەدیمە » بەڵگە نیە بۆ ئێمە کە دیتوومانە ئەم ماڵە سازکراوە.

هەر ئەوجۆرەی کە ئەو جانەوەرانە لە دەرک و دیواری ئەم ماڵە رسکاون و جگە لەم ماڵە شتێک نازانن و نابینن، خەڵکن کە لەم ماڵی دونیایە رسکاون. دەوان دا جەوهەرێک نیە، جێ رسکانیان ئێرەیە و هەر لێرەش دەنێژرێن. ئەگەر ئەوان بە عالەم دەڵێن « قەدیم » بەڵگە نیە بۆ ئەنبیا و ئەولیا کە ئەوان هەبوون بەر لە عالەم بە سەدهەزار هەزار ساڵ (چ جێی ساڵ و چ جێی ئەژمارە ـ کە ئەوان نە ئەندازەیان هەیە و نە ئەژمار) چونکە ئەوان ساز کردنی عالەمیان دیوە، هەر ئەوجۆرەی کە تۆ ساز کردنی ئەم ماڵەت دیوە.

دوای ئەوەش، فەلسەفییەک بە سوننی دەڵێ کە « سازکرانی عالەمت چۆن زانی؟»

ئەی کەر، تۆ قەدیمی بوونی عالەمت چۆن زانی؟ ئاخر، قسەی تۆ کە « عالەم قەدیمە » ماناکەی ئەوەیە کە سازکراو نیە ـ و ئەمە شایەتی لە سەر رەددە. ئاخر شایەتی لە سەر ئیسبات هاسانترە هەتا شایەتی لە سەر رەد. چونکە شایەتی لە سەر رەد ماناکەی ئەوەیە کە ئەم پیاوە فلان کاری نەکردوە و ئاگادار بوون لەمەش زۆر زەحمەتە: دەبێ ئەم کەسە لە سەرەتای ژیان هەتا ئاخر، هاودەمی ئەو کەسە بێ ـ شەو و رۆژ، لە خەو و بێداری دا ـ کە بڵێ هەڵبەت ئەو کارەی نەکردوە. کەچی دیسانیش راست نیە: بەشکەم خەوی لێکەوتبێ یا چووبێتە حاجەتخانە کە نەگونجاوە هەمیشە دەگەڵی بێ. لەبەر ئەوە، شایەتی لە سەر رەد رەوا نیە ـ چونکە ناگونجێ. بەڵام شایەتی لە سەر ئیسبات دەگونجێ و هاسانە ـ چونکە دەڵێ تاوێک دەگەڵی بووم، وەهای گوت و وەهای کرد. بێشک ئەو شایەتییە مەقبووڵە، چونکە بۆ مرۆڤ دەگونجێ.

نووکە، ئەی سەگ، ئەوە کە شایەتی لە سازکراو دەدەی هاسانترە لەوەی کە تۆ شایەتی لە قەدیمی بوونی عالەم دەدەی. چونکە ئاکامی شایەتییەکەت ئەمەیە کە «سازکراو نیە » کەوایە شایەتییت لە سەر رەد داوە. کەوایە چونکە بۆ هەردووکیان بەڵگەیەکت بە دەستەوە نیە و نەتدیوە کە عالەم سازکراوە یا قەدیمە. تۆ دەڵێی «چۆنت زانی کە سازکراوە؟ » ئەویش دەڵێ « قورمساغ، تۆ چۆنت زانی کە قەدیمە؟ » ئاخر، ئیدعای تۆ زەحمەتترە و مەحاڵتر. »

## له هەر ئەنبارەی، مشتێک!

شێخ ئیبراهیم گوتی كه « سەیفەددین فەرروّخ كاتێک له كەسێكی دەدا، خوّی به كەسێكی دیكەوه خەریک دەكرد به قسه، هەتا ئەوان خەریكی تێهەڵدانی بان و شەفاعەتی كەس بەم شێوەیه نەدەچوه پێش. »

فەرمووی كه « هەرچی دەم عالەمه دا دەیبینی، لەو عالەمیش وەهایه، بەڵكه ئەمانه هەمووی نموونەكانی ئەو عالەمن و هەرچی دەم عالەمه دا هەیه، لەو عالەمه هێناویانه. عەتتارەكان تاسێكی چووک له سەر سندووقەكان و دەرمانه جوّراوجوّرەكان دادەنێن ـ له هەر ئەنبارەی، مشتێ: مشتێک بیبار و مشتێک بنێشت. ئەنبارەكان بێنەهایەتن بەڵام له سندووقەكانی ئەو دا پتر لەوه ناگونجێ. كەوایه مروّڤ وەک تاسێكی چووک یان دوكانی عەتتارییه ـ كه دەو دا له خزێنەی سفەتەكانی هەق، مشت مشت و كوت كوت له هوّققه و سندووقەكانیان ناوه هەتا لەم عالەمه دا تەجارەتی پێبكەن ـ لایقی خوّیان. له ژنەوایی كوتێک، له بینایی كوتێک، له ئەقڵ كوتێک، له كەرەم كوتێک و له عیلم كوتێک. نووكه، كەوایه خەڵک، تەوافكەرانی هەقن: تەواف دەكەن، شەو و روّژ سندووقەكان پڕ دەكەن و توّ بەتاڵی دەكەی یا زایەی دەكەی هەتا كاسبی پێوەبكەی. به روّژ بەتاڵی دەكەی و شەو دیسان پڕی دەكەنەوه و قەوەتت دەدەنێ. بوّ وێنه رووناكی چاو دەبینی؟ لەو عالەمە، دیده و چاو و نەزەری جواروجوّر هەیه، لەوان، نموونەیەكیان بوّ توّ نارد هەتا سەیری دونیای پێبكەی. دید ئەوەنده نیه بەڵام مروّڤ لەوه پتر تاقەتی ناگرێ: « ئەم سفەتانه، گشتی لای ئێمەیه بێنەهایەت، له قەدەر دیاریكراو بوّتی دەنێرین! » كەوایه خوّت بیری لێبكەوه: چەند هەزار خەڵک، سەده به سەده، هاتن و لەم دەریایه پڕ بوون و دیسان بەتاڵ بوونەوه! بڕوانه كه دەبێ چ ئەنبارێک بێ!

نووكه، هەركەس پتر ئاگاداریی لەو دەریایه هەبێ، دڵی له سندووقەكان ساردتر دەبێتەوه. كەوایه دەڵێی عالەم لەو سككەخانەیه دێته دەر و دیسان دەگەڕێتەوه زەڕابخانەكەی. ـ انالله و انا الیه راجعون ـ تەواوی ئەندامەكانی ئێمه لەوێوه هاتوون و نموونەی وێن و دیسان دەگەڕێنەوه وێ ـ له چووک و گەوره و حەیوانەكانەوه. بەڵام لەم سندووقه دا زوو دەردەكەن و بەبێ سندووق دەرناكەون.

لەبەر ئەوەیە کە ئەو عالەمە لەتیفە و وەبەر چاو نایە. پێت سەیرە؟ نابینی شنەی بەهار چۆن دەردەکەوێ لە درەخت و شیناوەرد و گوڵشەن و بێستان؟ جەمالی بەهار بە هۆی ئەوانەوە سەیر دەکەی و کاتێک سەیری پشووی شنەی بەهار دەکەی، هیچ نابینی، نەک لەبەر ئەوە کە سەیران و گوڵشەنی نیە. ئاخر، لەبەر ئەوە نیە! بەڵکە پڕ لە شەپۆلی گوڵشەن و بێستانەکانە. بەڵام شەپۆلەکان لەتیفن، وەبەر چاو نایەن، ئیللا بە هۆیەک نەبێ لوتف دەرناکەوێ. هەروەتر، دە مرۆڤ دا، ئەم وەسفانە شاراوەن، دەرناکەون ـ ئیللا بە هۆیەکی دەروونیی یا دەرەوەیی، بە هۆی قسەی کەسێک و ئازاری کەسێک و شەڕ و ئاشتی کەسێک دەردەکەوێ.

سفەتەکانی مرۆڤایەتی دە خۆت دا نابینی. رادەمێنی، هیچ نادۆزیەوە و خۆت بە بەتاڵ دەبینی لەم سفەتانە. ئەوە نیە کە تۆ گۆڕابی، ئیللا ئەوانە دە تۆ دا شاراوەن، وەک ئاون دە دەریا دا. لە دەریا نایەنە دەر، ئیللا بە هۆی هەورێک نەبێ، ئیللا بە شەپۆلێک نەبێ، دەرناکەون. شەپۆل کوڵ و کۆی دەروونی تۆیە: دەردەکەوێ بێ هۆیەکی دەرەوەیی، بەڵام مادام دەریا ئارامە، هیچ نابینی. لەشی تۆ بەستێنی دەریایە و گیانی تۆ دەریایەکە. نابینی کە چەند هەزار ماسی و مار و مەل و خەڵکی جۆراوجۆری لێدەردەکەون و خۆیەک دەنوێنن و دیسان دەچنەوە نێو دەریاوە؟ سفەتەکانی تۆ ـ وەک تووڕەیی و ئێرەیی و شەهوەت و غەیرە ـ لەم دەریایە سەر دەردەکێشن. کەوایە دەڵێی سفەتەکانی تۆ ئاشقانی هەقن ـ ناسکن. ناکرێ ئەوان ببینین، ئیللا بە هۆی جلی زمانەوە نەبێ. کە رووت بنەوە، لەبەر رادەی ناسکیی وەبەر چاو نایەن.

## کڵ و کۆڵەکەی دونیا غەفلەتە!

لە پێشدا کە شێعرمان دەگوت، هانەیەک بوو مەزن، هۆی گوتن. ئەودەم ، گەلێک شوێنی داخست و ئێستاش کە هانە سست بوە و خەریکی ئاوا بوونیشە، گەلێک شوێن دادەخا. سوننەتی هەقتەعالا وەهایە کە شتەکان لە سەردەمی ئەنگووتن و سەردەرکردن تەربیەت دەکا و لەو گەلێک شوێنەواری مەزن و حیکمەت پەیدا دەبێ و لە سەردەمی ئاوابوونیش، هەمان تەربیەت قایمە.

موعتەزەلە* دەڵێن کە « خوڵقێنەری کردەوەکان بەندەیە و هەر کردەوەیەک کە لەو دەردەکەوێ، بەندە خوڵقێنەرەی ئەو کردەوەیەیە. » ناکرێ وا بێ! چونکە ئەو کردەوەی کە لەو دەردەکەوێ یا بە هۆی ئەم ئامرازانەوە کە هەیەتی ـ وەک ئەقڵ و رووح و قەوەت و لەش ـ یا بەبێ هۆ. ناکرێ ئەو خوڵقێنەری کردەوەکانی بێ بە هۆی ئەمانەوە: چونکە ئەو قادر نیە لە کۆ کردنەوەی ئەمانە. کەوایە ئەو خوڵقێنەری کردەوەکانی نیە بە هۆی ئەو ئامرازانەوە. لەبەر ئەوە کە ئەو ئامرازەش مەحکوومی ئەو نیە و ناکرێ کە بێ ئەم ئامرازە، خوڵقێنەری کردەوە بێ. چونکە مەحاڵە کە بێ ئەم ئامرازە، کردەوەیەک لەو سەر بدا. کەوایە زانیمان خوڵقێنەری کردەوەکان هەقە، نەک بەندە.

هەر کردەوەیەک ـ چ خێر چ شەڕ ـ کە لە بەندە دەردەکەوێ، ئەو لەبەر نیەت و مەبەستێک دەیکا. بەڵام حیکمەتی ئەو کارە ئەوەندە نیە کە ئەو پێیوایە. ئەوەند مانا و حیکمەت و فایدە کە ئەو لەو کارە پێیگەیشت، فایدەکەی ئەوەندە بوو کە ئەو کردەوە لەو دەرکەوت، دەنا فایدەی کوللی خودا دەیزانێ کە چ بەروبوویەکی لێ دەست دەکەوێ. بۆ وێنە نوێژ دەکەی بەم نییەتە کە خێرت پێبگا لە ئاخیرەت و خۆشناو و لە ئەمان دابی دە دونیا د. بەڵام فایدەی ئەم نوێژە ئەوەندە نیە، سەدهەزار فایدەی دەدا کە بە مێشکی تۆ دا نایە. ئەو فایدانە خودا دەیزانێ کە بەندە بۆ ئەو کارە هان دەدا.

مرۆڤ لە دەست قەبزەی دەستەڵاتی هەق دا، هەروەک کەوانێکە و هەقتەعالا ئەو بە کارەکانیەوە خەریک دەکا و کارا لە راستی دا هەقە، نەک کەوان. کەوان ئامراز و هۆیە، بەڵام بێخەبەرە و غافڵ لە هەق ـ بۆ پێگەیشتنی دونیا. خۆزگە بە کەوانێک ئاگادار بێ کە « من لە دەست کێ دام! »

چ بڵێم لە دونیایەک کە کڵ و کۆڵەکەی ئەو غەفلەتە؟ نابینی کاتێک کەسێک وە ئاگا دێنی، لە دونیا بێزار دەبێ و سارد دەبێتەوە چونکە دەزانی کە دە خەو دابوە. مرۆڤ لە بچووکییەوە کە هەڵیداوە، لەبەر غەفلەت بوە، دەنا قەت هەڵینەدەدا و گەورە نەدەبوو. کەوایە چونکە ئەو بە هۆی غەفلەت ساز کرا و گەورە کرا، دیسان هەقتەعالا رەنج و خەباتی ـ بە جەبر و بە ئیختیار ـ لە بەر نا، هەتا ئەو غەفلەتانەی لێ بسترێ و خاوێنی کاتەوە. دوای ئەوە، دەتوانێ ئەو عالەمە بناسێ.

وجوودی مرۆڤ وەک سەرانگوێلکە ـ کۆمایەک شیاکە. ئیللا ئەم کۆما شیاکە ئەگەر ئازیزە، لەبەر ئەوەیە کە ئەنگوستیلەی پادشای تێدایە.

هەروەتر، وجوودی مرۆڤ هەروەک جەواڵی گەنمە. پادشا هەرا دەکا کە « ئەو گەنمەی بۆ کوێ دەبەن؟ ـ کە پێوانەکەی منی تێدایە. »

ئەو لە پێوانەکە غافڵە و نوقمی گەنمە. ئەگەر ئاگای لە پێوانە با، کەی مەیلی گەنمی دەکرد؟

نووکە، هەر بیرێک کە تۆ بۆ عالەمی باڵا دەکێشێ و لە عالەمی خواروو سارد و سستت دەکا، وێنە و تیشکی ئەو پێوانەیە کە دەردەکەوێ: مرۆڤ مەیلی ئەو عالەمە دەکا و ئەگەر مەیلی عالەمی خواروو بکا، نیشانەکەی ئەوەیە کە ئەو پێوانەیە لە پەردە دا شاراوەیە.

عارفێک گوتی چوومە تونخانەیەک دڵم بکرێتەوە ـ کە دەرووی دەرباز بوونی گەلێک ئەولیا بوە. دیتم وەستای تونخانە شاگردێکی هەبوو، خۆی لێهەڵماڵیبوو کاری دەکرد و ئەو پێیدەگوت کە ئەمە بکە و ئەوە بکە! ئەو بە دەستوبرد کاری دەکرد.

تونچی خۆشی لە دەستوبردیی ئەو بۆ بەجێ هێنانی فەرمان، هات. گوتی «ئادی، وەها بە دەستوبرد بە! ئەگەر هەمیشە چوست و چالاک بی و ئەدەب راگری، پلەی خۆم دەدەم بە تۆ و تۆ لە جێی خۆم دادەنێم. »

من پێکەنینم هات و گریمانەی دڵم کراوە. دیتم سەرۆکەکانی ئەم عالەمە هەموو لە سەر ئەو سفەتەن دەگەڵ نۆکەرەکانی خۆیان.

* فرقەیەکی ئیسلامی کە لە سەرەتای سەدەی دووهەمی کۆچی لە لایەن واصل بن عطا شاگردی حەسەنی بەسریی پێکهات. ئەم فرقەیە ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتییان دە بیروباوەڕی موسڵمانان دا پێکهێنا و خەڵکیان لە زانست و فەلسەفە نزیک کردەوە و بۆ سەلماندنی بیروباوەڕیان کەلکیان لە فەلسەفە و مەنتق و ئەقڵ وەردەگرت.

# بناغەی عالەم، غەفلەتە!

« خاترت چۆنە؟ خۆشە یا نا؟ » چونکە خاتر شتێکی ئازیزە. هەروەک داوە. داو دەبێ ڕێکوپێک بێ، هەتا راو بگرێ. ئەگەر خاتر ناخۆش بێ، داو پساوە و بە کار نایە. کەوایە دەبێ دۆستایەتی لە هەق کەسێک دا زێدەڕەویی نەبێ و دوژمانیەتیش زێدەڕەویی نەبێ ـ کە لەم دوانە ـ داو دەپسێ. دەبێ لە ناویین دابێ ئەم دۆستایەتییە ـ کە بە زێدەڕەویی سەر ناگرتێ.

لە هەق غـــــەیری هەق دا وەها دەڵێم، بەڵام لە هەق باری تەعــــالا دا، هیچ زێدەڕەوییەک نیە. خۆشەویستی هەرچی پتر، باشتر.

چونکە خۆشەویستی غەیری هەق ئەگەر زیدەڕەویی تێدا بکەی، خەڵک لە ژێر دەستـەڵاتی چەرخی فەلەک دان و چەرخی فەلەکیش دەگەڕێ و ئەحواڵی خەڵکیش دەگەڕێ. کەوایە ئەگەر لە دۆستایەتی کەسێک دا زێدەڕەویی بکەی، هەمیشە سەربەرزیی و بەختی ئەو داوا دەکەی و ئەوەش ناگونجێ. کەوایە خاتر دەشێوێ. ئەگەر دوژمنایەتییش زێدەڕەویی تێدا بکرێ، هەمیشە نەحس و نەکبەتی ئەوت دەوێ و چەرخی فەلەک دەگەڕێ و ئەحواڵی ئەویش دەگەڕێ ـ دەمێک بەخت و دەمێک بێ بەخت. ئەوەش کە هەمیشە بەختی نەبێ، ناگونجێ. کەوایە خاترت پەرێشان دەبێ.

بەڵام خۆشەویستی لە هەق باری دا، لە هەموو عالەم و خەڵک دا، لە گاور و جوولەکە و فەلە و تەواوی بوونەوەران دا، شاراوەیە. کەسێک پێکهێنەری خۆی چۆن خۆش ناوێ؟ دۆستایەتی دەو دا شاراوەیە، ئیللا بەرگرەکان دایدەپۆشن. ئەگەر بەرگرەکان نەمێنن، ئەو خۆشەویستییە دەردەکەوێ. نەک هەر بوونەوەرەکان، تەنانەت عەدەمیش لە جۆش و خرۆش دان، بۆ ئەوەی کە ئەوان پێکبێنێ. هەر ئەوجۆرەی کە چوارکەس لە پێش پادشایەک بە سەف وەستاون. هەرکام دەیەوێ و چاوەڕوانە کە پادشا پلە و پایەکە بەو بسپێرێ و هەرکام لە یەکتر شەرمەزارن. چونکە داواکەی ئەو دژی ئەوی دیکەیە. کەوایە عەدەمەکان چونکە داواکاری خوڵقان لە هەقن، ریزیان بەستوە کە « بوونم بدەیە » و وەپێش کەوتنی بوونی خۆی دەوێ لە خودا، کەوایە لە یەکتر شەرمەزارن. نووکە، عەدەمەکان کە وەها بن، بوونەوەران چلۆن دەبن؟

ئەم ماڵە لە سەر غەفلەت بنیات نراوە و بناغەی هەموو عالەم و شتەکان لە سەر غەفلەتە. ئەم لەشەش کە هەڵیداوە، لە غەفلەتەوەیە. غەفلەتیش کفرە و دین بێ کفر، مومکین نیە. چونکە دین تەرکی کفرە. کەوایە دەبێ کفرێک هەبێ هەتا بتوانی تەرکی بکەی. کەوایە هەردووک یەک شتن ـ چونکە ئەمە بێ ئەو نیە و ئەو بێ ئەم نیە. لێک جیا نین و خوڵقێنەرەکەشیان هەر یەکێکە ـ ئەگەر خوڵقێنەرەکەیان یەکێک نەبا، جیاواز دەبوون، چونکە هەرکام شتێکیان دەخوڵقاند و جیاواز دەبوون. کەوایە چونکە خوڵقێنەرەکەیان یەکێکە، وحدە لا شریک ـ هیە.

گوتیان کە « سەید بورهانەددین قسەی باش دەکا، بەڵام شێعری سەنایی لە قسەکانی دا زۆر دێنێتەوە. »

فەرمووی « وای دانێین کە بڵێن: هەتاو باشە، بەڵام شۆقی هەیە! ئەمە عەیبە؟ چونکە قسەی سەنایی هێنانەوەیە، نواندنی ئەو قسەیە، هەتاو شتەکان دەنوێنێ و لەبەر شۆقی هەتاو دەتوانن ببینن.

مەبەست لە شۆقی هەتاو ئەوەیە کە شتەکان بنوێنێ. ئاخر، ئەم هەتاوە شتی وا دەنوێنێ کە بە کار نایەن. هەتاوێک کە شتی وا بنوێنێ کە بە کار بێ، هەقیقەتی هەتاوی ئەوە و ئەم هەتاوە فەرع و مەجازی هەقیقییە. ئاخر، ئێوەش بە قەد بەشە ئەقڵی خۆتان لەم هەتاوە وەردەگرن و داوای شۆقی زانست دەکەن کە ئێوە بتوانن شتی هەستپێنەکراوی پێ ببینن و زانستتان زیاد بێ. لە هەر مامۆستا و لە هەر یارێک چاوەڕوانی ئەوەن کە شتێکی لێ فێر بن و تێبگەن.

کەوایە زانیمان کە هەتاوێکی دیکە هەیە جگە لە هەتاوی رواڵەت کە بە هۆی ئەوەوە پەی بە هەقیقەتەکان و ماناکان دەبەن. ئەم بەشە زانستەی کە تۆ پەنای بۆ دەبەی و پێیخۆش دەبی، فەرعی ئەو زانستە گەورەیە و تیشکی ئەوە. ئەو تیشکە تۆ بەرەو ئەو زانستە گەورە و ئەو هەتاوە ئەسڵە دەبا. تۆ ئەو زانستە بەرەو خۆت رادەکێشی. ئەو دەڵێ کە « من لێرە ناگونجێم و تۆ درەنگ دەگەیە وێ. گونجانی من لێرە مەحاڵە و هاتنی تۆ بۆ وێ سەختە. پێکهێنانی مەحاڵ، مەحاڵە بەڵام پێکهێنانی سەخت، مەحاڵ نیە.

کەوایە ئەگەر سەختە، هەوڵ بدە هەتا بە زانستی گەورە بگەی و چاوەڕوان مەبە کە ئەو لێرە بگونجێ ـ چونکە مەحاڵە.

هەروەتر دەوڵەمەندەکان، لە خۆشەویستی  دەوڵەت و سامانی هەق، پارە لە سەر پارە کۆ دەکەنەوە و کیسە لە سەر کیسە، هەتا سفەتی دەوڵەمەندییان تێداپێکبێ لە تیشکی سامان. تیشکی سامان دەڵێ « من بۆ ئێوە جارِدەری ئەو سامانە گەورەم: من بۆ ئێرە رادەکێشن؟ ـ کە من لێرە ناگونجێم. ئێوە بۆ لای ئەم سامانە وەرن! »

بە گشتی، ئەسڵ ئاقیبەتە. ئاقیبەتتان پیرۆز بێ! پیرۆز ئەوەیە، درەختێک کە ریشەکەی ئەو لەو باغە دا بنەگر بێ و لک و پۆیەکانی ئەو، بەرەکانی ئەو، لە شوێنێکی دیکە شۆڕ بووبێتەوە و بەرەکانی وەریبێ، ئاقیبەت ئەو بەرانە دەبەنەوە ئەو باغە. چونکە ریشە لەو باغەیە. ئەگەر بە پێچەوانە بێ، هەرچەند بە رواڵەت حەمد و سپاس دەکا چونکە ریشەکەی دەم عاڵەمە دایە، هەموو بەرەکانی ئەوە کە بۆ ئەم عالەمەی دێنن. ئەگەر هەردووک دەو باغەی دابن، دەبێتە نووری عەلا نوور.

# قسه لە قەدەر مرۆڤ دێ!

کەسێک وە ژوور کەوت.

فەرمووی کە « ئەو خۆشەویست و خۆبەکەمزانە و ئەمەش دە زاتی دایە! » هەر ئەوجۆرەی کە لقێک بەری زۆر بێ، ئەو بەرانە ئەو دادەنوێنن و ئەو لقەی کە بەری نەبێ سەری لە سەرە ـ هەروەک سپیدار. و ئەگەر بەر لە رادە تێپەڕی، ئەستووندەکی وەبەر دەنێن هەتا بە تەواوەتی دانەکەوێ.

پێغەمبەری مەزن خۆبەکەمزان بوو، چونکە هەموو بەری عالەم، یەکەم و ئاخر، دەو دا کۆ کرابۆوە ـ بە ناچار، لە گشت کەس خۆبەکەمزانتر بوو. قەت کەسێک بەر لە پێغەمبەر نەیدەتوانی سڵاو لە پێغەمبەر بکا، چونکە پێغەمبەر پێشتر دەریدەبڕی، لەبەر رادەی خۆ بە کەم زانین، سڵاوی دەکرد و ئەگەر بە هەڵکەوت زووتر سڵاوی نەکردبا، دیسان خۆبەکەمزان بوو و پێشەوا لە کەلام دا ئەو بوو، چونکە ئەوان سڵاو لەو فێر ببوون و لەویان بیستبوو.

هەرچی یەکەمینەکان و ئاخرینەکان هەیانە، هەمووی لە وێنەی ئەویان هەیە و سێبەری ئەون. ئەگەر سێبەری کەسێک بەر لەو وە ماڵ کەوێ، بەر لەو بێ، لە راستی دا ـ هەرچەند سێبەر لە پێشەوەیە، بە رواڵەت. ئاخر سێبەر لەو وەپێش کەوت، فەرعی ئەوە. و ئەم ئەخلاقە هی ئێستا نیە. لەو دەمەوە دە زەڕڕەکانی ئادەم دا، دە ئەندامەکانی ئەو دا، ئەم زەڕڕانە هەبوون ـ هەندێک روون و هەندێک نیوەڕوون و هەندێک تاریک. ئەم دەمە ئەو دەردەکەوێ، بەڵام ئەم درەوشاوەیی و رووناکی پێشەوەیە و زەڕڕەی ئەو دە ئادەم دا لە گشتیان سافتر و رووناکتر و خۆبەکەمزانتر بوو.

هەندێک لە یەکەم دەڕوانن و هەندێک دەڕواننە ئاخر. ئەوانەی کە دەڕواننە ئاخر، ئازیزتر و گەورەترن ـ چونکە نیگایان لە ئاقیبەت و ئاخیرەتە. ئەوانەی کە سەیری یەکەم دەکەن. ئەوان تایبەتترن. دەڵێن چ حەوجێ سەیری ئاخر بکەین؟ چونکە گەنمیان داچاندوە لە پێشدا، جۆ لە ئاخر شین نابێ. و ئەوەی کە جۆی داچاندوە، گەنم بەر ناهێنێ. کەوایە نیگای ئەوان لە یەکەمە. قەومێکی دیکە تایبەتترن ـ کە نە چاو لە یەکەم دەکەن و نە لە ئاخر. ئەوان یەکەم و ئاخریان وە بیر نایە. نوقمی

هەقن. و قەومێکی دیکە هەیە کە نوقمن دە دونیا دا: سەیری یەکەم و ئاخر ناکەن. لە ئاکام غافڵن. ئەوان دەستەچیلەی دۆزەخن.

کەوایە دەرکەوت کە ئەسڵ مەحەممەد بوە کە [ ئەگەر تۆ نەبای فەلەکەکانمان نەدەخوڵقاند*] و هەر شتێک کە هەیە، لە شەرەف و خۆ بە کەم زانین و حیکمەت و پلەی بەرز، هەموو بەخشینی ئەوە و سێبەری ئەوە ـ چونکە لەوەوە پەیدا بوە. هەر ئەوجۆرەی کە هەرچی ئەم دەستە بیکا لە سێبەری ئەقڵەوە دەیکا ـ چونکە سێبەری ئەقڵ لە سەر ئەوە، هەرچەند کە ئەقڵ سێبەری نیە، بەڵام ئەو سێبەری هەیە، بەبێ سێبەر. ئەو جۆرەی کە مانا، بوونی هەیە بەبێ بوون. ئەگەر سێبەری ئەقڵ لە سەر مرۆڤ نەبێ، هەموو ئەندامەکانی لە کەلک دەکەون: دەست چەپەوانە وەردەگرێ، پێ بە رێی راست دا ناتوانێ بڕوا، چاو هیچ نابینێ، گوێ هەرچی ببیسێ خراپ دەیبیسێ. کەوایە لە سێبەری ئەقڵ دا، ئەم هەموو ئەندامانە هەموو کارەکان دروست و بە رێکوپێکیی و بە باشیی جێبەجێ دەکەن و لە راستی دا، هەموو ئەو کارانە لە ئەقڵەوە دێن، ئەندامەکان ئامرازن.

هەروەها، پیاوێک مەزن بێ، خەڵیفەی زەمان. ئەو هەر وەک ئەقڵی کوللە. ئەقڵەکانی خەڵک وەک ئەندامەکانی ئەون. هەرچی بکەن، لە سێبەری ئەوەوەیە و ئەگەر خراپەیەک لەوانەوە بێ لەبەر ئەوەیە کە ئەو ئەقڵە کوللە سێبەری لە سەر ئەو لابردوە. وەها کە پیاوێک گەر دەست بە شێتایەتی بکا و کاری ناڕەوا رەچاو بکا، هەموو لێیان روون دەبێتەوە کە ئەقڵ لە سەری دەرچوە و سێبەری ناخاتە سەر ئەو و لە سێبەر و پەنای ئەقڵ دوور کەوتۆتەوە.

ئەقڵ لە جنسی فریشتەیە. هەرچەند فریشتە روخساری هەیە و پەڕوباڵی هەیە و ئەقڵ نیەتی. بەڵام لە راستی دا یەک شتن و یەک کار دەکەن و یەک مەیلیان هەیە. نابێ سەیری روخسار بکەی، چونکە لە راستی دا یەک کار دەکەن. بۆ وێنە ئەگەر روخساریان بتوێتەوە، بە تەواوەتی دەبێتە ئەقڵ، لە پەڕوباڵیان چ نامێنێتەوە. بەوان دەڵێن ئەقڵی نەقشکراو. وەها کە لە مۆم مەلێک ساز بکەن بە پەڕ و باڵەوە، بەڵام ئەو هەر ئەو مۆمەیە. نایبینی کە دەیتوێنیەوە، ئەو پەڕ و باڵ و سەر و پای مەلە لەپڕ دەبێتە مۆم و هیچ شتێکی زیدە لەو نامێنێتەوە؟ بە تەواوەتی دەبێتە مۆم. کەوایە زانیمان مۆم هەمانە و مەلێک کە لە مۆم سازی دەکەن هەمان مۆمە: نەقشکراو، نەقشی گرتوە. دەنا مۆمە و هەروەتر سەهۆڵیش هەمان ئاوە و کاتێک بتوێتەوە، دەبێتەوە هەمان ئاو. بەڵام بەر لەوەی کە ببێتە سەهۆڵ و ئاو بوو، کەس نەیدەتوانی

ئەو دە دەست دا رابگرێ و خـۆی وە دەســتــەوە نەدەدا، بـەڵام کـە بوو بە ســەهۆڵ، دەکـرێ بە دەسـتـەوەی بگری و دە داوێنی بنێی. کەوایە لـەمـە پتـر فـەرق نیـە. بەڵام سەهۆڵ هەمان ئاوە و یەک شتن.

ئەحـواڵی مـرۆڤـیش وەهایە کـە باڵی فـریشـتـەیان هێناوە و لـە کلکی کـەرێکیـان بەستوە هەتا بەشکەم ئەو کەرە لە شـۆق و کەلامی فریشتـە ببێتە فریشتـە. چونکە لەوانەیە کە کەر ببێتە هاورەنگی ئەو و ببێتە فریشتە و پێت سەیرە کە ببێتە مرۆڤ؟ خـودا قادر بە سـەر هەمـوو شـتێکە. ئاخـر، ئەم سـاوایە کە لە پێشدا دەیزێن، لە کـەر خـرابتـرە: دەست دە پیسایی دەنـێ و بۆ زاری دەبا هـەتا بیلێسـێتـەوە. دایک لێیـدەدا هەتا بەری بگرێ. کەر دیسانیش جۆرێک خاوێنە. وەختایەک میز دەکا، پاشـووکانی لێک دەکـاتەوە هـەتا مـیـز پێـیـدانـەتکێ. چۆن ئەو منداڵەی کـە لە کـەر خـرابتـرە، هەقتەعالا دەتوانێ بیکاتە مرۆڤ، گەر کەر بکاتە مـرۆڤ، پێت سەیرە؟ لای خودا هیچ شتێک سەیر نیە.

لە قیـامەت دا، هەموو ئەندامـەکانی مرۆڤ، یـەک یەک، جیا جیـا، لە دەست و پێ و غەیرە، قسـە دەکەن. فـەلسـەفییـەکان لەمە رادەمێن کە دەست چلۆن قسـە دەکا؟ ـ مـەگەر لە سـەر دەست عـەلامەت و نیـشـانـەیەک پەیدا بێ کە ئـەو لەبری قسـە بێ: هـەر ئەوجـۆرەی کە برینێک یا کـوانێک لە سـەر دەست دێ، ئایا دەکرێ بڵێین دەست قسـە دەکـا. خـەبەر دەدا کـە « گـەرمـیم خـواردوە کـە دەسـتم وەهای لێـهاتوە » یا دەست بریندار بێ یا رەش هـەڵگەڕابێ، دەڵێن کە دەست قسـە دەکا، رادەگەیەنێ کـە « کێردم وێکەوتوە یا خــۆم لە مــەنجــەڵی رەش خـشــاندوە. قــســە کــردنی دەست و بـاقی ئەندامەکان بەم چەشنە دەبێ. سـونییەکان دەڵێن کە حـاشا و کلا، دەبێ ئەم دەست و پێیە بە ئاشکرا قسە بکەن ـ وەها کە زمان دەیڵـێ.

لە رۆژی قیامەت دا، مرۆڤ مونکیر دەبێ کە « من نەمدزیوە! »

دەست دەڵێ « با دزیت، من هەڵمگرت » بە زمانێکی ئاشکرا.

ئەو کـەســە روو دە دەست و پێ دەکـا کـە « تۆ قـســەت نەدەکـرد. چلۆن وە قـســە کەوتی؟ »

دەڵێ کە « ئەو کەسە منی وە قسـە هێنا کە هەمـوو شتێک وە قسە دێنێ، دەرک و دیوار و بەرد و گڵمـەت وە قسە دێنێ. ئەو خوڵقێنەرەی کـە نوتق بە گشت دەبەخشێ، منیشی وە نوتق خست. »

وەها کــە زمــانی تۆی وە نـوتق خـست. زمــانی تۆ پلە گــۆشــتــێک، دەست پلە گۆشتێک. قسە کردنی پلەگۆشتی زمان چۆن ئەقڵ دەیبڕێ؟ لەوەی کە گەلێکت دیوە بۆ تۆ مەحاڵ نیە، دەنا لای هەق زمان بیانوویە: کە پێیفەرموو « قسە بکە! » قسەی کرد و بە هەرچی بفەرموێ و حوکم بکا، قسە دەکا.

قسە لە قەدەر مرۆڤ دێ. قسەی ئێمە وەک ئاوێکە کە میراو بەری بەر دەدا. ئاو چووزانێ کە میراو بۆ کام دەشتی روانە دەکا؟ ـ بۆ بێستانی خەیار یا کەلەم یا پیاز یا گوڵستانێک؟ ئەمە دەزانم کە: ئەگەر ئاو زۆر بێ، دیارە لەوێ زەوی و زاری تینوو زۆرن و ئەگەر کەم بێ، تێدەگەم کە زەوییەکە هەندە نیە. باغچەیە یا چواردیوارییەکی چووکە. من کەوشدرووم. چەرم زۆرە. ئیللا لە قەدەر پای دەبڕم و دەیدرووم.

لە زەوی دا، گـیـاندارێکی چووک هەیە کـە دەخـزێتـە ژێر زەوی و لە تاریکی دا دەژی. ئەو چاو و گوێی نیە. چونکە لەو جێگایەی ئەو دەژی، موحتاجی چاو و گوێ نیە. چونکە پێویستی پێی نیە. چاوی بۆ بدەنێ؟ وانیە کە خودا چاو و گوێی کەمە یا بەخیلی دەبا، ئیللا ئەو شتێک بە حاجەت دەدا. شتێک کە بەبێ حاجەت بیدا، لە سەری دەبێتە بار. حیکمەت و لوتف و بەخشینی هەق بار هەڵدەگرێ ـ کوا بار لە کەسێک دەنێ؟ بۆ وێنە ئامێری دارتاش ـ لە تەشوێ و مشار و بڕبەند و غەیرە ـ بیدە بە جلدروویەک کــە « ئەمــانە بگرە » ئەوان لە ســەری دەبنە بار. چونکە ناتوانێ کەلکیان لێوەرگرێ. کەوایە شت بە حاجەت دەدا، هەتا بمێنێتەوە. هەر ئەوجۆرەی کە ئەو کرمانە، لە ژێر زەوی، لەو تاریکاییە دا دەژین، خەڵکن دە تاریکی دا: لەم عالەمە قانع و رازی، موحتاجی عالەمی دیکە و تاسەباری دیدار نین. ئەوان چاوی بینا و گوێی وریایان بۆ چیە؟ کاری ئەم عالەمە بەم چاوەیان جێبەجێ دەبێ و چونکە تەمای ئەولایان نیە. ئەو بینایيە چلۆن دەدەن بەوان، چونکە بە کاریان نایە؟

نووکە، عالەم قایم بە غافڵ بوونە ـ کە ئەگەر غافڵان نەبێ، ئەم عالەمە نامێنێتەوە. تاسەی خودا و یادی ئاخیرەت و مەستیی و خۆشیی، مێعماری عالەمی دیکەیە. ئەگەر هەموو رووی تێبکەن بە تەواوەتی دەچینە ئەو عالەمە و لێرە نامێنینەوە و هەقتەعالا دەیەوێ کە لێرە بین. هەتا دوو عالەم هەبێ. کەوایە دوو کوێخای دەسنیشان کردوە: یەکیان غافڵ بوون و یەکێک بە ئاگا بوون. هەتا هەردووک ماڵ ئاوەدان بمێنێتەوە.

* لولاک ما خلقت الافلاک

# ئەهلی دۆزەخ لە دۆزەخ خۆشترن!

ئەهلی دۆزەخ لە دۆزەخ خۆشترن هەتا لە سەر دونیا، چونکە لە دۆزەخ لە هەق خەبەردار دەبن و دە دونیا دا بێخەبەرن لە هەق و شتێک شیرینتر لە خەبەردار بوونی هەق نیە. کەوایە لەوەی کە ئارەزووی دونیا دەکەن، بۆ ئەمەیە کە کارێک بکەن هەتا لە کانگای لوتف خەبەردار بن، نە ئەوەی کە دونیا خۆشترە لە دۆزەخ.

مونافقەکان لەبەر ئەوە دەنێرنە بنی دۆزەخ هەتا بەو ئیمان بێنن، کفری ئەو بەهێز بوو و کاری تێنەکرد: ئەو عەزابی سەختتر دەبێ هەتا لە هەق خەبەردار بێ. کافر ئیمانی پێنەهێنا، کفری ئەو لاوازە. بە عەزابێکی چووک خەبەری دەبێتەوە. هەروەک مێزەرێک کە تۆزاوی بێ و فەرشێک کە تۆزاوی بێ: مێزەر کەسێک هەندێکی راوەشێنێ، خاوێن دەبێتەوە. بەڵام فەرش بە چوار کەسان دەبێ توند رایتڵەکێن هەتا تۆزی بتەکێ.

« قورئان » هەروەک بووکێکە. هەرچەند تاراکەی راکێشی، رووی خۆ نیشانی تۆ نادا. ئەمە کە بەحسی قورئان دەکەی و خۆشیی و کەشفێکت دەست ناکەوێ، لەبەر ئەوەیە کە تارا کێشانی تۆ رەد دەکاتەوە و مەکر دەکا و خۆی ناحەز بە تۆ نیشان دەدا ـ یانی « من ئەو جوانە نیم. »

قورئان، ئەو توانایەی هەیە هەرجۆر کە بیەوێ خۆی بنوێنێ. بەڵام ئەگەر تاراکەی رانەکێشی و رەزای ئەو بخوازی؛ برۆی و مووچەکەی بدێری، لە دوورەوە خزمەتی بکەی، ئەوەی کە رەزای ئەو پێکدێنێ هەوڵی بۆ بدەی، بێ ئەوەی پەچەی لادەی، رووی خۆی نیشان دەدا.

هەقتەعالا دەگەڵ هەرکەسێک نادوێ. هەروەک پادشاکانی دونیا دەگەڵ هەر جۆلایەک قسە ناکەن: وەزیر و جێگریان داناوە، بە هۆی ئەوانەوە رێیان دە پادشا دەکەوێ. هەقتەعالاش بەندەیەکی هەڵبژاردوە، هەتا ئەو کەسەی کە داخوازی هەقە، لەوەوە بێ و گشت پێغەمبەران بۆ ئەمە هاتوون ـ کە رێگەیەک جگە لەوانەوە نیە.

## هوالطيف!

مرۆڤ بریتییه له بیر و ئەندێشه، باقی ریشەیه و پێشه. کەلام چەشنی هەتاوە، مرۆڤ گەرم و زیندوو بەون. هەتاویش هەمیشه هەیه و حازره و هەموو هەمیشه بەو گەرمن. ئیللا هەتاویان وەبەر چاو نایه و نازانن که بەو زیندوون و گەرمن. بەڵام که به هۆی زمان و رسته ـ جا چ شوکر بێ، چ شکایەت، چ خێر، چ شەڕ ـ بکوترێ، هەتاو وەبەر چاو دێ. هەروەک هەتاوی فەلەک که هەمیشه دەدرەوشێتەوه بەڵام تیشکی وەبەر چاو نایه، هەتا وه دیوار نەکەوێ. هەروەتر، هەتا به هۆی پیت و دەنگەوه نەبێ، تیشکی هەتاوی قسه دەرناکەوێ ـ سەرەڕای ئەوه که هەمیشه هەیه. چونکه هەتاو لەتیفه و هو اللطیف. کەسافەتێکی پێویسته هەتا به هۆی ئەو کەسافەته، وەبەر چاو بێ و دەرکەوێ.

به کەسێکیان گوت « خودا » هیچ مانایەکی بۆ دەرنەکەوت. مات و داماو وەستا. که گوتیان « خودا وەهای کرد و وەهای فەرموو و وەهای نەهی کرد! » گەرم بۆوه و دیتی. کەوایه لەتافەتی هەق سەرەڕای ئەوه که هەبوو وێینەدەکەوت و نەیدەدیت. هەتا به هۆی ئەمر و نەهی و خەڵک و دەستەڵات، بۆیان لێک نەداوه، نەیتوانی ببینێ.

هی وا هەن که لەبەر زەعف، هەنگوینیان پێناکەوێ، به هۆی تەعامێکی دیکەی وەک شلەزەرد و هەڵوا و غەیره نەبێ، ناتوانێ بیخوا، هەتا بتوانێ پێیڕابێ و بگاته رادەیەک که هەنگوین بێ هۆ بخوا.

کەوایه زانیمان: نوتق هەتاوێکه لەتیف، درەوشاوه، هەمیشه بێ بڕانەوه، ئیللا تۆ موحتاجی به هۆیەکی کەسیف هەتا تیشکی هەتاو ببینی و حەزی لێوەربگری. هەتا بگاته رادەیەک که ئەو تیشک و لەتافەته بەبێ هۆی کەسافەت ببینی و خووی پێبگری و چاوی تێبڕی و هێزی لێوەرگری. ئەوسا لەو دەریای لەتافەته رەنگی سەیر و تەمەشای سەیر ببینی و ئەوەش بۆ سەیره؟ ـ که ئەو نوتقه هەمیشه ده تۆ دا هەیه، چ قسه بکەی و چ قسه نەکەی. ئەودەم که ده مێشکت دا هیچ بیرێکت نیه، هەر ئەودەم دەڵێم هەمیشه نوتق هەیه. هەروەکی گوتوویانه « الانسان حیوان ناطق » ئەم حەیوانەتییه هەمیشه ده تۆ دا هەیه، هەتا زیندووی، هەروەها پێویسته که نوتقیش هەمیشه دەگەڵ تۆ بێ. هەر ئەوجۆرەی که زۆر لەوێ مانەوه هۆی دەرکەوتنی حەیوانەتییه و شەرت نیه، وەهاش نوتق هۆی گوتن و ناڵینه و شەرت نیه.

مرۆڤ سێ حاڵەتی هەیە: یەکەم ئەوەیە کە بە دەوری خودا دا نەگەڕێ و عیبادەت و خزمەتی هەمووکەس بکا ـ لە ژن و پیاو، لە ماڵ و منداڵ، لە بەرد و خاک ـ و خودا عیبادەت نەکا. دیسان، کاتێک کە زانست و ئاگادارییەکی دەست کەوت، جگە لە خودا خزمەتی کەس ناکا، دیسانیش، ئەگەر پێشکەوتێکی هەبێ لەم حاڵەتە دا، بێدەنگ دەبێ: نە دەڵێ خزمەتی خودا ناکەم و نە دەڵێ خزمەتی خودا دەکەم ـ بەدەر لەم دوو قۆناغەیە. لەم قەومە، لە عالەم دا، دەنگێک بەرز نەبۆتەوە.

خودا نە حازرە و نە غایب و خوڵقێنەری هەردووکیانە ـ یانی حوزوور و غەیبەت. کەوایە ئەو غەیری هەردووکیانە. چونکە ئەگەر حازر بێ، دەبێ کە غەیبەت نەبێ و غەیبەت هەیە. وە حازریش نیە، چونکە عندالحضور، غەیبەت هەیە. کەوایە ئەو بە حوزوور و غەیبەت، وەسف ناکردرێ، دەنا پێویست دەکرێ کە لە دژ، دژ بزێ. چونکە لە حاڵەتی غەیبەت دا پێویست دەکرێ لە حوزووری خوڵقاندبێ و حوزوور دژی غەیبەتە. هەروەها، لە غەیبەتیش دا بەم پێودانە. کەوایە ناشێ لە دژ، دژ بزێ و ناشێ کە هەق چەشنی خۆی بخوڵقێنێ. چونکە ئەگەر بگونجێ چەشن، چەشن بخوڵقێنێ، تەرجیح پێویست دەکرێ و هەردووک دەفەوتێن.

کە گەیشتیە ئێرە، بوەستە و مەچوە پێشتر! لێرە ئەقڵ چوونە پێشی بۆ نیە. هەر کە گەیشتە بەستێنی دەریا، بوەستێ.

هەموو قسەکان و هەموو زانستەکان و هەموو هونەرەکان و هەموو پیشەکان، مەزە و چێژیان لەم قسەیە ـ کە ئەگەر ئەو نەبێ، لە هیچ کار و پیشەیەک دا مەزە نامێنێ. هەر ئەوجۆرەی کە پیاوێک ژنێکی خواستبێ ماڵدار، کە رانەمەڕ و رەوەی ئەسپ و غەیرەی هەبێ. ئەم پیاوە بەو مەڕ و ئەسپانە رادەگا و باغەکان دەدێرێ. سەرەڕای ئەوە کە خەریکی خزمەتە، مەزەی ئەو کارانەی لە وجوودی ژنەکەوە هەیە ـ ئەگەر ئەو ژنە لە ئارا دا نەمێنێ، لەو کارانە هیچ چێژێک وەرناگرێ و سارد دەبێتەوە و بێ گیان دیاری دەکا. هەروەتر، هەموو پیشەکانی عالەم و علووم و غەیرە ژیان و خۆشی و گەرمایان لە تیشکی زەوقی عارفەوە هەیە ـ کە ئەگەر زەوقی ئەو نەبێ و وجوودی ئەو، لەو هەموو کارانە دا زەوق و چێژ نادۆزێتەوە و هەموو مردوو دیاری دەکەن.

# ئیمان باشترە لە نوێژ!

پرسیاری کرد کە « لە نوێژ سەرتر چیە؟ »

« وڵامێک ئەوە کە گوتمان: گیانی نوێژ سەرترە لە نوێژ. وڵامی دووهەم: ئیمان سەرترە لە نوێژ. چونکە نوێژ پێنج کات فەرزە و ئیمان هەمیشە فەرزە. نوێژ بە بیانوویەک باتڵ دەبێ و دەکرێ درەنگتر بیکەی. ئیمان بە بارێکی دیکەش دا سەرترە لە نوێژ، کە ئیمان بە هیچ بیانوویەک باتڵ نابێ و مەودای درەنگ کردنی نیە. ئیمان بێ نوێژ قازانج دەکا و نوێژ بێ ئیمان قازانجی نیە ـ هەروەک نوێژی موونافقەکان. نوێژ لە هەر دینێک دا جۆرێکە و ئیمان لە هیچ دینێک دا ناگۆڕدرێ، ئەحواڵی ئەو و قیبلەی ئەو و غەیرە ناگۆڕدرێن.

وە جیاوازی دیکەش هەیە: بە قەدەر سەرنج و وەرگرتنی گوێگر دەردەکەوێ. گوێگر هەروەک ئاردە لای کەسێک کە هەویر دەگرێتەوە. کەلام هەروەک ئاوە دە ئارد دا. ئەوەندەی ئاو دەباڵ دەکا کە پێویستی پێیەتی. »

کەسێک بوو زۆر کز و لاواز و سیسەکە ـ هەروەک چۆلەکەیەک. زۆر سووک لەبەر چاوان، وەها کە رووناحەز بە ناحەزیی دەیانڕوانییە ئەو و شوکری خودایان دەکرد، هەرچەند بەر لە دیتنی ئەو لە ناحەزیی خۆیان سکالایان هەبوو. سەرەڕای هەموو ئەوانە [ئەو کەسە] قسەی زلی دەکرد و خۆی هەڵدەکێشا. رۆژێک لە دیوانی پادشا توانجی دە وەزیر گرت. وەزیر لێی داخدار بوو و خۆی دەخواردەوە. هەتا رۆژێک، وەزیر گەرم داهات و هاواری کرد کە « ئەی ئەهلی دیوان، ئەم فلانی فلانی فلانییە، ئێمە هەڵمانگرتەوە و بە خێومان کرد بە نان و خوان و ورکەنان و نێعمەتی ئابا و ئەژدادی ئێمە، بوو بە کەسێک هەتا گەیشتۆتە ئەو رادەیە کە وەها و وەهامان پێدەڵێ! »

بەرەو رووی هەستاوە و گوتی « ئەی ئەهلی دیوان و ئەی دەمڕاستانی دەوڵەت و ئەرکان، راست دەکا: بە نێعمەت و ورکە نانی ئەو و ئابای ئەو پەروەردە بووم و گەورە بووم، بۆیە وا سووک و چرووکم. ئەگەر بە نان و خوانی کەسێکی دیکە پەروەردە بووبام، لەوانەیە روخسار و قامەت و قیمەتم باشتر لەمە با. »

نووکە مریدێک کە لە پیاوی هەق پەروەردەی بووبێ، رووحی باڵ و پەڕ و فەڕ و شکۆیەکی گەورەی دەبێ و کەسێک کە لای درۆزن و زمانلووس پەروەردە بێ و زانست لەو فێر بێ و تەربیەت لەو وەرگرێ، رووحی دەژاکێ، هەروەک ئەو پیاوە کز و لاواز و عاجز و غەمین و بێچارە و بێدەرەتان دەبێ و هۆش و هەستی کەم دێنێ.

دە زاتی مرۆڤ دا، هەموو عیلمەکانیان لە بنەڕەت دا خوڵقاندوە ـ هەتا رووحی، شتە شاراوەکان دەربخا. هەروەک ئاوێکی روون کە هەرچی دە بنی دایە، لە بەرد و سواڵەت و غەیرە، و هەرچی کە لە سەرەوەیەتی وێنەی هەموویان نیشان دەدا. زاتی ئاو، ئاوایە ـ بێ عیلاج و تەعلیمێک. بەڵام کە ئاو تێکەڵاوی خاک یا رەنگی دیکە بوو، ئەو خاسیەت و زانستەی لێ جیا بۆوە و فەرامۆشی کرد. هەقتەعالا ئەنبیا و ئەولیای نارد هەروەک ئاوێکی روونی گەورە هەتا هەر ئاوێکی سووک و لێڵ تێکەڵاوی بێ، لە لێلایی خۆی رزگاری بێ و لە رەنگی سەپێنراو خلاسی بێ. کاتێک روون بێتەوە، خۆی وە بیر دێنێتەوە، دەزانێ کە « لە پێشدا، من وەها روون بووم، بێشک » ئەوجار دەزانێ کە ئەو لێلایی و رەنگانە هی خۆی نەبوون و وەبیری دێتەوە حاڵەتێک کە بەر لەوانە هەیبوە. کەوایە ئەنبیا و ئەولیا بۆ ئەو وە بیرهێنەرەوەی حاڵەتی پێشوون، نەک شتێکی تازە دە زاتی بنێن.

نووکە، هەر ئاوێکی لێڵ کە ئەو ئاوە گەورەی ناسی کە « من لە ئەوم و هی ئەوم » تێکەڵی دەبێ و ئەو ئاوە لێڵەی کە ئەو ئاوە گەورەی نەناسی و ئەوی بە غەیری خۆی دانا و غەیری جنسی خۆی، پەنا بۆ رەنگ و لێلایی دەبا هەتا تێکەڵی بەحر نەبێ و لە ئاوێتە بوونی بەحر خۆی دەپارێزێ. ئاوی گەورە لە جنسی ئاوی چووکە، لە نەفسی ئەو و زاتی ئەوە. کەسێک ئەو بە نەفسی خۆی دانەنێ، ئەو نەناسینە هی نەفسی ئاو نیە، هی پەیوەندیی و نیزیکایەتی خراپەیە دەگەڵ ئاو کە وێنەکەی ئەو نزیکایەتە لە ئاو دا دەنوێنێ و ئەو نازانێ کە « سڵەمینەوەی من لەم ئاوە گەورە و لەم بەحرە لە نەفسی منەوەیە یا لە وێنەی ئەو نزیکایەتە خراپەیە » لە غایەتی تێکەڵاو بوون. وەها کە گڵخۆر نازانێ کە «مەیلی من بە گڵ هی زاتی منە یا لەبەر هۆیەکە کە دەگەڵ تەبعی من تێکەڵاوە. »

## هەر کەس ئەم بینایە بۆ مەبەستێک پێکدێنێ!

هەرکەس ئەم بینایە بۆ نیەتێک ساز دەکا ـ یا بۆ کەرەم نواندن یا بۆ ناوێک یا بۆ خێرێک. هەقتەعالا مەبەستی بەرز کردنەوەی پلەی ئەولیا و گەورە کردنەوەی خاک و گۆڕی ئەوانە. ئەوان پێویستیان بە گەورە کردنەوەی خۆ نیە و دە نەفسی خۆیان دا گەورەن. چرا ئەگەر دەخوازێ لە بەرزایی دابنێن بۆ خەڵکی دیکە دەخوازێ و بۆ خۆی ناخوازێ. بۆ ئەو چ سەر، چ ژێر ـ لە هەر کوێیەک بێ، چرایەکی پڕ شۆقە. ئیللا کە دەخوازێ شۆقەکەی بە کەسی دیکەش بگا. ئەم هەتاوە کە لە بان ئاسمانە، ئەگەر لە ژێریش بێ، هەر ئەو هەتاوەیە، ئیللا عالەم تاریک دەمێنێتەوە. کەوایە ئەو لە سەر بوونەی بۆ خۆی نیە، بۆ خەڵکی دیکەیە. ئاکام: ئەوان لە سەر و ژێر و لە ڕێزی خەڵک بێنیاز و بێبەرین. تۆ کە زەڕڕەیەک زەوق و دەمێک لوتفی ئەو عالەمە رووت تێدەکا، ئەو دەمە لە سەر و ژێر و لە خواجەیی و سەرۆکایەتی و لە خۆشت کە لە هەمووکەس لە تۆ نزیکترە، بێزار دەبی و یادی ناکەی. ئەوان کە کانگا و کان و ئەسڵی ئەو شۆق و زەوقەن، ئەوان ئەسیری ژێر و سەری کێ دەبن؟ شانازیی ئەوان بە هەقە و هەق لە سەر و ژێر بێنیازە. ئەم سەر و ژێرە بۆ ئێمەیە کە پێ و سەرمان هەیە.

مستەفا فەرمووی « ئەگەر من بە سەرتر لە یۆنس دادەنێن، لەبەر ئەوە نەبێ کە ئەو لە زگی ماسی دا عرووجی کرد و من لە سەر، لە ئاسمان! ـ کە هەقتەعالا نە لە سەرە و نە لە ژێر. »

شۆقی ئەو لە سەر هەر ئەوەیە، لە ژێر هەر ئەوەیە و لە زگی ماسی دا هەر ئەوە. ئەو لە سەر و ژێر بێبەرییە و هەموو بۆ ئەو یەکن.

زۆرکەس هەن گەلێک کار دەکەن، غەرەزیان شتێکی دیکەیە و مەبەستی هەق شتێکی دیکە. بڕوانە کە بۆ قورئان چەند تەفسیریان ساز کردوە: دە دە بەرگ و هەشت هەشت بەرگ و چوارچوار بەرگ. غەرەزیان دەربڕینی زانیاریی خۆیانە. زەمەخشەری لە « کەششاف » دا زۆر بە وردیی نەحو و لۆغەت و رستەی ناسکی هێناوەتەوە بۆ دەربڕینی زانیاریی خۆی. هەتا مەبەستی هەق دەست کەوێ و ئەویش گەورە کردنەوەی دینی مەحەممەدە. کەوایە هەموو خەڵکیش کاری هەق دەکەن و لە

غــەرەزی هەق غــافــڵن و ئەوان مــەبەســتــێکی دیکەیان هەیە. هەق دەیەوێ عــالەم بمێنێــتــەوە. ئەوان خــەریکی هەوەس دەبن، دەگــەڵ ژنێک خــەریک دەبن بۆ لەزەتی خۆیان، [کەچی] لەوێوە منداڵێک سەر هەڵدەدا و هەروەتر، کارێک دەکەن بۆ خۆشی و لەزەتی خــۆیان، ئەوە خــۆی دەبێــتــە هۆی نەزمی عــالەم. کــەوایە لە راســتی دا بەندایەتی هەق دەکەن، ئیللا ئەوان بەو نیەتە نایکەن. هەروەتر مزگەوت ساز دەکەن، گەلێک لە دەرک و دیوار و مــیــچــەکــەی خــەرج دەکــەن. ئیللا ئیــعــتــبــار بە قــوبڵــەیە و مەبەست و گەورەیی قوبڵەیە و گەورەیی پتر دەبێ، هەرچەند کە ئەوان مەبەستیان ئەوە نەبوە.

گــەورەیی ئەولیــا بە رواڵەت نیــە. ئەی وەڵڵا! ئــەوان بەرزایی و گــەورەییــان هەیە، بەڵام بێــوێنە و بێــهــاوتا. ئاخر، ئەم درەمە لە پووڵ ســەرترە. لە پووڵ ســەرتر مــانای چیە؟ لە رواڵەت دا، لەو لە سەرتر نیە ـ کە بە ئەندازە ئەگەر، درەم لە سەربان دابنێی و زێر لە ژێر، بێشک زێر لە سەر دەبێ. بە گشــتی، زێر لە ســەرووی درەم و لەعل و دوڕ لە ســەرووی زێڕ ـ چ لە ژێر، چ لە ســەر. کەپەک لە ســەرەوەی بێژینگە و ئارد لە ژێر ماوەتەوە. کام سەرترە؟ بێشک ئارد، هەرچەند لە ژێرە. کەوایە بەرزایی ئارد بە رواڵەت نیە. لە عالەمی مانا دا چونکە ئەو زاتە دەو دایە بە گشتی ئەو سەرترە.

## ئێمە ئاوێنەین:
## ئەگەر ئەوان رابکەن لە ئێمە دا دەردەکەوێ!

شێخ مەحەللە دەیگوت کە « یەکەم، بینینە، دوای ئەوە گوت و بێژ. وەها کە گشت سوڵتان دەبینن بەڵام خاس ئەو کەسەیە کە دەگەڵی قسە دەکا. »

فەرمووی کە « ئەمە چەوتە و رسوایە و بە پێچەوانەیە. مووسا گوتی و بیستی و لە دوایی داوای دیداری دەکرد. پلەی گوتن هی مووسا و پلەی دیدار هی مەحەممەد! کەوایە ئەم قسەیە چلۆن راست دەبێ و چۆنە؟»

یەکێک هاتە لای مەولانا شەمسەددینی تەورێزیی فەرمووی کە « من بە بەڵگەیەکی قاتع، بوونی خودام ئیسبات کردوە! »

بەیانی، مەولانا شەمسەددینی تەورێزیی فەرمووی کە « مەلاییکە هاتبوون و دوعای بە خێریان بۆ ئەو کابرایە دەکرد کە: ئەلحەملای، خودای ئێمەی سابیت کرد، خودا عومری درێژ بکا! لە هەق خەڵکی عالەم دا کۆتایی نەکرد. »

گەوج، خودا سابیتە! ئیسباتی ئەو بەڵگەیەکی ناوی. ئەگەر کارێک دەکەی خۆت بە پلە و پایەییەک لای ئەو سابیت بکە! دەنا، ئەو بێ بەڵگە سابیتە. لەمە دا شکێک نیە.

عالمانی شەرع زیرەکن و دە لە دە دا دەبینن لە کاری خۆیان دا، بەڵام لە نێوان ئەوان و ئەو عالەمە دا دیوارێکیان کێشاوە بو نیزامی « دەشێ و ناشێ » ـ کە ئەگەر ئەو دیوارە نەبێتە حیجابیان، هیچ [ئەو نیزامە] رەچاو ناکەن و ئەو کارە هەروا مەحتەل دەمێنێتەوە. لەم بابەتە، مەولانای گەورە فەرموویانە کە « عالەمی دیکە وەک دەریایەکە و ئەم عالەمە وەک کەف. خودا ویستی کە کەف ئاوەدان کاتەوە. قەومێکی ناردە پشت دەریا بۆ ساز کردنی کەف. ئەگەر ئەوان خەریکی ئەم کارە نەبن، خەڵک یەکتر دەفەوتێنن و لەبەر ئەوە، خراپ کردنی کەف پێویستە. »

کەوایە خێوەتێکە هەڵدراوە بۆ پادشا و قەومێکیان لەم خێوەتە دا خەریک کردوە و یەکێک دەڵێ کە « ئەگەر من گوریسم نەرێستبا، خێوەت چۆن هەڵدەدرا؟ » یەکی دیکە دەڵێ کە « ئەگەر من گوڵمیخ ساز نەکەم، گوریس لە کوێ دەبەستنەوە؟ » هەمووکەس

دەزانێ کە ئەوانە هەموویان بەندەکانی ئەو پادشایەن کە دێتە خێوەتەوە و دەگەڵ مەعشووق رایدەبووری. کەوایە ئەگەر جۆلا تەرکی جۆلایی بکا بۆ وەزیرایەتی، هەموو عالەم رووت و قووت دەمێننەوە. لەبەر ئەوە، لەو کارە دا زەوقێکیان پێبەخشیوە کە دڵی پێی خۆشە.

کەوایە ئەو قەومەیان بۆ نیزامی عالەمی کەف خوڵقاندوە و عالەم بۆ نیزامی ئەان، بەڵام، خۆزگە بەوەی کە ئەو عالەمەیان بۆ نیزامی ئەو خوڵقاندوە، نەک ئەو بۆ نیزامی عالەم!

کەوایە خودا دڵخۆشیی و خۆشیی بەخشیوە بە هەر کەسێک لە کارەکەی دا کە ئەگەر سەدهەزار ساڵ بژی، هەر ئەو کارە دەکاتەوە و هەر رۆژێک ئەشقی بەو کارە پتر دەبێ و لەم پێشە دا ساتەکانی دەخوڵقێن و چێژ و لەززەتی لێدەبا: گوریسرێس، شوکر بژاردنێکی دیکە و دارتاش کە ئەستووندەگی خێوەت ساز دەکا، شوکر بژاردنێکی دیکە و گوڵمیخساز، شوکر بژاردنێکی دیکە و جۆلا کە بەرگی خێوەت دەکا، شوکر بژاردنێکی دیکە و ئەولیا کە دە خێوەت دا دانیشتوون و خەریکی رابواردن و کەیف و بەزمن، شوکر بژاردنێکی دیکە.

نووکە، ئەم قەومەی کە روو دە ئێمە دەکەن، ئەگەر خامۆش دەبین، مەلوول دەبن و دەرەنجن و ئەگەر قسەیەکیش بکەم کە لایقی ئەوان بێ، ئێمە دەرەنجین ـ دەڕۆن و تەشەرم لێدەدەن کە لە ئێمە مەلوولە و رادەکا. ئێزنگ کەی لە مەنجەڵ رادەکا؟ ئیللا مەنجەڵ رادەکا، تاقەت ناهێنێ. کەوایە راکردنی ئاگر و ئێزنگ، راکردن نیە، بەڵکە کاتێک دیتی کە ئەو زەعیفە، لێی دوور دەکەوێتەوە. کەوایە، بە راستی، مەنجەڵ رادەکا. کەوایە راکردنی ئێمە، راکردنی ئەوانە. ئێمە ئاوێنەین. ئەگەر ئەوان رابکەن، لە ئێمە دا دەر دەکەوێ. ئێمە بۆ ئەوان رادەکەین. ئاوێنە ئەوەیە کە خۆی تێدا ببینن. ئەگەر ئێمە مەلوول دەبینن، ئەوە مەلوولیی خۆیانە. چونکە مەلوولیی سفەتی زەعفە، لێرە مەلوولیی ناگونجێ و مەلوولیی چ کارێکی هەیە؟

لە حەمام دا وا رێکەوت کە زۆر تەوازوعی شێخ سەلاحەددینم* دەکرد و شێخ سەلاحەددین تەوازوعی زۆرتری لە ئاست ئەو تەوازوعە دەنواند. گلەییم کرد. بە دڵم داهات کە « تەوازوعت لە حەد تێپەڕاندوە! تەوازوعی بەرەبەرە باشە: لە پێشدا،

دەسـتی دامـاڵە، دوایە پێی، بەرەبەرە بیگەیەنە رادەیە کـە هەسـتی پێنەکا و خـۆ دەرنەخـا و خـووی پێـبگرێ. بە نـاچار، نابێ خـۆ زەحـمـەت بدەی و لەبری خـزمـەت، خزمەت بکەی ـ چونکە بەرەبەرە، ئەوت بەو تەوازوعە راهێناوە. »

دۆسـتـایەتی دەبێ وەهـا و دوژمنایەتیش وەهـا بێ: کـەم کـەمـە، بەرەبـەرە. بۆ وێنە دوژمنێک لە پێشدا، هـەندێک نەسیحـەت بکەی. ئەگەر گوێی نەدایە، ئەوسا لێیدەی. ئەگەر گوێی نەدایە، لە خۆتی دوور کەوە و کارەکانی عالەم بەم چەشنە دەچنە پێش. ئاشـتی و دۆسـتـایـەتی بەهارت نەدیوە؟ سـەرەتا، بـەرەبەرە گـەرمـایەک دەنوێنێ و لە دوایی پتر. سـەیری درەختـەکان بکە کە چلۆن بەرەبەرە دێنە پێش: لە پێشدا بزەیەک و لە دوایی بەرەبەرە جلی گەڵا و شکۆفـە و بەر پەیدا دەکەن و دەروێشـانە و سۆفـیانە، هەمووی هەڵدەرێژن و ئەوەی هەیانە دەیدۆرێنن.

کـەوایـە کـارەکـانی عـالەم و پێـشـینیـان ـ بە گـشـتی ـ ئەوەی کـە پەلەی کـرد و لە سـەرەتای کـار دا زێدەرەویی کـرد، ئەو کـارە سـەری نـەگـرت. ئەگـەر ریـازەتە، شێوەکەیان وەها گوتوە کە: ئەگەر مەنێک نان دەخوا رۆژێ درەمێکی لێ کەم کاتەوە بەرەبەرە، وەها کە یەک دوو ساڵ تێپەڕێ هەتا ئەو نانەی گەیاندبێتە نیو مەن. وەهـای کەم کاتەوە کە لەش هەست بە کـەم بوونەوەی نەکا. هـەروەتر عیـبـادەت و خـەڵوەت و روو لە تاعـەت نان و نوێژ کردن: ئەگەر هـەر نوێژی نەدەکرد، کە پێی لە رێی هەق نا، لە پێشدا پێنج نوێژ راگرێ، لە دوایی زیادی بکا.

* مەبەست شێخ سەلاحەددینی زەرکووب ـ ە

## کافر و ئیماندار سوبحانەبژێرن!

ئەو هەموو عیلم و هەوڵ و بەندایەتی بۆ ئیستحقاق و عەزمەتی باریی وەهایە کە یەکێک سەری دانواند و خزمەتێکی کرد و رۆیی. ئەگەر هەموو زەوی لە سەر سەر دابنێی لە خزمەت هەق دا، وەهایە کە جارێک سەر بە زەوییەوە بنێی ـ چونکە ئیستحقاقی هەق و لوتفی ئەو لە سەر وجوود و خزمەتی تۆ، لە پێشترە. تۆی لە کوێ دەرکێشا و ژیانی پێدای و شیاوی بەندەیی و خزمەتی کردی، کە تۆ لافی بەندەیی ئەو لێدەدەی؟

ئەم بەندەیی و عیلمانە وەک ئەوەن کە بووکۆڵەت ساز کردبێ لە چێو و لیباد، دوای ئەوە بیبەیە خزمەت حەزرەت کە « خۆشم لەو بووکۆڵانە هات سازم کرد، بەڵام گیان پێبەخشین کاری تۆیە، ئەگەر گیانیان بدەیەی، عەمەلەکانی منت زیندوو کردوون و ئەگەریش نەیبەخشی، فەرمان بە دەست تۆیە. »

ئیبراهیم فەرمووی کە خودا ئەوەیە کە « زیندووی دەکاتەوە و دەیمرێنێ! »

نەمرود گوتی کە « منیش زیندووی دەکەمەوە و دەیمرێنم! »

چونکە هەقتەعالا ملکی دابوویە، ئەویش پێیوابوو قادرە، حەواڵەی بە هەق نەکرد، گوتی منیش زیندووی دەکەمەوە و دەیمرێنم. مەبەستیشم لەو ملک ـ ە زانستە. چونکە هەقتەعالا عیلم و زیرەکیی و لێهاتوویی بە مرۆڤ بەخشی، کارەکانی لە سەر خۆ زیاد کرد ـ کە « من بەم عەمەل و بەم کارە، کارەکان زیندوو دەکەمەوە و چێژی لێوەردەگرم. »

یەکێک پرسیاری کرد لە مەولانای مەزن کە: ئیبراهیم بە نەمرودی گوت «خودای من ئەوەیە کە هەتاو لە رۆژهەڵات دەردێنێ و لە رۆژاوای دەنێ. ئەگەر تۆ داوای خودایەتی دەکەی بە پێچەوانەی ئەوە بکە! » لێرەوە لازم دەکرێ کە نەمرود ئیبراهیمی ناچار کردبێ کە لە قسەی یەکەمی ـ وڵامنەدراو ـ تێپەڕێ و بەڵگەیەکی دیکە دەست پێبکا؟

فەرمووی کە: خەڵک هەتڵەیان بێژت و تۆش هەتڵە دەبێژی. ئەمە یەک قسەیە لە

دوو وێنه دا. تۆ غەڵەتت کرد و ئەوانیش. ئەمە مانای زۆره. یەک لەو مانایانه ئەوەیە که هەقتەعالا تۆی له حەشارگەی عەدەم ـ له زگی دایکت ـ دا پێکهێنا، رۆژهەڵاتی تۆ زگی دایک بوو، لەوێ سەرت دەرکێشا و له رۆژاوی گۆڕ ئاوا بووی. نووکه ئەگەر تۆ قادری، له رۆژاوای گۆڕ دەریکێشه و بیبەوه رۆژهەڵاتی منداڵدان!

مانایەکی دیکه ئەوەیە کە عارف کە لەبەر تاعەت و هەوڵ و ئاکاری بەرز، رووناکیی و مەستیی و رووح و راحەتیی تێدا پێکدێ و له حاڵەتی تەرکی ئەم تاعەت و هەوڵه ئەو خۆشییە ئاوا دەبێ، کەوایه ئەم دوو حاڵەتەی تاعەت و تەرکی تاعەت رۆژهەڵات و رۆژاوای ئەو بوه. ئەگەر تۆ قادری له زیندوو کردنەوه، لەم حاڵەتی زەردەپەڕی رواڵەت کە فسق و فەساد و گوناهە، ئەو رووناکیی و راحەتەی کە له تاعەت دەردەکەوتن، هەرئێستا له زەردەپەڕ دا دەریبخە!

ئەوه کاری بەنده نیه و بەنده قەت پێیناکرێ. ئەمە کاری هەقه ـ کە ئەگەر بیەوێ، هەتاو له رۆژاوا دەردەکێشێ و ئەگەر بیەوێ، له رۆژهەڵات.

کافر و ئیماندار هەردووک، سوبحانەبژێرن. چونکه هەقتەعالا خەبەری داوە کە هەرکەس به رێگای راست دا بڕوا و راستیی بێژێ و پەیڕەوی شەریعەت و ئەنبیا و ئەولیا بێ، گەلێک خۆشیی و رووناکیی و ژیانیان تێدا پێکدێ و ئەگەر بە پێچەوانه بیکا، گەلێک تاریکیی و خۆف و چاڵ و بەڵای دێتە بەر. لەبەر ئەوه کە هەردووک خەریکی ئەمەن و ئەوەی که هەقتەعالا وەعدەی داوه وه راست دەگەڕێ و دەردەکەوێ، کەوایه هەردووک سوبحانەبژێری هەقن ـ ئەو به زمانێک و ئەم به زمانێک.

بۆ وێنه دزێک دزی کرد و له داریان دا. ئەویش وەعزبێژی موسڵمانانه کە «هەرکەس دزی بکا، حاڵی ئاوا دەبێ» و یەکێکیش پادشا لەبەر راستیی و ئەمانەت، خەڵاتی دایه. ئەویش وەعزبێژی موسڵمانانه. بەڵام دز بەو زمانه و ئەمین بەم زمانه. بەڵام تۆ سەیری فەرق بکه ده نێوان ئەم دوو وەعزبێژه دا!

## ڕێگای هەق گەلێک بەسام و بەستەڵەکە؟

دۆستـان رەنجـی وایان دە دەڵ دایە کە بە هیـچ دەرمـانێک خـۆش نابێـتـەوە: نە بە خـەوتن، نە بە گـەڕان و نە بە خـواردن، ئیلـلا بە دیداری دۆست نەبێ. وەها کـە ئەگـەر مـونافـقـێک دە نێـو ئیـمـانداران دا دابنیـشـێ، وەهای شـوێن لـە سـەر دادەنێن کـە دەستـبـەجێ دەبێـتـە ئیـماندار. جا ئەگـەر ئیمـانداریێک دەگەڵ ئیمـانداران دابنیشـێ چۆنە؟ کـاتێـک وەها شـوێنێک لە سـەر مـونافـق دادەخـا، بڕوانە کـە دە ئیـمـاندار دا چەنـدە سـوود دەکـا! بڕوانـە ئەو پەشـمـە لەبەر هـاوسـایـەتی ئاقـڵـێک بوو بـە وەها رایەخێکی نەقشـدار و ئەم خاکە بە هۆی هاوسایەتی ئاقڵێک بوو بە وەها سەرایەکی خـۆش. قسـەی ئاقڵ لە سەر جەمـاد شوێنی داخست، بڕوانە کـە قسـەی ئیمـاندار دە ئیـمـانداریێک دا چ شـوێنێک دادەنێ! لە سـایەی قسـەی نەفسـی چووک و ئەقڵـی کـەم، جەماد بەم پلەیە گەیشـتن ـ و هـەموو ئەوانە سێبەری ئەقڵی جزوون.

لە سـێبـەرەوە دەکرێ باڵای کـەس قـیـاس بکەی. نووکـە، لێرەوە قـیـاس بکە کـە چ ئەقڵ و فەرهـەنگێک پێویسـتە کە ئەم ئاسـمـان و مـانگ و هـەتاو و حەوت تەبەقەی زەوی و ئەوەی کـە دە نێوان ئەرز و ئاسـمـان دایە، لـەوەوە پەیدا بن. تەواوی ئەم بوونەوەرانە سـێبـەری ئەقڵی کوللن. سـێبەری ئەقڵی جزوو شـایەنی سـێبـەری کـەس و سـێبـەری ئەقڵی کولل ـ کە بوونەوەرانن ـ شایەنی ئەو.

ئەولیـای هـەق جگە لەم ئاسـمـانانە، ئاسـمـانی دیکـەیان دیوە کـە ئەم ئاسـمـانانەیان پێ هیچ نیە و لەبەر چـاویان چووک و سووک دیاری دەدا. ئەوان پێیـان لە سـەر ئەوانە ناوە و لێی تێـپــەڕیون. بۆ پێت ســەیرە کــە مــرۆڤــێک دە نێــوان مــرۆڤ دا ئەو تایبـەتمـەندییـەی دەست کـەوێ کـە پێ لە سـەر ئەسـتـێـرەکـان بنێ؟ مـەگـەر ئێـمـە هـەمـوومـان لە جنسی خـاک نەبووین؟ هەقـتـەعـالا قەوەتێکی دە ئێـمە نا، کە ئێـمـە لە جنسـی خــۆمــان، بەو قــەوەتە، شــاز بووین و زاڵ بووین بـە ســەری دا و کــەوتە ژێردەستـەڵاتی ئێمـە هـەتا دەستی بە سـەر دابگرین بە هـەر جۆرێک کە بمانەوێ: جار دەیبـەینە سـەر، جـار دەیهـێنینە خـوار، جـار دەیکـەینە سـەرا، جـار دەیکـەینە قـاپ و گـۆزە، جـار درێژی دەکـەین و جـار کورتی دەکـەینەوە. ئەگـەر ئێـمـە سـەرەتا هـەر ئەو

خـاکـه بووین و له جنسی ئەو بووین، هەقـتـەعـالا ئێـمــەی بەو قـەوەته شــاز کـرد، هەروەتر، له نێوان ئێمـەش ـ کە له یەک جنسین ـ بۆ سەیره کە هەقتەعالا هەندێک کـەس شـاز بکاتەوه له ئێـمـە؟ کـه ئێـمـه له چاو ئەو هەروەک جـەمـاد بـین و ئەو بە سەرمان دا زاڵ بێ و ئێمە لەو بێخەبەر بین و ئەو خەبەردار له ئێمە؟

ئەوەی کە دەڵێین « بێخـەبەر » مـەبەسـتـمـان بێخـەبەریی مـەحز نیە، بەڵکە هەر خـەبەرێک له شـتێک دا بێـخـەبەریی ـ یە له شـتێکی دیکە. خـاکیش، بەو جـەمـادییـە، لەوەی کە خـودا پێیـداوه خـەبەری هەیە ـ کـه ئەگـەر بێـخـەبەر با، کـەی ئاوی وه خۆ دەگرت و دایەنیی هەر دەنکێکی دەکرد و پێیدەگەیاند؟ کەسێک ئەگەر له کارێک دا شێلگیر بێ و پێوەی خەریک بێ، بێداریی لەو کاره دا بێخەبەرییە له چاو غەیری ئەو. ئێمە لەو غەفلەتە، غەفلەتی کوللیمان ناوێ.

دەیانەویست پشیلەیەک بگرن، نەدەگونجـا. ڕۆژێک ئەو پشـیلەیە خـەریکی ڕاوی مەلێک بوو. هەموو زەینی خۆی بۆ تەرخان کردبوو، لەو حاڵەته دا غافڵ بوو، گرتیان.

کەوایە نابێ بە کوللی خـەریکی کاری دونیـا بی. دەبێ سـانای بگری و له بەندی ئەوه دا نەبی کە مـەبادا ئەم دڵی بێشـێ و ئەو دڵی بێشـێ. دەبێ گـەنج دڵی نەیەشێ. ئەگـەر ئەمانه دڵیـان بێشێ، ئەوان دڵیـان دەدەنەوه، بەڵام کە ئەو دڵی بێشێ، کێ دڵی دەداتەوه؟ ئەگـەر تۆ گـەلێکت قومـاش هەبێ له هەر چەشنێک، لـه کاتی نوقم بوون، سـەیر، چنگ بە کـامـیـان دادەگری؟ هەرچەند هەمـوویـان پێـویسـتن، بەڵام یەقین بۆ شـتێکی باییـدارتر، بۆ خـەزێنەیەک چنگ دەکوتی ـ کە بە گەوهەرێک و کوته لەعلێک، دەکرێ هەزار کـار ڕاپەڕێنیی. لـه درەخت مـیوەی شـیرین دەردەکەوێ، هەرچەند ئەو میـوەیه بەشێک لـەو بوو، هەقتـەعالا ئەو بەشـەی له کولل هەڵبـژارد و شازی کرد ـ کە شـیـرنایەتیـیـەکی دەو نا کـە دە باقی نەنا: کـە بە هـۆی ئەو، ئەو بـەشـە لـه کـولل هەڵبژاردەتر بوو و بوو بە هەڵبژارده و مەبەستی درەخت.

کـەسـێک دەیگوت « من حـاڵەتێکم هەیە کـە مـەحـەممەد و مـەلەکی دەرگـاش لەوێ ناگونجێن. »

شـێخ شەمسەددین فـەرمووی کـە « سەیره! بەنده حاڵەتێکی هەبێ کە مەحەممەد تێیدا نەگونجێ!؟ مەحەممەد حاڵەتێکی هەیە کە وەک تۆ زارزلێکی تێدا نەگونجێ! » ئاخر ئەوەنده حـاڵەتەی کە دەستت کەوتوه له بەرەکەتی ئەوەوەیە و شوێنەواری ئەوه.

چونکە لە پێشدا تەواوی خەڵاتەکان بە سەر ئەو دادەکەن، ئەوسا لەوەوە بۆ ئەوانی دیکە بڵاو دەبێتەوە. چونکە سوننەت وەهایە.

ڕێگای هەق گەلێ بەسام و بەستەڵەک و پڕ لە بەفرە. لە پێشدا ئەو گیانبازیی کرد و ئەسپی تاو دا و ڕچەی شکاند. هەرکەس بەم ڕێگایە دا بڕوا، لەبەر ڕێنوێنی و عینایەتی ئەوە. چونکە لە پێشدا ئەو ڕێگای دیتەوە و لە هەر شوێنێک نیشانەیەکی دانا و دارێکی داکوتا کە « بەم لایە دا بڕۆن، بەو لا دا مەڕۆن! و ئەگەر بەو لا دا بڕۆن، دەفەوتێن ـ هەروەک قەومی عاد و سەموود ـ و ئەگەر بەم لایە دا بڕۆن، ڕزگار دەبن ـ هەروەک ئیمانداران. »

هەروەتر ئەگەر کەسێک بە تەما بێ لەم دارانە دارێک بشکێنێ، هەموو شاڵاوی بۆ دەبن کە « بۆ ڕێگاکەمان وێران دەکەی و هەوڵی فەوتانمان دەدەی؟ مەگەر تۆ ڕێگری؟»

نووکە، بزانە کە پێشڕەو مەحەممەدە. هەتا لە پێشدا نەگاتە مەحەممەد، بە ئێمە ناگا. هەروەک بتەوێ بچیە جێگەیەک، لە پێشدا ئەقڵ پێشڕەویی دەکا کە « بۆ فلانە جێ دەبێ بچی! مەسلەحەت ئەمەیە! » دوای ئەوە چاو پێشەوایەتی دەکا، دوای ئەو ئەندامەکان وە جووڵە دەکەون ـ بەم تەرتیبە. هەرچەند ئەندامەکان خەبەریان لە چاو نیە و چاو لە ئەقڵ.

مرۆڤ هەرچەند غافڵە، ئیللا ئەوانی دیکە لێی غافڵ نین. کەوایە ئەگەر لە کاری دونیا شێلگیر بی، لە هەقیقەتی کار غافڵ دەبی. دەبێ ڕەزای هەق بخوازی، نەک ڕەزای خەڵک ـ چونکە ئەو خۆشەویستیی و بەزەیی و ڕەزایەی کە لە خەڵک نراوە، خودا ایناوە. ئەگەر نەیەوێ هیچ بەزم و زەوقێک نادا، سەرەڕای هەبوونی هەموو ئەسبابی نیعمەت و نان و سامان، هەمووی دەبێتە ڕەنج و خەفەت. کەوایە هەموو ئەسبابەکان وەک قەڵەمێکن بە دەست هێزی هەقەوە. بزوێنەر و نووسەر هەقە. هەتا ئەو نەیەوێ قەڵەم نابزوێ. نووکە تۆ سەیری قەڵەم دەکەی، ناڵێی ئەو قەڵەمە دەستێکی دەوێ؟ قەڵەم دەبینی دەست نابینی. کە قەڵەمت دیت یادی دەست بکە! کوا ئەوەی کە دەیبینێ و ئەوەی کە دەیڵێ؟ بەڵام ئەوانەی هەمیشە دەست دەبینن، دەڵێن «قەڵەمێکیش پێویستە! » جا لەبەر موتاڵای چاکیی دەست، لە موتاڵای قەڵەم ناترسێن و دەڵێن کە « وەها دەستێک بێ قەڵەم ناشێ! » لەو شوێنەی کە تۆ لەبەر چێژی موتاڵای قەڵەم ترسی دەستت نیە، ئەوان لەبەر چێژی موتاڵای ئەو دەستە چۆن ترسی قەڵەمیان هەیە؟ تۆ کە لەبەر چێژی نانێکی جۆ، نانی گەنمت فەرامۆش

کـردوه، ئەوان بە هەبوونـی نانی گـەنم چۆن یادی نانی جـۆ دەکـەن؟ لەبەر ئەوەکـە لە سـەر زەوی زەوقێکی  دا بە تۆ، تۆ ئـاسمـانت ناوێ ـ چونکە شـوێنی زەوق ئاسمـانە و هۆی ژینی زەوی ئاسمان ـ ئەهلی ئاسمان کەی یادی زەوی دەکەن؟

نووکە، خۆشیی و لەززەتەکان لە ئەسـبابەوە مەبینە ـ کە ئەو مانایانە دە ئەسـباب نراوەن. چونکە زەرەر و قازانج لەوەوەیە، تۆ بۆ بە ئەسبابەوە نووساوی؟

# خەڵات و دار کەی یەکن؟

کوڕی ئەتابەک هات.

مەولانا فەرمووی کە « باوکی تۆ دایم خەریکی هەقە و بڕوای زاڵە و لە قسەکەیەوە دیارە! »

ڕۆژێک ئەتابەک گوتی کە « کافرەکانی ڕۆمی دەیانگوت کە کچ دەدەینە تاتار کە دین ببێتە یەک و ئەم دینەی تۆ کە موسڵمانەتییە سەر هەڵبدا! »

گوتم « ئاخر، ئەم دینە کەی یەک بوە؟ هەمیشە، دوو و سێ بوە و شەڕ و کوشتار قایم دە بەینیان دا. ئێوە چۆن دین دەکەنە یەک؟ یەک لەوێ دەبێ ـ لە قیامەت. بەڵام لێرە کە دونیایە، ناگونجێ ـ چونکە لێرە هەرکەس هیوایەکی هەیە و هەوایەکی جیاواز. یەکیەتی لێرە نالوێ. مەگەر لە قیامەت دا کە هەموو دەبنە یەک و ڕوو لە یەک شوێن دەکەن و دەبنە یەک گوێ و یەک زمان. »

مرۆڤ گەلێک شتی تێدایە: مشکی تێدایە و مەل. مەل قەفەس دەباتە سەر و دیسان مشک دەیکێشێتەوە خوار. سەدهەزار دڕندەی جۆراوجۆری دیکە شاراوەن دە مرۆڤ دا. مەگەر بچنە ئەو شوێنە کە مشک مشکایەتی وەلابنێ و مەل، مەلایەتی و هەموو ببنە یەک. چونکە مەتلووب نە لە سەرە و نە لە ژێر. کە مەتلووب دەرکەوێ، نە بۆ سەر دەفڕێ و نە بۆ ژێر.

یەکێک شتێکی ون کردوە: چەپ و ڕاست دەگەڕێ و پاش و پێش دەپشکنێ. کە ئەو شتەی دیتەوە نە سەر دەگەڕێ و نە ژێر، نە چەپ دەگەڕێ و نە ڕاست، نە پاش دەپشکنێ و نە پێش، کۆ دەبێتەوە.

کەوایە، لە ڕۆژی قیامەت دا، هەموو دەبنە یەک نەزەر و یەک زمان و یەک گوێ و یەک هۆش. وەها کە دە کەس لە باغێک یا دوکانێک دا شەریک بن، قسەکانیان یەک دەبێ و غەمیان یەک و خەریک بوونیان بە یەک شت دەبێ ـ چونکە مەتلووب بۆتە یەک. کەوایە لە ڕۆژی قیامەت دا چونکە هەموو کاریان دە هەق دەکەوێ، هەموو دەبنە یەک.

بەم مانایە، هەرکەس دە دونیا دا خەریکی کارێکە: یەک لە خۆشەویستی ژن دا،

یەک لە ماڵ، یەک لە کەسب، یەکێک لە عیلم. هەموویان لە سەر ئەو باوەڕەن کە دەرمانی من و زەوقی من و خۆشیی من و ڕاحەتیی من دەو دایە و ئەوە ڕەحمەتی هەقە. کە دەچێتە وێ و لێیدەگەڕێ، نایبینێتەوە، دەگەڕێتەوە. کە ماوەیەک وچان دەگرێ، دەڵێ « ئەو زەوق و ڕەحمەتە دەست دەکەوێ، دەبێ باش نەگەڕابم. دیسان لێیدەگەڕێم. » کە دیسان لێیدەگەڕێ، نایبینێتەوە. هەتا ڕەحمەت بێ حیجاب ڕووی تێبکا، دوای ئەوە دەزانێ کە ئەوە ڕێگا نەبوە.

بەڵام هەقتەعالا بەندەی وای هەیە کە بەر لە قیامەت وەهان و ئاخر دەبینن. عەلی دەفەرموێ « ئەگەر قالب هەڵگرن و قیامەت دەرکەوێ، یەقینی من زێدەتر نابێ. »

وێنەکەی وەها دەبێ کە قەومێک لە تاریکەشەوێک دا، لە ماڵ، ڕوویان لە هەر لایەک کردوە و نوێژ دەکەن. کە ڕۆژ دابێ، هەموویان پاشگەز دەبنەوە. بەڵام ئەوەی کە ڕووی دە قوبلە بوە، کەی پاشگەز دەبێتەوە؟ چونکە هەموو ڕوو دەو دەکەن. کەوایە ئەو بەندانەش لە شەو دا ڕوویان دەوە و ڕوویان لە غەیر وەرگێڕاوە. کەوایە لە هەق ئەوان دا قیامەت زاهیر و حازرە.

ئادی، ئەم کەسە بە بڕوایە، بەڵام بڕوا نازانێ. هەر ئەوجۆرەی کە منداڵ بڕوای بە نانە، بەڵام نازانێ بڕوای بە چیە. هەروەتر لە گیایەکان دا، درەخت زەرد و ویشک دەبێ لە تینوان و نازانێ تینوایەتی چیە؟

وجوودی مرۆڤ هەروەک ئاڵایەکە. ئاڵا لە پێشدا هەڵدەکەن و دوای ئەوە، لەشکرەکان لە هەرلایەکەوە کە هەق بخوازێ، لە ئەقڵ و فام و تووڕەیی و غەزەب و سێبووریی و کەرەم و خۆف و ڕەجا و ئەحواڵی بێبن و سفاتی بێڕادە، بۆ ژێر ئەو ئاڵایەی دەنێرێ. هەرکەس لە دوورەوە بڕوانێ، تەنیا ئاڵا دەبینێ. بەڵام ئەوەی لە نزیکەوە بڕوانێ، دەزانێ کە چەندەی گەوهەر و مانا تێدایە.

کەسێک هات.

فەرمووی « لە کوێ بووی؟ موشتاق بووین. بۆ وا درەنگ؟ »

گوتی « وا ڕێک کەوت! »

گوتی « ئێمەش دوعامان دەکرد ئەم ڕێکەوتە وەربگەڕێ و تەواو بێ. » ڕێکەوتێک کە دووریی و جیایی بێنێ، ئەو ڕێک کەوتە ناپێویستە. ئەی وەڵڵا! ڕاستە لە هەقەوەیە، بەڵام لە چاو هەق باشە.

ئەمە کە دەروێش دەڵێن « هەموو شت باشە! » ڕاست دەکەن: هەموو لە چاو هەق باشە و پێگەیشتوویە، بەڵام لە چاو ئێمە نا. زینا و پاکیی و بێنوێژیی و نوێژ و کوفر و ئیسلام و شیرک و تەوحید، هەموو بۆ هەق باشە. بەڵام لە چاو ئێمە، زینا و دزیی و کوفر و شیرک خراپە و تەوحید و نوێژ و خێرات لە چاو ئێمە باشە، بەڵام لە چاو هەق هەموو باشە.

وەها کە پادشایەک لە ملکی ئەو دا، زیندان و دار و خەڵات و ماڵ و ملک و دەستوپێوەند و بەزم و ڕەزم و تەپڵ و ئاڵا هەیە. بەڵام بۆ پادشا هەموو باشە. وەها کە خەڵات کەمالی ملکی ئەوە، دار و کوشتن و زیندانیش کەمالی ملکی ئەوە و لە چاو ئەو هەموو کەماڵە. بەڵام لە چاو خەڵک، خەڵات و دار کەی یەک دەبن؟

## چاکە و خراپە یەکن!

گوتی کە ئەو ئەستێرەناسە دەڵێ کە « غەیری فەلەک و ئەم گۆ خاکییە کە دەیبینم، ئێوە دەڵێن کە لە دەرەوەی ئەو شتێک هەیە؟ لای من، غەیری ئەوە شتێک نیە و ئەگەر هەیە، نیشانم بدەن کە لە کوێیە؟ »

فەرمووی کە « ئەو پرسە لە سەرەتاوە فاسدە. چونکە دەڵێی کە: نیشانم بدەن لە کوێیە! و ئەو خۆی جێگەی نیە. دوای ئەوە وەرە، بڵێ کە رەخنەی تۆ لە کوێیە و لە چ جێگەیەکە؟ دە زمان دا نیە و دە زار دا نیە، دە سینگ دا نیە. تەواوی ئەوانە بپشکنە و کوت کوت و لەت لەتیان بکە! بزانە ئەم رەخنە و بیرە هیچ دەوانە دا دەبینیەوە؟ کەوایە زانیمان بیری تۆ جێگەیەکی نیە. کە جێگەی بیری خۆت نازانی، چۆن جێگەی خوڵقێنەری بیر دەزانی؟ چەندین هەزار بیر و حاڵ بە سەر تۆ دادێ، بە دەست تۆ نیە و لە دەستەڵات و حوکمی تۆ دانیە. تەواوی ئەو شتانە بە سەر تۆ دا تێدەپەڕێ و تۆ بێخەبەر کە لە کوێوە دێ و بۆ کوێ دەچێ و چ دەکەن. کاتێک لە ئاگاداریی حاڵی خۆت عاجزی، چلۆن چاوەڕوانییت هەیە کە ئاگاداری خوڵقێنەری خۆت بی؟ »

خوشک قەحپە ژن دەڵێ کە « لە ئاسمان نیە. » ئەی سەگ، چووزانی کە نیە؟ ئاسمانت بست بە بست پێوا؟ هەمووی گەڕای؟ خەبەر دەدەی کە تێیدا نیە؟! قەحبەی خۆت کە دە ماڵ دایە ئاگات لێی نیە، چۆن دەتەوێ ئاسمان بزانی؟ هەر ئاسمانت بیستوە و ناوی چەند ئەستێرە و فەلەک، شتێک دەڵێی. ئەگەر تۆ ئاگات لە ئاسمان با و بەرەو ئاسمان بستێک چووبایە سەر، لەو قسە قۆڕانەت نەدەکوت.

ئەوەی کە دەڵێین: هەق لە ئاسمان نیە، مەبەستی ئێمە ئەوە نیە کە لە ئاسمان نیە ـ یانی ئاسمان بە سەر ئەو دا موحیت نیە و ئەو موحیتی ئاسمانە. پێوەندییەکی هەیە بە ئاسمان لەو بێوێنە و بێهاوتایە. وەها کە پێوەندیی بە تۆوە هەیە بێوێنە و بێهاوتا و هەمووی بە دەست ئەوە و نوێنگەی ئەوە و لە دەستەڵاتی ئەو دایە. کەوایە لە دەرەوەی ئاسمان و ئەستێرەکان نیە و بە تەواوەتی دەوان دانیە. یانی بە سەر ئەو دا موحیت نین و ئەو بە سەر گشت دا موحیتە.

یەکێک گوتی کە « بەر لەوەی کە زەوی و ئاسمان و عەرش و کورسی هەبێ، ئەو لە کوێ بوو؟

گوتمان « ئەو پرسە لە سەرەتاوە فاسدە. چونکە خودا ئەوەیە کە ئەو جێگەی نیە. تۆ دەپرسی کە بەر لەوە لە کوێ بوە؟ ئاخر، هەموو شتەکانی تۆ بێ جێگەن. ئەو شتانەی کە دە تۆ دایە، جێگەی ئەوانت زانی کە جێگەی ئەو داوا دەکەی؟ کاتێک بێ جێگەن حاڵ و بیرەکانی تۆ، چلۆن ئەو دە جێگە دا دەگونجێنی؟ ئاخر، خوڵقێنەری بیر لە بیر لەتیفترە. بۆ وێنە ئەو بەننایە کە خانووی ساز کرد، ئاخر ئەو لەتیفترە لەم خانوویە. چونکە سەدی وەها و جگە لەم بینایە، کاری دیکە و بیری دیکە کە هیچی وەک یەک ناچن، ئەو پیاوە بەننایە دەتوانێ سازی بکا. کەوایە ئەو لەتیفتر و ئازیزترە لەو بینایە. بەڵام ئەو لوتفە وەبەر چاو نایە، مەگەر بە هۆی خانوو و کردەوەیەک کە لە عالەمی هەستەوە سەر هەڵدەدا، هەتا لوتفی ئەو خۆ بنوێنێ. »

ئەو هەناسەیە لە زستان دا دیارە و لە هاوین دا دیار نیە. ئەوە نیە کە لە هاوین دا هەناسە ببڕێ و هەناسە نەبێ. ئیللا هاوین لەتیفە و هەناسە لەتیفە، دیار ناکەوێ ـ بە پێچەوانەی زستان. هەروەتر، هەموو پەسنەکانی تۆ و ماناکانی تۆ لەتیفن، وەبەر چاو نایەن، مەگەر بە هۆی کردەوەیەک. بۆ وێنە سێبوورییی تۆ هەیە، بەڵام وەبەر چاو نایە. کاتێک لە تاوانکارێک خۆش بی، سێبوورییی تۆ دەردەکەوێ. هەروەتر، غەزەبی تۆ وەبەرچاو نایە، کاتێک لە تاوانکارێک غەزەب بگری و لێی بدەی، غەزەبی تۆ وەبەر چاو دێ.

هەقتەعالا، لەبەر رادەی لوتف، وەبەر چاو نایە: ئاسمان و زەوی خوڵقاند هەتا دەستەڵاتی ئەو و سونعی ئەو وەبەر چاو بێ.

قسەی من بە دەست خۆمەوە نیە و لەبەر ئەوە دەڕەنجم. چونکە دەمەوێ مۆعیزەی بۆ دۆستان بکەم و قسە دەستەمۆی من نابێ ـ لەبەر ئەوە دەڕەنجم. بەڵام لەبەر ئەوە کە قسەی من لە من سەرترە و من مەحکوومی ئەوم، شاد دەبم. چونکە قسەیەک کە هەق بیکا، بگاتە هەرکوێ، دەیژێنێتەوە و شوێنەواری گەورە دادەخا. تیرێک کە لە کەوانی هەق دەرپەڕێ، هیچ سپەر و خەفتانێک بەری پێناگیرێ، لەبەر ئەوە شادم.

عیلم ئەگەر بە تەواوەتی دە مرۆڤ دابا و جەهل نەبا، مرۆڤ دەسووتا و نەدەما. کەوایە جەهل دڵخوازە چونکە بەقای ژین بەو بەندە. هەروەتر عیلمیش دڵخوازە چونکە کەرەسەیەکە بۆ ناسینی هەق. کەوایە، هەردووک یاریدەدەری یەکترن و

هەموو دژەکان وەهان: شەو هەرچەند دژی ڕۆژە، بەڵام یارمەتیدەری ئەوە و یەک کار دەکەن. ئەگەر هەمیشە شەو با، هیچ کارێک جێبەجێ نەدەبوو و پێکنەدەهات و ئەگەر هەمیشە ڕۆژ با، چاو و سەر و مێشک زەق دەمانەوە و شێت دەبوون و بێکەلک. کەوایە لە شەو دا، دەحەسێنەوە و دەخەون و هەموو ئەندامەکان، لە مێشک و بیر و دەست و پێ و چاو و گوێ، هەموویان هێز دەگرن و ڕۆژ ئەو هێزانە خەرج دەکەن. کەوایە تەواوی دژەکان لە چاو ئێمە دژی دیاری دەکەن ـ لە چاو زانا، هەموو یەک کار دەکەن و دژ نین.

سەیری عالەم بکە کامە خراپە کە چاکەی تێدانەبێ و کامە چاکە هەیە کە خراپەی تێدا نەبێ؟ بۆ وێنە یەکێک بە تەمای کوشتن بوو، [بەڵام] خەریکی زینا بوو. ئەو خوێنە نەڕژا. لەبەر ئەوەی کە زینایە خراپە، لەبەر ئەوە کە بوو بە هۆی بەرگریی لە قەتڵ باشە. کەوایە چاکە و خراپە یەک شتن ـ لێک جیا نین.

لەبەر ئەوە ئێمە بەحسمان دەگەڵ گاوران هەیە ـ کە ئەوان دەڵێن « دوو خودا هەیە: یەکێک ئافرێنەری خێر و یەک ئافرێنەری شەڕ » نووکە، تۆ نیشانم بدە خێری بێ شەڕ، هەتا ئێمە دانی پێدابێنین کە خودای شەڕ هەیە و خوای خێر. ئەمە مەحاڵە، چونکە خێر لە شەڕ جیا نیە ـ چونکە خێر و شەڕ دوو نین و دە نێوان ئەوان دا جیایی نیە. کەوایە دوو خوڵقێنەر مەحاڵە.

## سەر ئەوەیە سڕێکی تێدابێ!

هەرکەس کە تەمای جێگە و سەفەرێک بگرێ، بیرێکی ماقووڵ رووی تێدەکا «ئەگەر بچمە وێ، گەلێک مەسڵەحەت و گەلێک کار جێبەجێ دەبێ. وەزعم باش دەبێ و دۆستەکان شاد دەبن و بە سەر دوژمنەکان دا زاڵ دەبم » ئەو بەم تەمایەیە و مەبەستی هەق شتێکی دیکەیە. گەلێک تەگبیری کرد و گەلێک چارەی دۆزیەوە، یەکیان بە پێی ویستی ئەو سەری نەگرت. کەچی دیسانیش هەر بڕوای بە تەگبیر و ئیختیاری خۆی هەیە.

وێنەکەی وەها دەبێ کە: کەسێک لە خەونی دا دەبینی کە کەوتۆتە شارێکی غەریب و لەوێ چ ناسیاوی نیە. نە کەس ئەو دەناسێ و نە ئەو کەس. سەرگەردان دەگەڕێ. ئەو پیاوە پەشیمان دەبێتەوە و حەسرەت دەخوا کە « بۆچ هاتمە ئەو شارە کە ناسیاو و دۆستێکم نیە؟ » دەست لە پشت دەستی دەکوتێ و لێوی دەکورۆژێ. کاتێک وە ئاگا بێتەوە، نە شار دەبینێ و نە خەڵک. بۆی دەردەکەوێ کە ئەو خەم و نارەحەتی و حەسرەت خواردنە بێفایدە بوە. پەشیمان دەبێتەوە لەو حاڵەتەی و بە زایەی دادەنێ. دیسان، کە جارێکی دیکە خەوی لێبکەوێتەوە، بە هەڵکەوت خۆی لەو شارە ببینێتەوە و دەست بکا بە خەم و نارەحەتی و حەسرەت خواردن و پەشیمان بێتەوە لە هاتن بۆ ئەو شارە و هیچ بیر ناکاتەوە و وە بیری نایەتەوە کە « من لە بێداریی دا لەو خەم خواردنە پەشیمان ببوومەوە و دەمزانی کە ئەو زایە بوە و خەو بوە و بێفایدە. »

نووکە، وەهایە: خەڵک سەدهەزار جار دیتوویانە کە ویست و تەگبیری ئەوان باتڵە و هیچ کارێک بە پێی ویستی ئەوان سەری نەگرت، ئیللا هەقتەعالا فەرامۆشییان بە سەر دادێنێ کە هەمووی لە بیر دەکەن و پەیڕەوی بیر و ئیختیاری خۆیان دەبنەوە.

ئیبراهیمی ئەدهەم، لە سەردەمی پادشایەتی دا، چووبوو راو. بە شوێن ئاسکێک دا ئاژۆتی هەتا بە تەواوەتی لە قۆشەن جوێ بۆوە و دوور کەوتەوە. ئەسپ شەلاڵی ئارەقە ببوو لەبەر ماندوویەتی کەچی ئەو هەروا دەیاژۆت لەو بیابانە. کە لە رادە تێپەڕی، ئاسک وە زمان هات و ئاوڕی داوە کوتی « تۆیان بۆ ئەوە نەخوڵقاندوە و لە

عەدەمەوە بۆ ئەمە پێکنەهاتووی کە من راو بکەی، وای دانێ کە منت گرتوە، مەگەر چ دەبێ؟ »

ئیبراهیم کە ئەوەی بیست، نەعرەتەیەکی لێدا و خۆی لە سەر ئەسپ فڕێ دا. کەس لەو سارایە نەبوو، جگە لە شوانێک. لە بەری پاڕاوە و بەرگی پادشایانەی جەواهیرنیشان و چەک و ئەسپی خۆی دایە و گوتی « ئەوانەم لێوەرگرە و ئەو لبادە بدە بە من و بە کەس مەڵێ و کەس لە حاڵی من ئاگادار مەکە! »

لبادی کردە بەر و رێی گرتە بەر.

نووکە، بڕوانە غەرەزی ئەو چ بوو و مەبەستی هەق چ بوو! ئەو دەیەویست ئاسک راو بکا، هەقتەعالا ئەوی بە ئاسک راو کرد، هەتا بزانی کە لە عالەم دا، هەر ئەمە پێکدێ کە ئەو بیەوێ و مراد و مڵکی ئەوە و مەبەست پەیڕەوی ئەوە.

عومەر، بەر لە ئیسلام، چوە ماڵە خوشکی خۆی. خوشکی قورئانی دەخوێندەوە، بە دەنگی بەرز. کاتێک براکەی دیت، شاردیەوە و بێدەنگ بوو. عومەر شیری هەڵکێشا و گوتی « هەڵبەت بڵێ کە چت دەخوێندەوە و بۆچ شاردتەوە، دەنا ئەستۆتت هەرئێستا بە شیر دەبڕم! هیچ ئەمانت نادەم! »

خوشکی زۆر ترسا چونکە تووڕەیی و سامی ئەوی دەزانی. لە ترسی گیان درکاندی. گوتی « لەم کەلامەم دەخوێندەوە کە هەقتەعالا ئێستا بۆ مەحەممەدی ناردوە. »

گوتی « بیخوێنەوە هەتا بیبیسم! »

سوڕەتی تاهای خوێندەوە.

عومەر زۆر تووڕە بوو و غەزەبی سەد بەرابەر بوو. گوتی « نووکە، ئەگەر هەرئێستا تۆ بکووژم، زەعیفکوژیی دەبێ. لە پێشدا بچم سەری ئەو ببڕم، ئەوسا خەریکی کاری تۆ بم. » هەروا، لەبەر غەزەبی زۆر، بە شیری هەڵکێشراو، رووی لە مزگەوتی مستەفا کرد.

لە رێگا کاتێک دەمڕاستانی قورەیش ئەویان دیت، گوتیان « ئەها، عومەر تەمای مەحەممەدی گرتوە! هەڵبەت ئەگەر کارێک بکرێ لە دەستی ئەوە دێ. » چونکە عومەر گەلێک بە هێز و پیاوانە بوو و رووی لە هەر لەشکرێک کردبا، هەڵبەت سەردەکەوت و

سەری بڕاوی ئەوانی بە نیشانە دەهێناوە، وەها کە مستەفا هەمیشە دەیفەرموو کە «خودایا، دینی من بە عومەر پێش بخە، یا بە ئەبووجەهل! » چونکە ئەو دوانە، لە سەردەمی خۆیان دا، بە هێز و پیاوەتی ناوبانگیان هەبوو. لە ئاخر کاتێک عومەر بوو بە موسڵمان، عومەر هەمیشە دەگریا و دەیگوت « یا رەسووڵ، هاوار بە من ئەگەر ئەبووجەهلت وە پێش من دابا و گوتبات کە خودایا، دینی من بە ئەبووجەهل وە پێش بخە یا بە عومەر، من چیم لێ بە سەر دەهات، لە زەلالەت دا دەمامەوە. »

بە هەر حاڵ، لە رێ دا، بە شیری هەڵکێشراو، رووی لە مزگەوتی رەسووڵ کرد. لەم بەینە دا جوبرەییل وەحی بۆ مستەفا هێنا کە « نووکە، یا رەسووڵی خودا، عومەر دێ هەتا رووی لە ئیسلام بنێ، وە خۆی بگرە! »

هەر کە عومەر لە دەرگای مزگەوت وە ژوور کەوت، بە ئاشکرا دیتی کە تیرێک لە نووری مستەفا دەرپەڕی و لە سەر دڵی نیشت. نەعرەتەیەکی لێدا، بێهۆش کەوت. خۆشەویستی و ئەشقێک لە گیانی دا پێکهات و دەیەویست دە مستەفا دا بتوێتەوە و لەبەر رادەی مەحەببەت مەحو بێتەوە. گوتی « نووکە، یا نەبی خودا، ئیمانم پێبنوێنە و ئەو وشە پیرۆزە بڵێ هەتا بیبیسم! »

کاتێک بوو بە موسڵمان، گوتی « نووکە، بە شوکرانەی ئەوەی کە بە شیری هەڵکێشراو بە تەمای تۆ هاتم و کەفارەتی ئەو کارە، دوای ئەوە لە هەرکەس کەموکووڕییەک لە هەق تۆ دا ببیسم، دەستبەجێ ئەمانی نەدەم و بەم شیرە سەری بپەڕێنم. »

لە مزگەوت دەرکەوت. لە نەکاو، باوکی هاتە پێش. گوتی « ئیمانت هێنا؟ »

دەستبەجێ، سەری پەڕاند و شیری خوێناویی بە دەستەوە دەڕۆیشت.

دەمڕاستانی قورەیش شیری خوێناوییان دیت. گوتیان « ئاخر، بەڵێنت دابوو کە سەر دێنمەوە، کوا سەر؟ »

گوتی « ئەوەش سەر! »

گوتیان « ئەم سەرەت لێرە برد! »

گوتی « نا، ئەمە ئەو سەر نیە، ئەمە ئەم سەرەیە. »

نووکە بڕوانە کە عومەر تەمای چی هەبوو و هەقتەعالا مەبەستی چ بوو، هەتا تێبگەی کە کارەکان هەموو وایان لێدێ کە ئەو بیەوێ!

نووکە، ئەگەر بە ئێوەش بڵێن کە « چتان هێناوە؟ »

بڵێن « سەرمان هێناوە! »

دەڵێن « ئێمە ئەو سەرەمان دیبوو! »

بڵێن « نا، ئەمە ئەو نیە، ئەمە سەرێکی دیکەیە!»

سەر ئەوەیە کە سڕێکی تێدابێ، دەنا هەزار سەر پووڵێکی ناهێنێ.

## وه سەر ئاو کەوتنی کاسە
## بە حوکمی کاسە نیە، بە حوکمی ئاوە!

« ئێمە هەروەک کاسەین لە سەر ئاو. وەسەر ئاو کەوتنی کاسە بە حوکمی کاسە نیە، بە حوکمی ئاوە. »

گوتی « ئەمە عامە. ئیللا هەندێک دەزانن کە لە سەر ئاون و هەندێک نازانن. »

فەرمووی « ناکرێ بڵێی ئەمە عامە. تەواوی عیلمەکان ئەو فێری کردین. چونکە هەموو شتەکان بە گشتی ئەو خوڵقاندی، بەبێ شک، هەموو کاسەکان لە سەر ئاوی هێز و ویستن. کاسە وە سەر ئاو دەکەوێ و ئاو ئەو بە شێوەیەک دەبا کە هەموو کاسەکان تەماشاگەری ئەو کاسەیە دەبن. کاسەش وە سەر ئاو دەخا کە هەموو کاسەکان لێیڕادەکەن و پێیان نەنگە و ئاو ئیلهامی راکردنیان دەداتێ و توانایی راکردن. نووکە، ئەو کەسەی کە بە عامی دەبینێ، دەڵێ کە « لە بابەت دەستەڵاتەوە، هەردووک لە ژێر دەستەڵاتی ئاو دان، یەکە. » ئەو وڵام دەداتەوە کە « ئەگەر تۆ لوتف و چاکەی گەڕانی ئەم کاسەیەت لە سەر ئاو دیتبا، بیرت لە سفەتی عام نەدەکردەوە.»

وەها کە مەعشووقی کەسێک پیسایی و گەندی تێدایە، هەرگیز بە بیری ئاشق دادێ کە « مەعشووقی من پیسایی تێدایە لەو وەسفە عامە دا کە هەردووک جسمن و لە یەک شوێن دان و لە شەش لایەنن و سازکراو و شیاوی فەوتانن؟ » هەرگیز لەو دا ئەو دوویە ناگونجێ و هەرکەس ئەم سفەتە عامەی فێر بکا، ئەو بە دوژمنی خۆی دەژمێرێ و بە ئیبلیسی خۆی دادەنێ.

دەگەڵ تۆ ناکرێ بەحس کردن. چونکە روانگەکانی ئێمە تێکەڵ بە جوانیین و دەربڕینی جوانیی لە غەیری ئەهلەکەی زوڵمە ـ ئیللا بە ئەهلەکەی. ئەمە عیلمی نەزەرە عیلمی بەحس نیە. گوڵ و شکۆفە ناپشکوێن بە پاییز ـ کە ئەمە بەحسە و دژایەتی و بەربەرەکانییە دەگەڵ پاییز و گوڵ ئەو تەبعەی نیە کە بەربەرەکانی دەگەڵ پاییز بکا. ئەگەر نەزەری هەتاوی خاکەلێوەی وێکەوت، دێتە دەر لە هەوای موعتەدلی عادل دا، دەنا نا، سەری ناوە و چۆوە سەر رەگەزی خۆی. پاییز بەو دەڵێ « ئەگەر تۆ لکی ویشک نی، لای من سەر دەرکە ئەگەر پیاوی! »

ئەو دەڵێ « لای تۆ، من لکی ویشک و ناپیاوم، هەرچی پێتخۆشە، بیڵێ! »

تۆ کە بەهائەددینی، ئەگەر پیرێژنێک کە ددانی نیە، رووی هەروەک پشتی سووسەمار چین لە سەر چین، بێ و بڵێ کە « ئەگەر پیاوی و لاوی، نووکە هاتوومە لای تۆ، ئەمەش ئەسپ و ئەمەش مەیدان، پیاوەتی بنوێنە، ئەگەر پیاوی! » دەڵێی «مەعازەڵڵا! وەڵڵا کە پیاو نیم و ئەوەی بۆیان گێراوییەوە درۆیە. کە تۆم جووت بی، ناپیاوەتی خۆشترە. »

دووپشک دێ، چزووی رەپ کردوە دەچێتە سەر ئەندامی تۆ کە « بیستوومە کە پیاوێکی دەم بە بزەی. خۆش پێبکەنە، هەتا پێکەنینی تۆ ببینم! »

دەڵێ « کە تۆ هاتی، من هیچ پێکەنینێکم نیە و هیچ تەبعم خۆش نیە. ئەوەی کە گوتوویانە درۆیە. هەموو ئەسپابی پێکەنینم بەو هیوایەن کە بڕۆی و لە من دوور کەویەوە. »

گوتی ئاخت کرد، زەوق رۆیشت، ئاخ مەکە، هەتا زەوق نەڕوا.

فەرمووی هەندێک جار وا رێکدەکەوێ کە ئەگەر ئاخ نەکەی، زەوق بڕوا و ئەگەر وەها نەبا نەدەبا هیچ تاعەتێکی دەربڕیبا ـ کە هەمووی دەربڕینی زەوقە. ئەم قسەیەش کە تۆ دەیکەی، لەبەر ئەوەیە کە زەوق بێ. کەوایە ئەگەر هەڵگری زەوقی، دەگەڵ هەڵگری زەوق نزیکایەتی دەکەی هەتا زەوق بێ.

ئەمە وەک ئەوە دەچێ کە خەوتوو بانگ بکەن کە « رابە! بوو بە رۆژ، کاروان دەڕوا! »

دەڵێن « هەرا مەکە ـ ئەو لە زەوق دایە، زەوقی دەڕەمێتەوە! »

دەڵێ « ئەو زەوقە فەوتانە و ئەم زەوقە رزگاریی لە فەوتان. »

دەڵێن « مەیشێوێنە! ـ کە ئەم بانگ کردنە بەری فکر کردنەوە دەگرێ. »

دەڵێن « بەم بانگە، خەوتوو وە فکر دەکەوێ، دەنا لەم خەوە دا ئەو چ فکرێکی هەیە؟ دوایی کە وە ئاگا هاتەوە، وە فکر دەکەوێ. »

ئەوجار، بانگ دوو جۆرە: ئەگەر بانگدەر لە عیلم دا لە سەرووی ئەو بێ، دەبێتە هۆی زێدە بوونی فکر. چونکە وریاکەرەوەکەی خاوەنی عیلمە و ئاگایی هەیە کە ئەو

لەو خـــەوە غـەفـڵــەتە هەڵدەســتـێنێ و لە عــالەمـی خـۆی ئاگــاداری دەکـا و بەرەو ئەوێندەرێی دەبا. کـەوایـە فکری ئەو بەرز دەبێــتـــەوە، چونکە لە جــێگەیەکی بەرز بانگیان کردوە. بەڵام ئەگەر بە پێچەوانە بێ، یانی وەئاگاهێنەرەکەی لە ژێر ئەو بێ لە ئەقڵ دا، کـاتێک ئەو هـەسـتـێنێ چاو لـە ژێر دەکـا. چونکە وەئاگـاهێنـەرەکـەی لە خوارە، بێشک ئەو چاو لە ژێر دەکا و فکری بۆ عالەمی ژێروو دەچێ.

# مرۆڤ داخوازی خۆ نواندنە!

مرۆڤ، گشتیان داخوازی مەزهەر و خۆ نواندنن. گەلێک ژن داپۆشراون، بەڵام روو دەردەخەن هەتا خوازرانی خۆیان بە تاقی بکەنەوە، وەها کە تۆ گوێزان بە تاقی بکەیەوە. ئاشق بە مەعشووق دەڵێ « من نەخەوتم و نەمخوارد و وەهام لێهات و وام لێهات، بێ تۆ! » ماناکەی ئەوەیە کە تۆ داخوازی مەزهەری، مەزهەری تۆ منم هەتا مەعشووقایەتیی بە ئاشق بفرۆشێ و ئاشق بکاتە مەزهەری ئەشق و حوسنی خۆی. هەروەتر زانایان و هونەرمەندان، گشتیان داخوازی خۆ نواندنن. [من گەنجێکی شاراوە بووم، پێمخۆش بوو بناسرێم!]*

حوکمەکانی ئەو لە گشت خەڵک دا دەردەکەوێ، چونکە هەموو سێبەری هەقن و سێبەر وە خودی کەس دەچێ. ئەگەر پێنج پەنجە بکرێنەوە، سێبەریش دەکرێتەوە و ئەگەر رکووع بکا ئەویش رکووع دەکا و ئەگەر درێژ بێ، ئەویش درێژ دەبێ. کەوایە خوڵقاندنی داخواز، داخوازی خوازران و خۆشەویستیین ـ کە دەیانەوێ هەتا هەموو خۆشەویستی ئەو بن و خۆبەکەمزان، دەگەڵ دوژمنانی ئەو دوژمن و دەگەڵ ئەولیای ئەو دۆست. ئەوانە هەموو حوکم و سفەتەکانی هەقن کە لە سێبەر دا خۆ دەردەخەن. سێبەری ئێمە خەبەری لە ئێمە نیە، بەڵام ئێمە خەبەرمان لێیەتی و سەبارەت بە زانایی خوداش، خەبەری ئێمە حوکمی بێخەبەریی هەیە. ئەو شتانەی کە لە کەس دا هەیە، هەموو لە سێبەر دا خۆ دەرناخەن ـ جگە لە هەندێک شت. کەوایە هەموو سفەتەکانی هەق لەم سێبەری ئێمە دا خۆ دەرناخەن ـ هەندێک دەردەکەوێ. [ئەوەی لە عیلم و زانست بە ئێوە دراوە هەندێکە.]**

* کنت کنزا مخفیا فاحببت ان اعرف

** و ما اوتیتم من العلم الا قلیلا. سوورەی الاسراء، ئایەی ٨٥

## لای هەق، چ پێویستە دەست و پێ؟

شێخ ئیبراهیم، دەروێشێکی ئازیزە. کاتێک دەیبینم وە بیر دۆستان دەکەومەوە. مەولانا شەمسەددین عینایەتێکی زۆری پێ هەبوو. هەمیشە دەیگوت « شێخ ئیبراهیمی ئێمە » و لە سەر خۆی زیاد دەکرد.

عینایەت شتێکی دیکەیە و ئیجتهاد کارێکی دیکەیە. ئەنبیا بە هۆی ئیجتهاد بە پلەی پێغەمبەرایەتی نەگەیشتن و ئەو دەوڵەتەیان بە هۆی عینایەت دەست کەوت. ئیللا سوننەت وەهایە کە هەرکەس ئەوی دەست کەوت، شێوە و ژیانی ئەو بە پێی ئیجتهاد و سەلاح دەبێ و ئەوەش بۆ عەوامە هەتا بڕوا بەوان و بە گفتی وان بکەن. چونکە ئەوان چاو لە دەروون ناکەن و سەیری رواڵەت دەکەن. ئەگەر عەوام پەیڕەویی رواڵەت بکەن، بە هۆ و بەرەکەتی ئەوەوە، رێیان دە دەروون دەکەوێ. ئاخر، فیرعەونیش ئیجتهادی گەورەی دەکرد لە بەخشین و چاکە و بڵاو کردنەوەی خێر. ئیللا چونکە عینایەت نەبوو، لەبەر ئەوە ئەو تاعەت و ئیجتهاد و چاکەی ئەو شۆقێکی نەبوو و هەمووی داپۆشی.

هەر ئەوجۆرەی کە میرێک لە قەڵایەک، چاکە و خێر دەگەڵ دانیشتوانی قەڵا دەکا و مەبەستی ئەوەیە کە دژی شا راپەڕێ و شۆڕش بگێڕێ. بێشک چاکەی ئەو رێز و شۆقی نابێ، هەرچەند بە گشتی ناکرێ نەفی عینایەت بکەی لە فیرعەون و بەشکەم هەقتەعالا عینایەتی نهێنی بەو هەبێ، بۆ مەسڵەحەتێک ئەوی رەد کردەوە. چونکە پادشا غەزەب و لوتف، خەڵات و زیندانی هەردووک هەیە. ئەهلی دڵ بە تەواوەتی لەو نەفی عینایەت ناکەن، ئیللا ئەهلی رواڵەت ئەو بە تەواوەتی رەد دەکەنەوە و مەسڵەحەت لەوە دایە بۆ پتەو بوونی رواڵەت. پادشا یەکێک لە بەر چاوی خەڵک لە دار دەدا، لە جێگەیەکی گەلێک بەرز، هەڵیداوەسن ـ هەرچەند لە ماڵ، دوور لە چاوی خەڵک، لە بزمارێکی بێنرخیش دەتوانن هەڵیاوەسن. ئیللا دەبێ خەڵک ببینن و پەند وەرگرن و بڕشتی حوکم و فەرمانبەریی لە ئەمری شا دەرکەوێ.

ئاخر، هەموو دارەکان لە چێو نین. پلە و پایە و دەوڵەتی دونیاش دارێکی گەلێک بەرزە. کاتێک هەقتەعالا بیەوێ کەسێک بگرێ، لە دونیا پلەیەکی مەزن و پادشایەتییەکی گەورەی دەداتێ ـ هەروەک نەمروود و فیرعەون و وێنەی ئەوانە.

ئەوانە هەموو وەک دارێکن کە هەقتەعالا ئەوان لە سەر ئەو دەدا هەتا گشت خەڵک لەوێ ئاگادار بن. چونکە هەقتەعالا دەفەرموێ « گشت عالەمم خوڵقاند و غەرەز لەو هەموە خۆ دەرخستنی خۆمان بوو ـ هەندێک جار بە لوتف و هەندێک جار بە قەهر. »

ئەمە ئەو پادشاییە نیە کە مڵکی ئەو پەسنکەرێکی بەس بێ. ئەگەر زەڕەکانی عالەم هەموو پەسنکەر بن، لە پەسنی ئەو قاسر و عاجزن. کەوایە هەموو خەڵک شەو و رۆژ هەق دەردەبڕن، ئیللا هەندێک دەزانن و لە دەربڕین ئاگادارن و هەندێک غافڵن. هەر ئەوجۆرەی کە میرێک فەرمووی هەتا لە یەکێک بدەن و ئەدەبی بکەن. ئەو کەسە هاوار دەکا و دەقیژێنێ و سەرەڕای ئەوە هەردووک دەربڕی حوکمی میرن ـ هەرچەند ئەو کەسە لە بەر ئێش هاوار دەکا، ئیللا هەموو کەس دەزانێ کە لێدەر و وێکەوتوو مەحکوومی میرن و لە هەردووی ئەوانە حوکمی میر دەردەکەوێ. ئەوەی کە دان بە هەق دادێنێ هەمیشە هەق دەردەبڕێ و ئەوەی کە دانی پێداناهێنێ دیسان دەربڕە، چونکە ئیسباتی شتێک بێ نەفی لە مێشک داناگونجێ و بێ تام و چێژ دەبێ. بۆ وێنە بەحسکەرێک لە کۆڕ دا مەسەلەیەک بڵێ. ئەگەر لەوێ کەسێک لە ئاستی رانەوەستێ و نەڵێ « وانیە، قەبووڵی ناکەم! » ئەو ئیسباتی چ دەکا و باسی ئەو چ چێژێکی دەبێ؟ چونکە ئیسبات لە ئاست نەفی دا خۆشە. هەروەتر، ئەم عالەمەش کۆڕی خۆ دەرخستنی هەقە، بێ دان پێداهێنان و نەهێنان، ئەم کۆڕە شۆقێکی نابێ و هەردووک دەربڕی هەقن.

یاران چوونە لای میری ئەکدەشەکان*. لێیان تووڕە بوو کە « ئەو هەموە چتان دەوێ؟ » گوتیان « ئەو کۆمەڵە و حەشامەتەی ئێمە بۆ ئەوە نیە کە زوڵم لە کەسێک بکەین. بۆ ئەوەیە هەتا لە سەبر و سێبووریی دا دەسگرۆ بین و یاریدەی یەکتر بدەین.» هەر ئەوجۆرەی کە لە تازیە خەڵک کۆ دەبنەوە، بۆ ئەوە نیە کە بەری مەرگ بگرن، ئیللا غەرەز ئەوەیە کە هەتا خاوەن تازیە دڵی بدرێتەوە و خۆف لە بیری دەرکەن.

دەروێش حوکمی یەک کەسیان هەیە. ئەگەر ئەندامێکی لەش بێشێ، باقی ئەندامەکان دەردەدار دەبن: چاو بینین وە لا دەنێ و گوێ بیستن و زمان گوتن ـ هەموو لەوێ کۆ دەبنەوە. شەرتی دۆستایەتی و یاریی ئەوەیە خۆی فەدای یار بکا و خۆی بۆ یار لە فەرتەنە باوێ. چونکە هەموو روویان لە یەک شتە و خنکاوی یەک بەحرن. شوێنەواری ئیمان و شەرتی ئیسلام ئەوەیە. بارێک کە بە لەش بیکێشن کەی

وەک بارێک دەچێ کە بە گیان بیکێشن؟ دیندار کاتێک خۆی فەدای هەق بکا، کەی بیر لە بەڵا و مەترسی و دەست و پێ دەکاتەوە؟ کە بۆ لای هەق دەچی، چ پێویستە دەست و پێ؟ دەست و پێی بۆ ئەوە داوە هەتا لەوەوە بۆ ئەو لا بچی، بەڵام کە بۆ لای پێدەر و دەستدەر دەچی، ئەگەر لە دەست بچی و لە پێ بکەوی و بێ دەست و بێ پێ بی، چ غەمە؟

* ئەکدەش بە مانای دوورەگە و دووتوخمەیە. و واوێدەچێ لە سەردەمی مەولەوی دا چین و توێژێکی کۆمەڵگا بوون کە میر و سەرۆکی خۆیان هەبوە.

مەحوی ئەم وشەی بەکار هێناوە بە مانای دوورەگە: ئەکدەشی خینزیر و سەگ، مەعجوونی بەنگ و خەندەریس/ داکی دایە ڕێزباریی، بابی بابیی قەحبەباب (دیوانی مەحوی ل ٣٢٧).

## ڕێگاکان جۆراوجۆر، بەڵام ئامانج یەکە!

دەبێ بەرەو تووقات بڕۆین ـ کە ئەولا گەرمەسێرە! هەرچەند ئەنتاکیە گەرمەسێرە، بەڵام ڕۆمییەکان لەوێن، لە قسەی ئێمە ناگەن. هەرچەند ڕۆمی واش هەن کە تێدەگەن. ڕۆژێک بۆ جەماعەتێک قسەم دەکرد دە نێو ئەوانیش دا جەماعەتێک کافر بوون. دە نێو قسەکان دا، دەگریان و زەوقیان دەکرد و حاڵەت دەیگرتن.

یەکێک پرسی: ئەوان چ تێدەگەن و چ دەزانن لە جنسی قسەی وا؟ موسڵمانێکی هەڵبژاردە لە هەزار یەک تێدەگا، ئەوان چ تێدەگەیشتن کە دەگریان؟

فەرمووی کە « پێویست ناکا لە نەفسی قسە بگەن، ئەوەی کە ئەسڵی قسەیە، لەو دەگەن. ئاخر هەموو دەربڕی تاکانەیی خودان و دەربڕی ئەوەن کە خودا خوڵقێنەر و ڕۆژیدەرە و دەستەڵاتی بە سەر هەموو شت دا هەیە و گەڕانەوە بۆ لای ئەوە و عەزاب و عەفو هی ئەوە. کە ئەم قسەیان بیست و ئەم قسەیە پەسنی هەقە و باسی هەقە، لەبەر ئەوە هەموویان شەوق و زەوقیان تێکەوت ـ کە لەم قسەیەوە بۆنی مەعشووق و داخوازی ئەوان دێ. »

هەرچەند ڕێگاکان جۆراوجۆرن، بەڵام ئامانج یەکە. نابینی کە ڕێگا بۆ کابە گەلێکە؟ هەندێک ڕێگایان لە ڕۆمەوەیەوە و هەندێک لە شام و هەندێک لە عەجەم و هەندێک لە چین و هەندێک بە ڕێی دەریا دا، لە هیند و یەمەنەوە. کەوایە ئەگەر سەیری ڕێگاکان بکەی، جیاوازییەکی گەورە و دژایەتی لە ڕادە بەدەرە. بەڵام کە سەیری ئامانج بکەی، هەموو یەکڕا و یەکگرتوون. هەموویان دەروونیان بەرەو کابە یەکگرتوویی و ئەشق و مەحەببەتێکی گەورەیان هەیە ـ کە لەوێ دژایەتی ناگونجێ. ئەوێ نە پێوەندیی بە کوفرەوە هەیە و نە بە ئیمان ـ یانی ئەو پێوەندییە تێکەڵ بەو ڕێگا جیاوازانە نیە کە گوتمان. کە گەیشتنە وێ، ئەو کێشە و شەڕ و دژایەتی کە لە ڕێگا دەیانکرد، کە ئەم بەوی دەگوت « تۆ باتڵی و کافری! » و ئەوی دیکە بەم وادەڵێ، کە گەیشتنە کابە، دەرکەوت کە ئەو شەڕانە لە ڕێگاکان بوو و ئامانجیان یەک بوە.

بۆ وێنە ئەگەر کاسە گیانی هەبا، دەبوو بە بەندەی کاسەگەر و ئاشقی دەبوو. نووکە ئەو کاسەی کە سازیان کردوە، هەندێک دەڵێن کە دەبێ وەهای لە سەر خوان دانێن و هەندێک دەڵێن کە دەبێ دەروونی بشۆن و هەندێک دەڵێن کە دەبێ دەرەوەی

بشۆن و هەندێک دەڵێن کە هەمووی و هەندێک دەڵێن پێویست نیە بیشۆن. جیاوازی لە سەر ئەو شتانەیە. بەڵام لە سەر ئەوەی کە کاسە بێشک خوڵقێنەر و سازکەرێکی هەیە و لەخۆوە نەبوە، یەکڕان و کەس دژایەتی لە سەر ئەوە نیە.

گریمان نووکە مرۆڤ دە دڵی خۆیان دا، لە دەروونەوە، هەقیان خۆش دەوێ و داخوازی ئەون و نیازیان بەو هەیە و چاوەڕوانیی گشت شتێکیان لەو هەیە و جگە لەو کەس بە دەستەڵاتدار و توانا دانانێن. وەها مانایەک نە کوفرە و نە ئیمان و لە دەروون دا ئەوە ناوێکی نیە. بەڵام کاتێک لە دەروونەوە ئاوی مانا بەرەو پلووسکی زمان بڕژێ و ببێتە نەقش و رستە، لێرە ناوی کوفر و ئیمان و چاک و خراپ بە خۆوە دەگرێ. هەروەک گیا کە لە زەوی دەڕسکێ. سەرەتا روخسارێکیان نیە و کاتێک روو دەم عالەمە دەکەن، لە سەرەتای کار شلک و ناسک و سپین، ماوەیەک کە هەنگاو بەرەو ئەم عالەمە هەڵدێننەوە و بەرەو عالەم دێن، خەست و چڕ دەبن و رەنگی دیکە بە خۆوە دەگرن. جا چونکە دیندار و کافر هاودەمن، ئەگەر بە لەفز هیچ نەبێژن، یەکن.

بیر لێپرسینەوەی لە سەر نیە و دەروونی عالەم ئازادییە، چونکە بیر ناسکن ـ ئەوان حوکمێکیان لە سەر نادرێ. ئەو بیرانە هەقتەعالا پێکیهێناون دە تۆ دا. تۆ ناتوانی بە سەدهەزار هەوڵ و تێکۆشان لە خۆتی دوور کەیەوە. کەوایە ئەوە کە دەڵێن خودا پێویستی بە حاجەت نیە، نابینی کە ئەو بیر و خەیاڵانەی چۆن دە تۆ دا بێ کەرەسە و بێ قەڵەم و رەنگێک پێکدێنێ؟ ئەو بیرانە هەروەک باڵندەی ئاسمان و ئاسکی سڵن ـ کە ئەوان بەر لەوەی کە بگری و لە قەفەس دا حەبسیان بکەی، فرۆشتنیان لە باری شەرعەوە رەوا نیە. ناکرێ باڵندەی ئاسمان بفرۆشی. چونکە لە بەیعەت دا، تەسلیم شەرتە و چونکە ناکرێ، چ تەسلیم دەکەی؟ کەوایە بیرەکان هەتا دە دەروون دان، بێ ناو و نیشانن، ناکرێ حوکمیان لە سەر بدەی ـ نە بە کوفر و نە بە ئیمان. هیچ قازییەک دەڵێ کە « تۆ لە دەروون دا وەهات درکاند و وەهات بەیعەت کرد » یا « وەرە سوێند بخۆ کە لە دەروون دا وەهات بیر نەکردۆتەوە »؟ وا ناڵێ ـ چونکە کەس لە سەر دەروون حوکمی نیە. بیر باڵندەی ئاسمانن. نووکە، کاتێک بێتە سەر زمان، دەکرێ حوکم بکەی بە کوفر و ئیسلام و چاک و خراپ.

هەر ئەوجۆرەی کە جسم عالەمیان هەیە، بیریش عالەمیان هەیە و خەیاڵیش

عالەمیان هەیە و گومانیش عالەمیان هەیە و هەقتەعالا لەوپەڕی هەموو عالەمە. نە ژووره و نە دەر. نووکە، سەیری دەستەڵاتی هەق بکە لەم بیرانە دا کە چۆن ئەوانە بێ وێنە و بێ قەڵەم و بێ کەرەسە دەنەخشێنێ! ئاخر ئەو خەیاڵ یا گومانە، ئەگەر سینگ بدڕی و زەڕە زەڕەی بکەی، ئەو بیرەی تێدا نابینیەوە ـ لە خوێن دا نابینیەوە و لە ڕەگ دا نایبینیەوە، لە سەر نایبینیەوە، لە ژێر نایبینیەوە. کاتێک دەستەڵاتی ئەو لەم بیرانە دا بەم ناسکییەیە کە بێنیشانە، کەوایە ئەو کە خوڵقێنەری هەمووی ئەوانەیە، سەیر بکە کە ئەو دەبێ چ بێنیشان و چ ناسک بێ. وەها کە ئەم قالبانە سەبارەت بە مانای کەسەکان پیسن، ئەم مانا ناسکە بێوێنانە لە چاو لوتفی باریی، جسم و روخساری پیسن و هەقتەعالا لەم عالەمی گومانە دا ناگونجێ و لە هیچ عالەمێک دا ـ کە ئەگەر لە عالەمی گومان دا بگونجێ، پێویست دەکرێ کە نەقش بە سەری دا موحیت بێ، کەوایە ئەو خوڵقێنەری گومان نیە. کەوایە روون بۆوە کە ئەو لەوپەڕی هەموو گومان و عالەمێکە.

هەموو دەڵێن کە « دەچینە کابە » و هەندێک دەڵێن « ئینشاڵڵا دەچین » ئەوانەی کە دەڵێن ئینشاڵڵا، ئاشقن. چونکە ئاشق خۆی بە خاوەن دەستەڵات و موختار نابینێ ـ مەعشووق بە دەستەڵاتدار دەبینێ. کەوایە دەڵێ « ئەگەر مەعشووق بخوازێ، دەچم! »

نووکە، مزگەوتی ئەلئەحرام لای ئەهلی رواڵەت، ئەو کابەیەیە کە خەڵک دەچن و لای ئاشقان و شازان، مزگەوتی ئەلئەحرام وەسڵی هەقە. کەوایە دەڵێن « ئەگەر هەق بخوازێ، پێیدەگەین و بە دیداری دەگەین. »

بەڵام ئەوەی کە مەعشووق بلێ « ئینشاڵڵا! » ئەوە نادرە. حەکایەتەکەی غەریبە. غەریبێک گەرەکە هەتا حەکایەتی غەریب ببیسێ و دەتوانێ بیبیسێ. خودا بەندەی وای هەیە کە ئەوان مەعشووقن و مەحبووب، هەقتەعالا خوازیاری ئەوانە و هەرچی ئەرکی ئاشقانە، بۆ ئەوانی دەکا و دەینوێنێ. هەر ئەوجۆرەی کە ئاشق دەیگوت «ئینشاڵڵا بگەینێ! » هەقتەعالا بۆ ئەو غەریبە دەڵێ « ئینشاڵڵا » کە ئەگەر خەریکی لێکدانەوەی بین، ئەولیای پێگەیشتوو تێیدا حەیران دەبن ـ کەوایە وەها سڕ و حاڵێک چۆن دەکرێ بە خەڵکی بڵێی؟ قەڵەم گەیشتە ئێرە و نووکی شکا. یەکێک وشتری لە سەر منارە نابینێ، تاڵی موو چلۆن لە زاری وشتر دا دەبینێ؟

گەیشتینەوە حەکایەتی یەکەم: نووکە، ئەو ئاشقانەی کە دەڵێن « ئینشاڵڵا » یانی دەستەڵاتدار مەعشووقە ـ ئەگەر مەعشووق بخوازێ، دەچینە کابە. ئەوان نوقمی

هەقن. لەوێ غەیر ناگونجێ و یادی غەیر حەرامە. چ جێی غەیرە؟ ـ کە هەتا خۆی مەحو نەکا، لەوێ ناگونجێ.

ئەحواڵی تەواوی عالەم خەونێکە، لێکدانەوەکەی لەو دونیا دەبێ. وەها کە خەونێک دەبینی کە سواری ئەسپی. [یانی] بە مراد دەگەی. ئەسپ چ پێوەندییەکی بە مراد گەیشتن هەیە؟ ئەگەر دیتت درەمی دروستیان دایەی، ماناکەی ئەوەیە کە قسەی دروست و باش لە زانایەک دەبیسی. درەم چ پێوەندی بە قسەوە هەیە؟ ئەگەر دیتت لە سێدارە داروی، دەبیە سەرۆکی قەومێک. دار چ پێوەندیی بە سەرۆک و سەروەرییەوە هەیە؟

هەروەتر، ئەحواڵی عالەم کە گوتمان خەونێکە، لێکدانەوەکەی لەو عالەم جۆرێکی دیکە دەبێ ـ کە وەک ئەمە ناچێ. خەونماناکەری خودا، لێکیدەداتەوە. چونکە هەموو شت لەو ئاشکرایە. وەها کە باغەوانێک دێتە باغێک، چاو لە درەختەکان دەکا، بێ ئەوەی کە میوە لە سەر لکەکان ببینێ، حوکم دەکا کە ئەمە خورمایە و ئەمە هەنجیرە و ئەوە هەنارە و ئەمە هەرمێیە و ئەمە سێوە ـ چونکە عیلمی ئەوەی زانیوە. حاجەتی قیامەت نیە کە لێکدانەوەکان ببینێ کە چ بوون و ئەو خەونانە چ ئاکامێکیان هەبوو: ئەو پێشتر دیتوویەتی کە بە چ ئاکامێک دەگەن، هەر ئەوجۆرەی کە باغەوان، پێشتر دەزانێ کە ئەم درەختە هەڵبەت چ بەرێک دەدا.

هەموو شتەکانی عالەم، لە ماڵ و ژن و جل، خوازیاری غەیرە، خوازیاری زات نیە. نابینی کە ئەگەر تۆ سەدهەزار درەمت هەبێ و برسی بی و نان نەدۆزیەوە، هیچ دەتوانی ئەو درەمانە بخۆی و بیکەیە خۆراکی خۆت؟ ژن بۆ منداڵە و قەزای شەهوەت، جل بۆ بەرگریی لە سەرمایە و هەروەتر، هەموو شتەکان پێکبەستراونەوە هەتا هەق. ئەو خوازیاری زاتە و ئەو لەبەر خۆی دەخوازێ نەک لەبەر شتێکی دیکە ـ چونکە ئەو لەوپەڕی هەموانە و باشتر لە هەموان و شەریفتر لە هەموان و ناسکتر لە هەموان، کەوایە ئەو بۆ کەمتر لەو چۆن دەخوازن؟ کە بگەنە ئەو، دەگەنە گشت داخوازێک، لەوێ ئیدی تێپەڕگەیەک نیە.

ئەو نەفسەی مرۆڤ جێی گومان وگرفتە. قەت، بە هیچ لەونێک ناکرێ گومان و گرفت لەو لابەی، مەگەر ئاشق بێ. دوای ئەمە گومان و گرفتی نامێنێ. [ئەشق کوێر و کەڕت دەکا]*

ئیبلیس کاتێک سوجدەی ئادەمی نەکرد و دژایەتی ئەمری کرد، گوتی « زاتی من

ئاگره و زاتی ئەو لە گڵ، چۆن دەکرێ سەرووتر، سوجدە بۆ ژێرتر بەرێ؟ » کاتێک ئیبلیسی بەم تاوانە و لەبەر بەربەرەکانی کردن و دەگەڵ خودا بە کێشە هاتن، بە لەعنەتی کرد و دووری کردەوە، گوتی « یاڕەب، ئاخ، هەمووی خۆت کردت و فیتنەی خۆت بوو! من بە لەعنەت دەکەی و دوورم دەکەیەوە؟ »

وە کاتێک ئادەم گوناهی کرد و هەقتەعالا ئادەمی لە بەهەشت دەر کرد، هەقتەعالا بە ئادەمی گوت کە « ئەی ئادەم، چونکە من لێمگرتی و لەبەر ئەو گوناهەی کە کردت زەجرم دای، بۆچ دمەقاڵەت دەگەڵ نەکردم؟ ئاخر تۆ بەڵگەت بە دەستەوە بوو کە بڵێی: هەموو لە تۆوەیە و خۆت کردت! ئەوەی کە بتەوێ، لە عالەم دا هەر ئەوە دەبێ و ئەوەی نەتەوێ، قەت نابێ. وەها بەڵگەیەکی راستی ئاشکرات هەبوو، بۆچ نەتگوت؟ »

گوتی « یاڕەب، دەمزانی. ئیللا تەرکی ئەدەبم نەکرد لە حەزرەتی تۆ دا و ئەشق نەیهێشت کە لێتپرسم. »

فەرمووی کە: ئەم شەرعە وەک مەشرەعە یانی دەراو. وێنەکەی وەهایە کە لە دیوانی پادشا: لەوێ، حوکمەکانی پادشا لە ئەمر و نەهی و سزا و عەدل و داد ـ بۆ خاس و عامە. و حوکمەکانی پادشای دیوان بێحەدە ـ لە ژماردن نایەن و گەلێک باش و بە قازانجە ـ خۆ گرتنی عالەم بەو بەندە. بەڵام ئەحواڵی دەروێشان و هەژاران هاودەمییە دەگەڵ پادشا و زانینی عیلمی حاکم. زانینی عیلمی حوکم لە کوێ و زانینی عیلمی حاکم لە کوێ و هاودەمیی پادشا لە کوێ؟ جیاوازییەکی مەزنە.

ئەسحاب و ئەحواڵی ئەوان وەک مەدرەسەیەکە کە فەقێی لێبن ـ مامۆستا بە پێی کارامەیی مواجب دەدا بە هەر فەقێیەک : بە یەکیان دە، یەکیان بیست و بە یەکیان سی. ئێمەش قسە بە قەدەر قەدری هەرکەس و کارامەیی ئەو کەسە دەڵێین.

* حبک الشی یعمی ویصم

## دۆستایەتی دەبێتە هۆی دوویی!

عــالەمـی دوژمنایـەتی تەنگە لـەچاو عــالەمـی دۆسـتــایـەتی. چونکە لە عــالـەمی دوژمنایەتی رادەکەن هەتا بگەنە عالەمی دۆستایەتی. عالەمی دۆستایەتیش تەنگە لەچاو ئەو عـالەمــەی کـە دۆسـتــایەتی و دوژمنایەتی تێدا نـەمـێنێ. دۆسـتــایەتی و دوژمنایەتی و کفر و ئیمـان هۆی دوویین، چونکە کفر ئینکارە و مونکیر کەسێکە کە مونکیری ئەو بێ و هەروەتر موقیر کەسێکە کە ئیقراری پێبکا. کەوایە دەرکەوت کە یەکانەیی و بێگانەیی هۆی دوویین و ئەو عالەمـە لەوپەڕی کفر و ئیمان و دۆستایەتی و دوژمنایەتی دایە. چونکە دۆستایەتی دەبێتە هۆی دوویی و عالەمێک هەیە کە لەوێ دوویی نیە، یەکیەتی تەواوە. کە گەیشتە وێ، لە دۆستایەتی و دوژمنایەتی دێتە دەر ـ کە لەوێ ئەم دوویە ناگونجـێن. کە بگاتـە وێ، لە دوویی جیـا دەبێتـەوە. کـەوایە ئەو عالەمەی یەکەم کە دوویی بوو و ئەویش ئەشق و دۆستایەتییە، لەچاو ئەو عالەمەی کە ئێستا باسی لێکرا، نزمە و نەوییە، کەوایە ئەوی ناوێ و دژایەتی دەگەڵ دەکا.

هەر ئەوجـۆرەی کـە مەنسـوور کـاتێک دۆسـتایەتی هەق گـەیشتـە نەهایەت، بوو بە دوژمنی خـۆی و خـۆی فـەوتاند. گوتی « اناالحق » یانی « من فـەنا بووم. هـەق مـاوە و بەس! » ئەوە ئـەوپەڕی خـۆ بە کـەم دانانە و نـەهایەتی بەندایەتی. یانی « ئـەو هـەیە و بەس. » ئیـدعـا و فـیـز ئەوەیـە کە بڵـێی « تۆ خـودای و مـن بەندە. » کـەوایـە هـەبوونی خۆشت دەخـەیە بەرچاو، کەوایە دوویی پێکدێ. ئەمـەش کە دەڵێی « هـوالحق! » دوویی ـ یە. چونکە هـەتا « انا » نەبێ، « هـو » ناگـونجێ. کـەوایە هـەق بوو گـوتی «اناالحق » چونگە جگە لەو بوونەوەرێک نەبوو و مەنسوور فەنا ببوو، ئەوە قسـەی هـەق بوو.

عالەمی خـەیاڵ لە چاوی عالەمـی وێنەکان و هەستپێکراوەکان، هەراوترە. چونکە تەواوی وێنەکـان لە خـەیاڵ دەزێن و عـالەمی خـەیاڵ لەچاو ئـەو عـالەمـەی کـە خـەیاڵی تێدا نامێنێ، تەنگترە.

لە رووی قسـەوە ئەوەندە دەتوانین تێبگەین دەنا هـەقیقەتی مانا مەحاڵە کە بە قسـە و رستە دەرکەوێ. »

پرسیاری کرد کە « کەوایە فایدەی قسـە و لەفز چیە؟ »

« فایدەی قسـە ئەوەیە کە تۆ بە داواکەت بگەیەنـێ و هانت بدا، دەنا داوا بە قسـە جێبەجێ نـابێ. ئەگەر وەها با پێویست بەو هەموو خەبات و فەنای خـۆ نەدەبوو. قسە وەهایە کـە لـە دوورەوە شـتـێک دەبینی دەجـوولێـتـەوە. بـە دوای دا رادەکـەی هـەتا بیبینی، نە ئەوەکە بە هـۆی جـوولانەوەی ئەو، ئەو ببینی. وێژەری مـرۆڤیش دە دەروون دا وەهایە: هاندەری تۆیە بۆ داوای ئەو مانایە، هەرچەند لە راستی دا نایبینی. »

یەکێک دەیگوت « من چەندەم خـوێندوە و مانام لەبـەر کردوە، هیچ لێم دەرنەکەوت کە دە مرۆڤ دا ئەو مانایە کامەیە کە دەمێنێتەوە و رێم تێنەبردوە. »

فـەرمـووی کە « ئـەگەر ئەو تـەنیا بـە قسـە دەرکـەوتبا، پێویست بەو هەمـوو رەنج و گیـان بەخت کردنە نەدەبوو. دەبێ گەلێک هـەوڵ بدەی کە تۆ نەمێنی، هـەتا بزانی چیە ئەو شتەی کە دەمێنێتەوە. »

یەکێک دەیگوت « من بیسـتوومـە کـە کـابەیەک هـەیە بەڵام هـەرچی دەڕوانم کـابەی نابینم. بڵا بچمە سەربان، لە کابە بڕوانم! »

کە وە سـەربـان دەکەوێ و مل درێژ دەکا، کابە نابینێ، مونکیر دەبێ.

دیتنی کابە هـەر بەمە جێبەجێ نابێ، چونکە لە جێی خۆوە ناکرێ بیبینی.

هـەر ئەوجـۆرەی کـە لە زسـتـان دا بە گیـان داوای کـەوڵ دەکـەی، کـە هـاوین داهـات کەوڵ تـووڕ دەدەی و لێی تووڕە دەبی. نووکە، داوا کـردنی کەوڵ بۆ پێکهـێنانی گـەرما بوو. چونکە تۆ ئاشقی گەرما بووی. لە زستان دا لەبەر بەرگر گەرمات پێنەدەگەیشت و موحتاجی وە خۆ گرتنی کەوڵ بووی. بەڵام کە بەرگر نەما، کەوڵت تووڕ دا.

تۆ لەززەتـی کـۆ بـوونت چێـژت. نووکـە، رۆژێک دادێ کـە لەززەتی لێک بـڵاو بوونی ئەو ئەندامـانە دەبینی و هـەراویی ئەو عالـەمە سـەیر دەکەی و لەم تەنگییـە رزگـارییت دێ. بۆ وێنـە کەسـێک چوار بزمـارە و قـایم ببـەسـتنەوە. مـاوەیەک کـە تێـپـەڕێ ئەو پێیـوادەبێ کە تێیدا خۆشە و لەززەتی رزگاریی فـەرامۆش دەکا. کـە لەم چوار بزمارە رزگـاریی بێ، تێدەگا کـە لە چ عـەزابێک دابوە. هەر ئەوجـۆرەی کـە سـاوا دە لانکە دا پێدەگـەن و دەحـەسـێنـەوە، دەو دا کـە دەسـتـیـان دەبەسـتنەوە، دەنا ئەگـەر باڵغێک لە لانکە ببەستنەوە، عەزاب و زیندانە.

هـەندێک چـێژیان ئـەوەیە کە گـوڵەکـان بپـشکوێن و سـەر لە غـونچـە دەرکـێشن. هـەندێک چێـژیان ئەوەیە کە گوڵ هـەڵوەرێن و بچنەوە سـەر رەچەڵەکی خۆیان. نووکـە، هـەندێک دەیانەوێ کە هیچ یار و دڵدار و خۆشەویستیی و کفر و ئیمان نەمێنێ، هەتا

تێکەڵی رەچەڵەکی خۆیان بنەوە. چونکە ئەمانە هەموو دیوار و هۆی تەنگی و دوویین و عالەمی دیکە هۆی هەراویی و یەکیەتی تەواوە.

قسە خۆی هێندە مەزن نیە و هێزێکی نیە، چۆن دەتوانێ مەزن بێ؟ ئاخر، قسەیە، تەنانەت خۆی هۆی زەعفە. کارا هەقە و هاندەر هەق. ئەم لەم نێوە دا رووپۆشە. تێکەڵاویی دوو سێ پیت کەی هۆی ژیان و هارووژانە؟ بۆ وێنە کەسێک هاتە لای تۆ، رێزت گرت و « چۆنی و باشیت » گوت، پێیخۆش بوو و بوو بە هۆی مەحەببەت و بە یەکێک دوو سێ جوێنت دا، ئەو دوو سێ وشەیە بوو بە هۆی غەزەب و دڵ هێشان. نووکە، چ پێوەندییەکی هەیە تێکەڵاویی دوو سێ وشە لە پێکهێنانی، مەحەببەت زێتر و رەزا و غەزەب و دوژمنایەتی؟ ئیللا هەقتەعالا ئەمانەی کردۆتە سەبەب و پەردە، هەتا نەزەری هەرکەس وە جەمال و کەمالی ئەو نەکەوێ. پەردەی تەسک شیاوی نەزەری تەسکە و ئەو لە پشت پەردەکانەوە، حوکم دەکا و سەبەبەکان پێکدێنێ. ئەم نانە لە راستی دا سەبەبی حەیات نیە، ئیللا هەقتەعالا ئەوی کردۆتە سەبەبی حەیات و قەوەتی گیان. ئاخر، ئەو جەمادە، لەبەر ئەوە کە حەیاتی ئینسانیی نیە ـ چۆن دەتوانێ ببێتە هۆی زێدە بوونی هێز؟ ئەگەر ئەو حەیاتی هەبا، خۆی پێ زیندوو رادەگرت.

## یەک راستی چاکترە لە هەزار شک!

ئەمە کە دەڵێن « القلوب تتشاهد » وتەیە و قسە، حەکایەتێکە کە دەیڵێن ـ لێیان روون نەبۆتەوە، دەنا قسە چ پێویستە؟ کە دڵ شاهیدیی بدا، شاهیدیی زمان چ پێویستە؟

ئەمیر نایب گوتی کە « ئادی ـ دڵ شاهیدیی دەدا، بەڵام دڵ حەزێکی هەیە جیا و گوێ حەزێکی هەیە جیا، چاو حەزێکی هەیە جیا و زمان جیا: پیویستیی بە هەرکام لەوانە هەیە هەتا فایدە زێدەتر بێ. »

فەرمووی کە « ئەگەر دڵ نوقم بوونی هەبێ، هەموو دەو دا دەفەوتێن ـ پێویست بە زمان ناکا. ئاخر، لەیلا کە رەحمانیی نەبوو، لەش بوو، نەفس بوو، لە ئاو و گڵ بوو. ئەشقی ئەو، ئەو تێدا نوقم بوونە بوو کە مەجنوونی وەها داگرتبوو و نوقمی کردبوو کە موحتاجی بینینی لەیلا بە چاو نەبوو و پێویستیشی بە دەنگ و قسەی ئەو نەبوو ـ چونکە لەیلای لە خۆ جیا نەدەدیت. نووکە، ئەگەر جسمانییەک ئەو هێزەی هەبێ کە ئەشق تووشی وەها حاڵێکی بکا کە خۆی بە جیا لەو نەبینێ و گشت هەستەکانی دە ئەشقی ئەو دا نوقم بن، لە چاو و بیستن و بۆن و غەیرە ـ کە هیچ ئەندامێک حەزێکی دیکە داوا نەکا، هەموویان تێگرا ببینێ و هەیبێ ـ ئەگەر ئەندامێک لەم ئەندامانە هەروەکی گوتمان، حەزێکی تەواو ببینێ، هەموو لە زەوقی ئەو دا نوقم دەبن و داواکاری حەزی دیکە نابن. ئەم داواکردنەی هەست بۆ حەزێکی دیکە، نیشاندەری ئەوەیە کە ئەم ئەندامە وەها کە شیاوە حەزی تەواوی وەرنەگرتوە ـ حەزی بە کەموکوورییەوە وەرگرتوە. ناچار لەو حەزە دا نوقم نەبوە، هەستی دیکەی داوای حەز دەکا ـ پتر داوا دەکا، هەر هەستێک حەزێکی جیا. هەست لە رووی ماناوە گشتن، لە رووی رواڵەتەوە جیاواز. کاتێک هەستێک نوقم بێ، هەموو دەو دا نوقم دەبن.

چەشنی مێشێک کە دەفڕێ، باڵی دەبزوێ و سەری دەبزوێ و هەموو ئەندامەکانی دەبزوێن. کە دە هەنگوین دا نوقم بێ، هەموو ئەندامەکانیشی دەوەستن و هیچ نابزوێ. نوقم بوون ئەوەیە کە ئەو دە ئارا دا نەبێ و ئەو هەوڵی نەمێنێ و کرداری نەمێنێ و جووڵەی نەمێنێ ـ نوقمی ئاو بێ ـ ئەگەر هێشتا دە ئاو دا دەست و پەلی دەکوتێ، بەو ناڵێن نوقم بوون، یا هاوارێک دەکا « ئاهای، خنکام! » بەمەش ناڵێن نوقم بوون.

ئاخر، ئەم « اناالحق » گوتنە، خەڵک پێیانوایە، داوای مەزنایەتییە. « اناالعبد » گوتن، داوای مەزنایەتییە. « اناالحق » تەوازوعێکی گەورەیە. چونکە ئەمە کە دەڵێ « من عەبدی خودام! » دوو بوون دەسەلمێنێ: یەکێک خۆی و یەکێک خودا. بەڵام ئەوەی « اناالحق » دەڵێ، خۆی بەخت کردوە، خۆی بە با داوە. دەڵێ « اناالحق » یانی « من نیم! گشت ئەوە! جگە لە خودا نیە! من بە تەواوەتی عەدەمم و هیچم! » تەوازوع لەمە دا پترە. ئەمەیە کە خەڵک تێناگەن. ئەمە کە پیاو بەندایەتی خودا بکا، ئاخر، بەندایەتی ئەو دە ئارا دایە. هەرچەند بۆ خودایە بەڵام خۆی دەبینێ و کرداری خۆی دەبینێ و خودای دەبینێ. ئەو نوقمی ئاو نیە. نوقمی ئاو ئەو کەسەیە کە هیچ جووڵە و کردارێکی نەمێنێ، بەڵام جووڵەکانی ئەو، جووڵەی ئاو بێ.

شێرێک ڕەپێی ئاسکێکی دەنا. ئاسک لەو ڕادیدەکرد. هەتا ڕایدەکرد، دوو بوون هەبوو: یەکێک بوونی شێر و یەکێک بوونی ئاسک. بەڵام کە شێر گەیشتە ئەو و کەوتە ژێر پەنجەی زاڵی ئەو، لە هەیبەتی شێر بێهۆش و بێخود بوو لە بەر شێر کەوت، ئەم ساتە، بوونی شێر بە تەنیا مایەوە ـ بوونی ئاسک فەوتا و نەما.

نوقم بوون ئەوەیە کە هەقتەعالا بۆ ئەولیا، غەیری ئەم خۆفە کە خەڵک دەترسن لە شێر و پڵینگ و زاڵم. هەقتەعالا ئەوانی لە خۆی ترساند و لێی ڕوون کردنەوە کە خۆف لە هەقەوەیە، هێمنایەتی لە هەقەوەیە، عەیش و نۆش لە هەقەوەیە و خورد و خەو لە هەق. هەقتەعالا ڕوخسارێک بەوان دەنوێنێ تایبەت و هەستپێکراو لە بێداری دا، بە چاوی ئاوەڵە ـ ڕوخساری شێر یا پڵینگ یا ئاگر ـ کە ئەو ڕاستەقینەیان بۆ دەرکەوێ کە « ئەو ڕوخساری شێر یا پڵینگەی کە دەیبینن، هی ئەم عالەمە نیە، ڕوخساری غەیبە کە نەقش کراوە. » هەروەتر، ڕوخساری خۆی بە گەلێک جوانیی دەردەخا. بێستانەکان و جۆبارەکان و حۆرییەکان و کۆشکەکان و تەعام و خەڵات و وڵات و شار و مەنزڵی سەیر و سەمەری جۆراوجۆر. بە ڕاستی دەزانێ کە ئەمانە هی ئەم عالەمە نین. هەق ئەوانە دێنێتە زەینیەوە و نەقشیان دەکا. کەوایە لێی یەقین دەبێ کە خۆفی ئەو لە خوداوەیە و هێمنایەتی لە خوداوەیە و هەموو ڕاحەتی و تەماشاکان لە خوداوەیە. نووکە، ئەم خۆفەی ئەو وەک خۆفی خەڵک ناچێ. چونکە ئەو ئەمەی بینیوە بێ بەڵگەیە، هەق پێی نیشان دا کە هەموو لەوەوەیە.

فەلسەفیی ئەمە دەزانێ، بەڵام بە بەڵگەوە. بەڵگە قایم نیە و ئەو خۆشییەی کە لە بەڵگەوە پێکدێ، بەقای نابێ. هەتا بەڵگەکەی پێدەڵێی، خۆش و گەرم و تازەیە، کە باسی بەڵگە تێپەڕی، گەرما و خۆشیی ئەویش نامێنێتەوە. هەروەکی کەسێک بە

بەڵگە زانی کە ئەم خانوویە بەننایەکی هەیە و بە بەڵگە دەزانێ کە ئەم بەننایە چاوی هەیە و کوێر نیە، دەستەڵاتی هەیە، بێدەستەڵات نیە، هەبوە و عەدەم نەبوە، زیندوو بوە و نەمردوە، بەر لە بینای ماڵەکە ژیاوە، هەمووی ئەوانە دەزانێ. بەڵام بە بەڵگەوە دەیزانێ. بەڵگەش هەمیشەیی نیە زوو فەرامۆش دەکرێ. بەڵام ئاشقەکان چونکە خزمەتیان کرد، بەننایان ناسی و بە چاوی یەقین دیتیان و نان و نمەکیان پێکەوە خوارد و هاتوچۆی یەکتریان کرد، قەت بەننا لە زەین وبیری ئەوان غایب نابێ. کەوایە وەها کەسێک فەوتاوی هەقە. لە هەق ئەو دا، گوناه گوناه نیە، تاوان تاوان نیە، چونکە ئەو بەزیو و فەوتاوی ئەوە.

پادشایەک بە غولامەکانی فەرموو کە « هەرکام جامێکی زێڕن بە دەستەوە بگرن، ئەوە میوانەکان دێن! » بە غولامە تایبەتەکەشی فەرموو کە « جامێک بە دەستەوە بگرە!»

کاتێک پادشا رووی نواند، ئەو غولامە تایبەتە لە دیداری پادشا بێخود و مەست بوو، جامی لە دەستی کەوت و شکا. ئەوانی دی کاتێک ئەمەیان لەو دیت، گوتیان کە دیارە دەبێ وابکەین: جامەکانیان بە قەست بەرداوە.

پادشا لێیان تووڕە بوو « بۆچ وەهاتان کرد؟ »

گوتیان کە « ئەو کە تایبەتتر بوو وەهای کرد. »

پادشا گوتی « ئەی گەوجینە! ئەو وەهای نەکرد، من کردم. »

بە رواڵەت هەموو ئەم کارانە، گوناه بوو. بەڵام ئەو یەک گوناهە عەینی تاعەت بوو، بەڵکە سەرتر لە تاعەت و گوناه بوو. خۆی، مەبەست لە هەمووی ئەوانە غولام بوو. باقی غولامەکان تابع و لاساکەری ئەون. چونکە ئەو غولامی پادشا بوو و لە راستی دا، چونکە هەموو غولامەکان تابعی پادشان، کەوایە تابعی ئەون. چونکە ئەو عەینی پادشایە و غولامەتی لەو دا جگە لە رواڵەت نیە. لە جوانیی پادشا پڕە.

قسەی گەورەپیاوان ئەگەر بە سەد شێوەی جۆراوجۆر بێ، هەر یەکە. چونکە هەق یەکە و رێگا یەکە، دوو قسە چۆن دەگونجێ؟ بەڵام بە رواڵەت دژی یەک دیاری دەدەن. بە مانا یەکە و جیاوازیی لە رواڵەت دایە و دە مانا دا هەموو گردەکۆیە. وەها کە میرێک بفەرموێ کە خێوەتێک بدروون. یەک ریس دەڕێسێ، یەک گوڵمیخ دەکوتێ، یەک بەرگ دەچنێ و یەک دەیدروێ و یەک دەیبڕێ و یەک دەرزی تێدەگێڕێ. ئەم

روخسـارانە لە رواڵەت دا جیـاوازن و جـۆراوجـۆر، بەڵام دە مـانا دا گـردەکۆن و یەک کار دەکەن. هـەروەتر ئەگەر لە ئەحواڵی عالەمیش بفکری، هـەموو بەندایەتی هـەقە ـ لە فاسق و ساڵح، لە یاغی و ملکەچ و لە دێو و فریشتە.

بۆ وێنە پادشـایەک دەیەوێ غـوڵامـەکـانی تاقی بکاتەوە و هـەڵیـانسـەنگێنێ، لەبەر هـۆیەک، هـەتا بەرقـەرار و نابەرقـەرار دەرکـەوێ و راست پەیمـان و بەدپەیمان جـیـا بێتەوە و بەوەفـا و بێوەفـا. ئەو پێویسـتی بە هـانە و هـاندەرێک هەیە هەتا بەرقـەراریی ئەو دەربکەوێ. ئەگەر نەبێ، بەرقـەرایی چۆن دەردەکەوێ؟ کەوایە ئەو بە هـانە و هـان دان بەندایەتی پادشـا دەکا، چونکە ویسـتی پادشـا ئەمەیە کە وەهـا بکا. بایەکی نارد هـەتا وەسـتـاوی لە غـەیری وەسـتـاو بـۆ دەرکـەوێ و مـێشـوولەی لە درەخت و باغ جـیـا کردەوە: هـەتا مێشـوولە برۆن و باشـوو بمێنن.

پادشایەک بە کەنیزێکی فەرموو کە « خۆ برازێنەوە و خۆت بە غوڵامـەکانم نیشان بدە، هـەتا ئەمانەت و خەیانەتی ئەوان دەرکەوێ! »

ئاکـاری کـەنیـز هـەرچەند بە رواڵـەت گـوناه دیاری دەکـا، بەڵام لـە راسـتـی دا، بەندایەتی پادشـا دەکا.

ئەم بەندانە چونکە خـۆیان لەم عـالەمـە دا دیت ـ نەک بە بەڵگە و تەقلید، بەڵکە بە چاوی بینـین، بێ پەردە و حـیـجـاب ـ کـە تێگـرا لە چـاک و خـراپ بەندایەتی و تـاعـەتی هـەق دەکەن، کـەوایـە لە هـەق ئەوان دا ئەم عـالەمـە، قـیـامـەتە. چونکە قـیـامـەت بریتی لەوەیە کە هـەموو بەندایەتی هـەق بکەن و کاری دیکە نەکەن جگە لە بەندایەتی ئەو. وە ئەوان ئەم مانایە هـەر لێرە دەبینن.

عالـەم لە رووی وشـەوە ئەمـەیە کە لە « عـارف » عالیـتر بێ. چونکە بە خـودا دەڵێن «عـالیم » بەڵام ناکرێ پێیبڵـێی « عـارف ». مـانـای « عـارف » ئەوەیە کـە نەیدەزانی و زانـی. ئـەمـە لـە هـەق خـودا دا ناشـێ. بەڵام بە پێـی عـورف، عـارف زێدەترە. چونکە عـارف، بریـتییـە لە: ئەوەی کـە بێ بەڵگە، دەیزانـێ، عـالەمی بە چاوی بینین و تـەمـاشـا بینیوە. بە پێی عورف، « عارف » بەمە دەڵێن.

دەڵێن « عـالیم چێـترە لە سـەد زاهیـد! » عـالیم چۆن چێـتر لە سـەد زاهیـد دەبێ؟ ئاخـر، ئەمـە زاهیدە بە عیلمـەوە زوهدی کرد. زوهدی بێ عیلم مەحـاڵە. ئاخـر، زوهد چیـە؟ لە دونیـا روو وەرگێران و روو دە تاعـەت و ئاخـرەت کردن. ئاخـر، دەبێ دونیـا بناسێ و ناحـەزیی و بێبەقایی دونیا بزانێ و لوتف و بەرقەراریی و بەقای ئاخیرەت و

هەوڵ بۆ تاعەت، بزانێ ـ کە « چۆن تاعەت بکەم و چ تاعەت بکەم؟ » ئەوانە هەمووی عیلمن. کەوایە زاهیدی بێ عیلم مەحاڵە. کەوایە ئەو زاهیدەش هەم عالیمە و هەم زاهید. ئەم عالیمە کە چێتر لە سەد زاهیدە، چۆن دەبێ؟ دە ماناکەی نەگەیشتوون، ئەوە عیلمێکی دیکەیە کە دوای ئەم زوهد و عیلمەی یەکەم کە هەیبوو، خودا وای بۆ دانا کە ئەم عیلمی دووهەم بەرهەمی ئەو عیلم و زوهدە بێ. بێشک وەها عالیمێک چێترە لە سەدهەزار زاهید. وەها کە پیاوێک درەختێکی چەقاند و بەری دا. بێشک ئەو درەختەی کە بەری دا چێترە لە سەد درەخت کە بەری نەدابێ. چونکە ئەو درەختانە لەوانەیە بە بەر نەگەن ـ کە ئافات لە رێ دا زۆرن. حاجییەک کە گەیشتە کابە، باشترە لەو حاجییەی کە لە بیاوان بەڕێوەیە ـ چونکە ئەوان ترسیان هەیە بگەنێ یا نەگەنێ. بەڵام ئەمە بە هەقیقەت گەیشتۆتێ. یەک هەقیقەت چێترە لە هەزار شک.

ئەمیر نایب گوتی کە « ئەوەی کە نەگەیشتۆش هیوای هەیە. »

فەرمووی « کوا ئەوەی کە هیوای هەیە، هەتا ئەوەی کە گەیشت؟ لە ترسەوە هەتا هێمنایەتی جیاوازیی زۆرە، و چ پێویستییە بە جیاوازیی؟ لای هەموو کەس ئەم جیاوازییە ئاشکرایە. قسە لە سەر هێمنایەتییە ـ کە لە هێمنایەتیەوە هەتا هێمنایەتی جیاوازییەکی مەزن هەیە. فەزلی مستەفا لە ئەنبیا، ئاخر، لە رووی هێمنایەتییەوە. دەنا تەواوی ئەنبیا لە هێمنایەتی دان و لە خۆف تێپەڕیون، ئیللا پلە و پایەیەکی زۆر لە هێمنایەتی دایە. ئیللا کە عالەمی خۆف و پلە و پایەکانی خۆف دەکرێ نیشان بدەی، بەڵام پلە و پایەکانی هێمنایەتی بێ نیشانن. لە عالەمی خۆف بڕوانن کە هەرکەسەی لە رێی خودا دا چ دەبەخشێ: یەکێک لەشی بەخت دەکا و یەکێک ماڵ و یەکێک گیان، یەکێک رۆژوو، یەک زەکات، یەک نوێژ، یەکێک دە رەکەعەت، یەکێک سەد رەکەعەت. کەوایە مەنزڵەکانی ئەوان نەقشکراو و دیاریکراون ـ دەکرێ ئەوان نیشان بدەن. هەروەک مەنزڵەکانی قوونیە هەتا قەیسەرییە دیاریکراون: قیماز و ئۆپروخ و سوڵتان و غەیرە. بەڵام مەنزڵەکانی دەریا لە ئەنتالیە هەتا ئەسکەندەرییە، بێ نیشانە. ئەوە تەنیا کەشتیوان دەیزانێ، بە خەڵکی ویشکایی ناڵێ، چونکە ناتوانن تێیبگەن. »

ئەمیر گوتی « گوتنەکەشی، فایدەی هەیە. ئەگەر هەمووشی تێنەگەن هەندێکی تێدەگەن و پەی پێدەبەن و گومانی دەکەن. »

فەرمووی « ئەی وەڵڵا! کەسێک لە شەوێکی زەنگ دا دانیشتوە بە خەبەر، بەو هیوایە کە « بەرەو رۆژ دەچم » هەرچەند چلۆنایەتی رۆیشتنەکە نازانێ، بەڵام چونکە چاوەڕوانی رۆژە، لە رۆژ نزیک دەبێتەوە. یا کەسێک لە شەوێکی تاریک و هەور دا، بە دوای کاروانێک دا دەڕوا. نازانێ کە دەگاتە کوێ و بۆ کوێ دەچێ و چەندی رێگا بڕیوە. بەڵام کە رۆژ داهات، بەرهەمی ئەو رۆیشتنە دەبینێ. »

عیسا زۆر پێکەنی و یەحیا زۆر گریا. یەحیا بە عیسای گوت کە « تۆ لە مەکرە وردەکانی هەق زۆر هێمنی کە وەها پێدەکەنی؟ »

عیسا گوتی کە « تۆ لە خەڵات و لوتفە وردەکانی لەتیفی هەق زۆر غافڵ بووی کە وەها دەگری؟ »

وەلییەک لە ئەولیای هەق لەم رووداوە دا حازر بوو. لە هەقی پرسی « لەم دوانە کامەیان پلەی سەرترە؟ »

وڵام گەیشت کە « من لەو شوێنەم کە زەینی بەندەی من لەوێیە. لای هەر بەندەیەک من خەیاڵێک و روخسارێکم، هەرچی ئەو خەیاڵم بکا، من لەو شوێنەم. »

من بەندەی ئەو خەیاڵەم کە هەق لەوێ بێ. بێزارم لەو هەقیقەتەی کە هەق لەوێ نەبێ.

« خەیاڵەکان خاوێن کەنەوە، ئەی بەندەکانی من! ـ کە جێگە و پلەی منە! »

نووکە، تۆ خۆت تاقی بکەوە لە گریان و پێکەنین، لە نوێژ و رۆژوو، لە خەڵک و خەلوە و غەیرە، بۆ تۆ کامە باشترە و ئەحواڵی تۆ بە کام شێوە راستتر دەبێ و پێشکەوتت پتر، ئەو کارە رەچاو بگرە! تۆ مفتییەکت هەیە دە دەروون دا، فتوای مفتیانی پێڕاگەیەنە، هەتا ئەوەی کە ئەو رەزای لە سەرە، ئەو رەچاو بگرێ! هەر ئەوجۆرەی کە تەبیب بۆ لای نەخۆش دێ، لە تەبیبی دەروون دەپرسێ. چونکە تۆ تەبیبێکت هەیە دە دەروون دا و ئەو مەزاجی تۆیە ـ کە رەدی دەکا و قەبووڵی دەکا و ناچار تەبیبی دەرەوە لەو دەپرسێ کە « فلان شتەی کە خواردت چۆن بوو؟ سووک بووی؟ قورس بووی؟ خەوت چۆن بوو؟ » لەوەی کە تەبیبی دەروون ئاگاداری دەکا، تەبیبی دەرەوە حوکمی لە سەر دەدا.

کەوایە ئەسڵ ئەو تەبیبەی دەروونە و ئەو مەزاجەی ئەو. کاتێک ئەم تەبیبە زەعیف

بێ و مەزاج فاسد بێ لەبەر زەعف، شتەکان بە پێچەوانە دەبینێ و نیشانە بە خراپ دەدا: بە شەکر دەڵێ تاڵ و سرکەی پێ شیرینە. کەوایە موحتاج بە تەبیبی دەرەوە هەیە کە یارمەتی بدا هەتا مەزاج وەک پێشووی لێبێتەوە. دوای ئەوە، ئەو دیسان روو لە تەبیبی خۆی دەکا و فتوای لەو دەوێ.

هەروەتر، مرۆڤ مەزاجێکی هەیە لە رووی ماناوە، کاتێک ئەو زەعیف بێ، هەستەکانی دەروونی ئەو هەرچی ببینن و هەرچی بیڵێن هەمووی بە پێچەوانە دەبێ. کەوایە ئەولیا تەبیبن، یارمەتی ئەو دەدەن هەتا مەزاجی راست بێتەوە و دڵ و دینی قەوەت بگرێ.

مرۆڤ شتێکی گەلێک مەزنە. هەموو شت دەو دا نووسراوە. حیجاب و تاریکی ناهێڵێ کە، ئەو زانستەی نێو خۆی بخوێنێتەوە. حیجاب و تاریکی بریتییە لە خەریک بوونی جۆراوجۆر و تەدبیری جۆراوجۆر و ئارەزووی جۆراوجۆر. سەرەڕای ئەمە کە لە تاریکی دایە و پەردەی بە سەر دا کێشراوە، دیسانیش شت دەخوێنێتەوە و ئاگاداریی لێی هەیە. بڕوانە کاتێک ئەم تاریکی و حیجابانە نەمێنن، چلۆن ئاگادار دەبێ و چ زانستێکی دەست دەکەوێ.

ئاخر، ئەم پیشانە، لە جلدروویی و بەننایی و نەجاریی و زێڕینگەریی و ئەستێرەناسی و پزشکی و غەیرە و هەموو پێشەکان، لە دەروونی مرۆڤەوە سەریان هەڵداوە ـ لە بەرد و گڵەوەت پەیدا نەبوون. ئەوەی کە دەڵێن قەلەڕەشێک مرۆڤی فێر کرد کە مردوو دە گۆڕ بنێن، ئەویش وێنەی مرۆڤ بوو کە لە مەل دەرکەوت، داوای مرۆڤ ئەوی ناچار بەم کارە کرد. ئاخر، حەیوانیش بەشێکە لە مرۆڤ. بەشێک چۆن تەواوەتی فێر دەبێ؟ وەها کە مرۆڤێک بیەوێ بە دەستی چەپ بنووسێ. قەڵەم بە دەستەوە بگرێ. هەرچەند دڵ قایمە، بەڵام دەست لە نووسین دا دەلەرزێ. بەڵام دەست بە ئەمری دڵ دەنووسێ.

کاتێک ئەمیر دێ، مولانا قسەی مەزن دەفەرمووێ ـ چونکە قسە لەوەی کە ئەهلی قسەیە نابڕێ: قسە هەمیشە بەو دەگا و قسە بەوەوە لکاوە. لە زستان دا ئەگەر درەختەکان بەرگ و بەر نەدەن، پێتوانەبێ کە لە کار دا نین: ئەوان هەمیشە خەریکن. زستان سەردەمی دەخڵە، هاوین سەردەمی خەرج. هەموو خەرج دەبینن، دەخڵ

نابیـنن. وەها کە کـەسـێک مـیـوانی بدا و خـەرج بکا، هەمـوو ئەوە دەبیـنن. بەڵام ئەو دەخڵەی کە کەم کەمە کۆی کردۆتەوە بۆ ئەو میوانییە، ئەو نابینن و نازانن. وە ئەسڵ دەخڵە ـ کە خەرج لە دەخڵەوە دێ.

ئێـمـە دەگەڵ ئەو کـەسـەی کـە پێـوەندییـمان هـەبێ، دەم بـە دەم دەگەڵ ئەو لە قسـە داین و یەکین و پێکەوەین ـ لە بێدەنگی و غـەیبـەت و حـوزوور دا . بگرە لە شـەڕیش دا دەگەڵ یەکین و ئاوقای یەکترین: هـەرچـەند مست لێکتـر دەکوتین، دەگـەڵ ئەو لە قسـە داین و یەکین و پێکەوەین. ئەو بـە مـست مـەزانە! ئەو مـسـتـە مـێـوژی تێـدایە! باوەڕ ناکەی؟ بیکەوە هەتا بیبینی! مێوژی چی؟ دوڕی عەزیزی چی؟ ئاخـر، خـەڵکی دیکە جـەفـەنگ و نوکتـە و زانسـت دەڵێن ـ بە نەزم و نەسـر. ئەمـە کـە مـەیلـی ئەمـیـر بۆ ئەم لایەیە و دەگـەڵ ئێـمـەیـە، لەبەر زانست و نوکـتـە و مـوعـیـزە نیـە، چونکە لە هەمـوو جێگەیەک لەم بابەتانە هەیـە و کەم نین. کەوایە ئەوەی کە منی خۆش دەوێ و تاسـەم دەکا، ئـەمە جگە لەوانەیە. ئەو شـتێکی دیکـە دەبینـێ و ئەوپەڕی ئەوە کە خـەڵکی دیکە بینیویەتی، رووناکییەکی دیکە دەبینێتەوە.

دەگێـڕنەوە کە: پـادشـایەک مـەجنوونی حـازر کـرد و گـوتی کـە « تۆ چت بوە و چت لێقـەومـاوە؟ ئابڕووی خـۆت برد و لە خـانومـان کـەوتی و خـراپ بووی و فـەوتای. لەیلا چیـە و چ چاکـەیەکی هـەیە؟ وەرە هـەتا جـوان و چەلەنگت نیشـان بدەم و فـەدای تۆی بکەم و پێتیببەخشم! »

کە ئامـادەیان کـردن و جـوانەکان بە کـەشم و نەشـم دەرکـەوتن، مـەجنوون سـەری داخستبوو و بەر پێی خۆی چاو لێدەکرد.

پادشـا فەرمووی « ئاخر، سـەر هـەڵێنە و سـەیریان بکە! »

گـوتی « دەترسم! ئەشـقی لەیلا شـمـشـیـری هـەڵکێشـاوە. کە سـەر هـەڵێنم، سـەرم دەپەڕێنێ. »

وەهـا نـوقــمـی ئەشــقی لەیلا بـوو. ئاخــر، کــەسـی دیکەش چـاویان هـەبـوو، لێـو و لووتیـان هـەبوو. ئاخر، دەو دا چی دیتبوو کە تووشی ئەم حاڵە ببوو؟

## لای ئەو دوو «انا» ناگونجێ!

لای ئەو دوو « انا » ناگـونجێ. تۆ « انـا » دەڵێی و ئەو « انا ». یا تـۆ لەبەری بمرە، یا ئەو لەبەر تۆ بمرێ، هـەتا دوویی نەمێنێ! بەڵام ئەمە کە ئەو بمرێ، ناگونجێ ـ نە لە دەرەوە، نە لە زەین دا. ئـەو ئەم لوتفـەی هـەیـە کە ئەگەر گـونجـابا، بۆ تۆ دەمـرد هـەتا دوویی رابێ. نووکە، چونکە مردنی ئەو ناگونجێ، تۆ بمرە هـەتا ئەو لە تۆ دەرکەوێ و دوویی رابێ!

دوو مـەل لێک بەسـتن. سـەرەڕای هـاوڕەگـەزیی و ئەوەکە دوو باڵیـان هـەبوو بوو بە چوار، نافڕن ـ چونکـە دوویی قایمە. بەڵام ئەگەر مـەلێکی مردوو لەو بەسـتی، دەفڕێ ـ چونکە دوویی نەماوە.

هـەتاو ئەم لوتفـەی هـەیە کە لەبەر چەکچـەکی بمرێ، بەڵام چونکە ناگـونجێ، دەڵێ کە « ئەی چەکچـەکی، لوتفی من گـەیشـتـۆتە گشت کـەس. دەمـەوێ لە هـەقی تۆش دا چاکەی بکەم، تۆ بمرە! ـ چونکە مـردنی تۆ دەگونجێ ـ هـەتا لە شـۆقی بـەشکۆی من بەشدار بی و لە چەکچەکییەتی بێیە دەر و ببیە هـەڵۆی قافی قوربەت! »

بەندەیەک لە بەندەکانی هـەق ئەم دەستـەڵاتەی هـەبوە کە خـۆی بۆ دۆستـێک بەخت بکا. لە خودا ئەو دۆسـتەی داوا دەکرد. خودا قەبووڵی نەدەکرد. دەنگێکی غەیب هـات کـە « من نامــەوێ کـە ئـەو ببــینی!» ئەو بـەندەیە پێـی داگـرت و دەســتی لە پـاڕانەوە هەڵنەگرت کە « خودایا، ویستی ئەوت دە من ناوە، لە من دەرناچێ.»

لە ئاکام، دەنگی غەیب هـات: « دەتەوێ کە ئەو رابێ، سـەر بەخت بکە و بفـەوتێ و تۆ مەمێنەوە و لە عالەم دەرچوە! »

گوتی « یاڕەب، رازی بووم »

وەهـای کرد و سەری بەخت کرد بۆ ئەو دۆستە، هـەتا بە مرادی بگا.

ئەگـەر بەندەیەک ئەو لوتفـەی هـەبێ کـە وەها تەمـەنێک کـە: رۆژێکی ئەو تەمـەنە، تەمـەنی گـشت عـالەم ـ ئەووەڵ و ئـاخـر ـ دێنێ، بەخت بکا، ئـەو خـاوەنـی لوتفـە، ئەم لوتفەی نیە؟ ئەمەت مەحاڵ! بەڵام فەنای ئەو ناگونجێ. کەوایە، تۆ فەنا بە!

# دزێک داخوازی دارۆغەیە!

هەمیشە دارۆغە لە دز دەگەڕێ هەتا بیانگرێ و دز لەو رادەکەن. ئەم شتە سەیرە رووی داوە کە دزێک لە دارۆغە بگەڕێ و بیەوێ کە دارۆغە بگرێ و وە چنگی بخا.

هەقتەعالا بە بایەزیدی گوت « یا بایەزید، چ دەخوازی؟ »

گوتی « دەخوازم کە نەخوازم! »

نووکە، مرۆڤ دوو حاڵەتی پتر نیە: یا دەخوازێ یا ناخوازێ. ئەوە کە هەر نەخوازێ، ئەمە خووی مرۆڤ نیە. ئەمە یانی لە خۆی بەتاڵ بوە و بە تەواوەتی نەماوە ـ چونکە ئەگەر مابا، ئەو خوو مرۆڤایەتییەی تێدا دەبوو کە بخوازێ یا نەخوازێ. نووکە، هەقتەعالا دەیەویست کە ئەو کامل بکا و بیکاتە شێخێکی تەواو، هەتا دوای ئەوە ئەو حاڵەتەی بە سەر دابێ کە لەوێ دوویی و جیایی نەگونجێ، پێکگەیشتنێکی تەواو بێ و یەک گرتن. چونکە هەموو ئازارەکان لەوە پێکدێن کە شتێک بخوازی و پێکنەیە. کە نەخوازی، ئازار نامێنێ.

مرۆڤ جیاوازن و ئەوان لەم ڕێبازە دا پلە و پایەیان هەیە. هەندێک بە هەوڵ و تێکۆشان دەگەنە رادەیەک کە ئەوەی بیر و دەروونیان دا داوای دەکا، جێبەجێی نەکەن. ئەوە دە دەسەڵاتی مرۆڤ دایە. بەڵام ئەوە کە ویست و خواست ڕێی دە دەروون نەکەوێ، دە دەسەڵاتی مرۆڤ دا نیە، ئەمە جگە لە جەزبەی هەق ناتوانێ لێی دوور خاتەوە.

ئیماندار ئەگەر بە تەواوەتی ئیمانی هەقیقی هەبێ، ئەو هەر ئەو کارە دەکا کە هەق دەیکا ـ جا چ جەزبەی ئەو بێ، چ جەزبەی هەق. ئەوەی کە دەڵێن دوای مستەفا و پێغەمبەران وەحی بۆ کەس نازڵ نابێ، بۆ نابێ؟ دەبێ. بەڵام « وەحی » پێناڵێن. ئیماندار کە چاو لە نووری خودا دەکا، هەمووی دەبینێ ـ یەکەم و ئاخر، حازر و غایب. چونکە لە نووری خودا دا، شتێک چۆن شاراوە دەبێ؟ ئەگەر شاراوە بێ، ئەوە نووری خودا نیە. کەوایە مانای « وەحی »یە، هەرچەند « وەحی » پێناڵێن.

عوسمان کە بوو بە خەلیفە، چوو سەر منبەر. خەڵک چاوەڕێ بوون کە چ دەفەرموێ. بێدەنگ بوو و هیچی نەگوت و چاوی لە خەڵک بڕی. خەڵک حاڵەت و

خۆشییەکیان تێکەوت کە پێیانخۆش نەبوو لێیدەرکەون و ئاگایان لە یەکتر نەبوو کە لە کوێ دانیشتوون ـ کە بە سەد زیکر و وەعز و خوتبە تووشی وەها حاڵەتێک نەدەهاتن. فایدەی وەهایان دەست کەوت و رازی وەهایان لێدەرکەوت، کە بە چەند عەمەل و وەعز پێکنەدەهات.

هەتا ئاخری کۆڕ، هەروا چاوی لێدەکردن و قسەی نەدەفەرموو. کە ویستی بێتە خوار، فەرمووی « ان لكم امام فعال خير اليكم من امام قوال »

راستی فەرموو. چونکە مەبەست لە قسە، فایدە و ناسکییە و گۆڕینی ئەخلاق بەبێ قسە، دوو هەندەی ئەوەکە لە قسە دەستیان دەکەوت، تێاندا پێکهات. کەوایە ئەوەی کە فەرمووی، عەینی سەواب بوو کە فەرمووی. گریمان خۆی بە « فعال » دانا و ئەودەمی کە لە سەر مەنبەر بوو، کارێکی نەکرد کە رواڵەتەکەی بە چاو ببیندرێ: نوێژی نەکرد، نەچوە حەج، سەدەقەی نەدا، زیکری نەکرد، خوتبەشی کە نەگوت. کەوایە زانیمان عەمەل و کردەوە، هەر تەنیا ئەم رواڵەتە نیە، بەڵکە ئەم سیمایانە سیمای ئەو عەمەلەیە و ئەو عەمەلەش گیان.

ئەمە کە یەکێک سەیری ئەستێرە دەکا و رێگا دەبڕێ، هیچ ئەستێرەیەک قسەی دەگەڵ دەکا؟ نا. ئیللا کە هەر سەیری ئەستێرە بکا، رێ لە لاڕێ لێک دەکاتەوە و دەگاتە مەنزڵ. هەر ئەوجۆرەی کە لەوانەیە سەیری ئەولیای هەق بکەی، ئەوان شوێنت لە سەر داخەن بێ هیچ قسە و باس و دەمەقاڵەیەک، بە مەبەستت بگەی و تۆ بگەیەننە مەنزڵی وەسڵ.

لە عالەمی خودا دا هیچ شتێک سەختتر لە تەحەمولی مەحاڵ نیە. بۆ وێنە تۆ کتێبێکت خوێندبێتەوە و رێک و راستت کردبێ و سەر و ژێر و بۆرت بۆ دانابێ، یەکێک لە پەنا تۆ دانیشتوە و ئەو کتێبە بە هەڵە دەخوێنێتەوە. هیچ تەحەمولی ئەوەت پێدەکرێ؟ ئیمکانی نیە. ئەگەر نەتخوێندبێتەوە، بۆ تۆ تۆفیرێک ناکا ـ بە هەڵەی بخوێنێتەوە یا راست. چونکە تۆ هەڵەت لە راست لێک نەکردۆتەوە. کەوایە تەحەمولی مەحاڵ خەباتێکی گەورەیە.

نووکە، ئەنبیا و ئەولیا لە خەبات راناکەن. یەکەم خەباتێک کە کردیان، قەتڵی نەفس و تەرکی ئاواتەکان و شەهوەت و خەباتی ئەکبەر بوو. کە پێیگەیشتن و گەیشتن و لە پلەی هێمنایەتی دابەزین، راست و چەوتیان لێ ئاشکرا بوو. راست لە

چەوت دەزانن و دەبینن، کەچی دیسانیش لە خەباتێکی گەورە دان، چونکە ئەم خەڵکە هەموو کارەکانیان چەوتە و ئەوان دەیبینن و تەحەمولی دەکەن ـ کە ئەگەر نەیکەن و بیڵێن و چەوتی ئەوان باس بکەن، کەسێک لایان نامێنێتەوە و کەس سڵاوی موسڵمانەتییان لێناکا. ئیللا هەقتەعالا دڵفرەوانیی و حەوسەلەیەکی گەورەی پێداون کە تەحەمول دەکەن ـ لە سەد چەوتیان یەکێکی دەڵێن، هەتا لەبەری گران نەبێ و باقی چەوتییەکان دادەپۆشێ، بگرە پەسنیشی دەکا کە « ئەو چەوتییەت راستە » هەتا بەرەبەرە ئەم چەوتییانەی یەک بە یەک لێ دوور دەکاتەوە.

هەر ئەوجۆرەی کە مامۆستایەک خەت فێری منداڵێک دەکا، کە گەیشتە رستە، منداڵ رستە دەنووسێ و نیشانی مامۆستای دەدا. لای مامۆستا، هەموو هەڵەیە و خراپ. دەگەڵی بە شێوەی سەنعەت و سازان دەجووڵێتەوە و دەڵێ کە « هەمووی راستە و راستت نووسیوە. بژی، بژی! ئیللا ئەم یەک وشەیەت خراپ نووسیوە. وەها دەبێ! ئەو وشەی دیکەشت خراپ نووسیوە. » چەند وشەیەک لەو دێرە بە خراپ ناو دەبا و پێی نیشان دەدا کە دەبێ وەها بنووسرێ و پەسنی باقی دەکا هەتا دڵی نەسڵەمێ و نەبووڕێتەوە. وە بەو پەسنە هێز دەگرێ و هەر ئەوجۆرە، بەرەبەرە فێر دەبێ و یارمەتی وەردەگرێ.

ئینشاڵڵا هیوادارم کە هەقتەعالا مەبەستەکانی ئەمیر پێکبێنێ و ئەوەی دە دڵی دایە و دەیەوێ و ئەو شتانەش و ئەو دەوڵەتەش کە دە دڵی دانیە و نازانێ کە چیە، هیوادارم ئەوانیشی پێبگا ـ کاتێک ئەوانی دیت و ئەو خەڵاتانە بەو گەیشتن، لە خواست و ویستەکانی پێشووی شەرمەزار بێ کە « وەها شتێکم لەبەر بوو، دەوڵەت و نیعمەتێکی وەها! چەند سەیرە، ئەی من چۆن داوای ئەوانم دەکرد؟ » و شەرم دایگرێ. نووکە، خەڵات ئەوەیە کە رێی دە زەینی مرۆڤ نەکەوێ ـ چونکە هەرچی بێتە زەینییەوە، بە قەد هیممەتی ئەو دەبێ و بە قەرا ئەو. بەڵام خەڵاتی هەق بە قەرا قەدری هەق دەبێ. کەوایە خەڵات ئەوە کە شایەنی هەق بێ، نەک شایەنی زەین و هیممەتی بەندە.

# شوکر، مژینی مەمکی نیعمەتە!

شوکر، مژینی مەمکی نیعمەتە. مەمک هەرچەند پڕ بێ، هەتا نەیمژی، شیر نایە.

پرسی کە « هۆی ناشوکریی چیە و ئەوەی کە بەرگری شوکرە چیە؟ »

شێخ شەمسەددین فەرمووی « بەرگری شوکر، تەماحی خاوە ـ کە ئەوەندی بەو گەیشتوە، پتر لەوەی تەماح کردبوو. ئەو تەماحە خاوە والێکرد. چونکە لەوەندی کە دە دڵی نابوو کەمتری پێگەیشت، بوو بە بەرگری شوکر. کەوایە، لە عەیبی خۆی غافڵ بوو و ئەو نەغدەی کە پێشکەشیان کرد پێی کەم بوو. بێشک، تەماحی خاو وەک میوەی خاو و نانی خاو و گۆشتی خاو خواردنە. کەوایە، بێشک، دەبێتە هۆی پێکهاتنی عیللەت و پێکهاتنی ناشوکریی.

کاتێک زانی شتی خراپی خواردوە، رشانەوە واجبە. هەقتەعالا بە حیکمەتی خۆی، ئەوی تووشی بێ شوکریی کرد، هەتا بڕشێتەوە و لەو بیرە فاسدە رزگار بێ، هەتا ئەو یەک عیللەتە نەبێتە سەد عیللەت. »

لە عیسایان پرسی « ئەی رووحوڵلا! چ شتێک لە دونیا و ئاخرەت دا گەورەتر و سەختترە؟ »

فەرمووی « تووڕەیی خودا. »

پرسیان « چ شتێک دەبێتە هۆی رزگار بوون لە تووڕەیی خودا؟ »

فەرمووی « ئەوە کە غەزەبت بشکێنی و تووڕەییت دامرکێنی. »

رێبازی دەروێشایەتی ئەوەیە کە کاتێک نەفس بیەوێ شکایەت بکا، بە پێچەوانەی نەفس شوکر بکا و مبالغەی بکا ـ وەها کە دە دەروونی خۆی دا، مەحەببەتی ئەو پێکبێنێ. چونکە شوکر گوتن بە درۆ، داوای مەحەببەت کردن لە خودایە.

مەولانای گەورە بەهائەددین دەیفەرموو « دوژمنایەتی و رق دە تینەتی تۆ دا لە تۆ شاراوەیە ـ هەروەک ئاگر. کە دیتت ئاورینگێک پەڕی، بیکووژە هەتا بچێتەوە عەدەم

لەو شوێنەوە کە هاتوە! ئەگەر یارمەتی بدەی بە شەمچەی ولاّمێک و لەفزی سزایەک، پەرە دەگرێ و لە عەدەمێکی دیکە و دیکەوە سەرڕێژ دەبێ و زەحمەتە بتوانی ئەو بنێریەوە بۆ عەدەم. »

لە نێوان بەندە و هەق دا حیجاب ئەم دوویەیە و باقی حیجابەکان لەم دوویە دەردەکەون: و ئەویش سلاّمەتی و ماڵە. ئەوەی کە سلاّمەت و لەشساغە، دەڵێ « کوا خودا؟ من نازانم و نایبینم « هەر کە ئازار پەیدا بوو، دەست بە « یائەڵڵا، یا ئەڵڵا! » دەکا و دەگەڵ هەق هاوڕاز و هاودەم دەبێ. کەوایە دیتت کە سلاّمەتی حیجابی ئەو بوو و هەق لە ژێر ئەو دەردە شاراوە بوو؟ هەروەتر ئەوەند کە مرۆڤ ماڵ و ئەنوای هەیە، ئەسبابی مراد ئامادە دەکا و شەو و رۆژ خەریکی ئەوە. هەر کە بێ ئەنوایی رووی تێکرد، نەفس کز دەبێ و بە دەوری هەق دا دەگەڕێ.

هەقتەعالا، چوارسەد ساڵ عومر و ملک و پادشایی و رابواردنی دا بە فیرعەون. تەواوی حیجاب بوو کە ئەوی لەو حەزرەتی هەقە دوور دەکردەوە. رۆژێکی بێ مراد و دەردەسەر نەدایە، هەتا نەکا یادی هەق بکا. گوتی « تۆ خەریکی مرادی خۆت بە و یادی ئێمە مەکە! شەوت خۆش بێ! »

## عیلمەکان هەموو نەقشن!

ئەو کەسانەی کە گەلێکیان خوێندوە و خەریکی خوێندنن، پێیانوایە کە ئەگەر لێرە خزمەت بکەن عیلم فەرامۆش دەکەن و تەرکە دونیا دەبن، کەچی ئەگەر بێنە ئێرە، عیلمەکانیان هەموو گیان دەگرن.

عیلمەکان هەموو نەقشن، چۆن گیان دەگرن؟ وەها دەبێ کە قالبێکی بێگیان گیانی وە خۆ گرتبێ. لەو عالەمەی دیکە، گفت هەیە، بێ قسە و دەنگ. هەقتەعالا دەگەڵ مووسا قسەی کرد. ئاخر، بە قسە و دەنگ قسەی نەکرد و بە زار و زمان. چونکە قسە زار و زمانێکی گەرەکە هەتا قسە دەرکەوێ. هەق پاکە لە لێو و زار و زمان. کەوایە ئەنبیا لە عالەمی بێ قسەیی و دەنگ، وتوێژیان دەگەڵ هەق هەیە کە گومانی ئەو ئەقڵە چووکە بەو ناگا و پەی پێنابا. بەڵام ئەنبیا لە عالەمی بێ قسەیی دێنە عالەمی قسەوە و دەبنەوە منداڵ بۆ ئەو منداڵانە. نووکە، هەرچەند ئەو جەماعەتە کە لە قسە و دەنگ دا ماونەتەوە و ناگەنە ئەحواڵی ئەو، بەڵام لەو قەوەت وەردەگرن و هەڵدەدەن و بەو ئارام دەگرن ـ هەروەک منداڵ هەرچەند دایک نازانێ و ناناسێ بە وردیی، بەڵام بەو ئارام دەبێتەوە و قەوەت دەگرێ. هەروەتر هەر ئەوجۆرەش کە میوە لە سەر لک ئارام دەگرێ و شیرین دەبێ و دەگا و خەبەری لە درەخت نیە، ئەوانیش لەو گەورەیە و لە قسە و دەنگی ئەو، هەرچەند نازانن و پێیناگەن، بەڵام قەوەتی لێوەردەگرن و پەروەردە دەبن.

گشت حەشیمەتێک پێیانوایە کە لەوپەڕی ئەقڵ و قسە و دەنگ دا، شتێک هەیە و عالەمێک هەیە هەراو. نابینی کە هەمووکەس دەچنە لای شێتەکان بۆ زیارەت و دەڵێن « لەوانەیە ئەم، ئەو بێ! » راستە ـ وەها شتێک هەیە. بەڵام شوێنەکەی بە هەڵە چوون. ئەو شتە دە ئەقڵ دا ناگونجێ، بەڵام وا نیە هەرچی دە ئەقڵ دا نەگونجا، ئەو بێ. نیشانەکەی ئەوەیە کە گوتمان، هەرچەند ئەو حاڵەتێکی دەبێ کە لە قسە و گفت نایە، بەڵام لەوەوە ئەقڵ و گیان قەوەت دەگرن و پەروەردە دەبن. بەڵام لە شێتەکان دا کە ئەوان لە دەوری دەگەڕێن، ئەمە نیە و ئاڵوگۆڕیان تێدا پێکناهێنێ و بەو ئارام ناگرن، هەرچەند ئەوان پێیانوایە کە ئارامیان گرتوە، بەو ناڵێین ئارام. هەر ئەوجۆرەی کە منداڵ کە لە دایکی جیا بۆوە، دەمێک لای کەسێکی دیکە ئارامی گرت، بەو ناڵێین ئارام. چونکە هەڵەی کردوە.

تەبیبەکان دەڵێن کە: هەرچی مەزاج پێیخۆش بوو و ئیشتیای چوە سەر، قەوەتی دەداتێ و خوێنی ساف دەکاتەوە ـ بەڵام کاتێک لە خۆڕا پێیخۆش بێ. بە هەڵکەوت ئەگەر گڵـخۆرێک گڵی پێخۆش بوو، بەو ناڵێین کە بەرژەوەندیخوازی مەزاجە ـ هەرچەند پێیخۆشە. هەروەتر، کەسێکی سەفرایی کە ترشی پێخۆشە و شەکری پێناخۆشە. ئەو خۆشییە جێ متمانە نیە، چونکە لەبەر هۆیەکە. خۆشیی ئەوەیە کە لە پێشدا، بەر لە هۆ، پێیخۆش بێ. بۆ وێنە دەستی یەکێکیان بڕیوە یا شکاندوە و لە ملی هەڵواسیوە و لە جێ دەرچوە و خوار بوە. شکەستەبەند راستی دەکاتەوە و دەیهێنێتەوە سەر جێی خۆی. ئەو ئەوەی پێخۆش نیە و ئێشی دێتێ، وەها خوار بوونێکی پێخۆشە؟ شکەستەبەند دەڵێ « تۆ لە پێشدا ئەوەت پێخۆش بوو کە دەستت راست بوو و بەو ئاسوودە بووی و کاتێک خواریان کردباوە، دەردەدار دەبووی و ئێشت پێدەگەیشت. ئێستا ئەگەر تۆ ئەو خوارییەت پێخۆش بێ، ئەو خۆشییە درۆیە، ئەوە متمانەی پێناکردرێ. »

عارفێک لای نەحوییەک دانیشتبوو. نەحوی گوتی « قسە لەم سێیە بەدەر نیە: یا ناوە یا فێعلە یا حەرف. »

عارف کراسی دادڕاند کە « هاوار بەماڵم! بیست ساڵ عومر و هەوڵ و ویستی من بە زایە چوو ـ کە من هیوادار بەوە بووم کە بەدەر لەو سێیە قسەیەک هەیە و هەوڵم بۆ دەدا، تۆ هیوای منت زایە کرد. »

هەرچەند عارف بەو قسە و مەبەستە گەیشتبوو، ئیلـلا بەم شێوەیە نەحویی تەمێ دەکرد.

دەگێڕنەوە کە: حەسەن و حوسێن بە منداڵیی کەسێکیان دیت کە دەسنوێژ بە خراپ هەڵدەگرێ و نامەشرووع. ویستیان کە بە شێوەیەکی زۆر چاک، فێرە دەسنوێژی بکەن. هاتنە لای ئەو کە « ئەمە بە من دەڵێ کە تۆ بە خراپ دەسنوێژ هەڵدەگری، هەردووکمان لای تۆ دەسنوێژ هەڵدەگرین، بڕوانە کە دەسنوێژی کامەمان مەشرووعە! »

هەردووک لای ئەو دەسنوێژیان هەڵگرت. گوتی « ڕۆڵەکانم، دەسنوێژی ئێوە گەلێک مەشرووعە و راستە و جوانە. دەسنوێژی منی بەستەزمان راست نەبوە. »

ئەوەند کە میوان زیاد بێ، ماڵ گەورەتر دەکەن و رازاندنەوە پتر و تەعام پتر. نابینی ساوا کە باڵای چووکە، بیری ئەویش کە میوانە، لایقی ماڵی قالبی ئەوە، جگە لە شیر و دایەن نازانێ؟ و کاتێک گەورەتر بوو، میوانی بیر پتر دەبێ، لە ئەقڵ و دەرک و هەڵسەنگاندن و غەیرە، ماڵ گەورەتر دەبێتەوە و کاتێک میوانەکانی ئەشق بگەنێ، لە ماڵ دا ناگونجێن و ماڵ وێران دەکەن و سەر لە نوێ بینا ساز دەکەنەوە. پەردەکانی پادشا و کەبکەبەی پادشا و لەشکر و حەشیمەتی ئەو لەو ماڵە دا ناگونجێن و ئەو پەردانە لایقی ئەم دەرگایە نین. وەها حەشیمەتێکی بێحەد پلە و پایەی بێحەدیان گەرەکە و ئەگەر ئەو پەردانە داکێشن، رووناکی سەر هەڵدەدا و حیجابەکان لادەبا و نهێنیەکان دەردەکەون ـ بە پێچەوانەی پەردەکانی ئەم عالەمە کە حیجاب پتر دەکەن. ئەو پەردانە بە پێچەوانەی ئەم پەردانەن.

کەسێک گوتی کە « ئەمە قازی ئەبوومەنسووری هێرەوی گوتوویەتی. »

گوتی « لاپەڕەیەک لە قسەکانی قازی بخوێنەوە! »

خوێندیەوە.

گوتی « قازی مەنسوور داپۆشراو قسە دەکا و بە شکەوەیە و جۆراوجۆر. بەڵام مەنسوور تێکنەچوو، بە ئاشکرا و راشکاویی گوتی. هەموو عالەم ئەسیری قەزان و قەزا ئەسیری کچی جوان. کچی جوان پەیدا دەکەن و نایشارنەوە. »

دوای ئەوە فەرمووی « بەندەکانی خودا کاتێک ژنێک بە چارشێوەوە ببینن، حوکم دەکەن: رووبەند لادە، هەتا رووت ببینم کە کێی و چی! ـ چونکە ئەگەر بە داپۆشراویی تێپەڕی و تۆ نەبینم، دڵەکوتەم دەبێ کە ئەمە کێ بوو و چ کەس بوو؟ من ئەوە نیم کە ئەگەر رووی تۆ ببینم، ببمە فیتنەی تۆ و بە تۆوە ببەسترێمەوە. خودا دەمێکە منی لە ئێوە پاک و بێنیاز کردوە. لەوە دڵنیام کە ئەگەر ئێوە ببینم، ناشێویم و لێم نابنە فیتنە، ئیللا ئەگەر نەتانبینم، دەشێوێم کە ئەوە کێ بوو؟ » ـ بە پێچەوانەی تایفەیەکی دیکە کە ئەهلی نەفسن. ئەگەر ئەوان رووی کچ ببینن، دەبنە فیتنەی ئەوان و دەشێوێن.

کەوایە، لە هەق ئەوان دا، واباشترە کە روو نەکەنەوە هەتا نەبنە هۆی فیتنەی ئەوان و لە هەق ئەهلی دڵ دا، واباشترە کە روو بکەنەوە هەتا لە فیتنە دەرباز بن.

کەسێک گوتی « لە خارەزم، کەس ئاشق نابێ. چونکە لە خارەزم، کچی جوان زۆرن! کە کچێکی جوان ببینن و دڵی پێبسپێرن، هەر بە دوای ئەو دا، لەو باشتر دەبینن، ئەو لە دڵیان سارد دەبێتەوە. »

فەرمووی « ئەگەر نەکرێ ئاشقی کچەکانی خارەزم بی، ئاخر دەکرێ ئاشقی خارەزم بی کە کچی جوانی گەلێک لێیە.

ئەوەش خارەزمی فەقرە ـ کە جوانچاکی مەعنەویی و روخساری رووحانیی گەلێک تێدایە: کە تووشی هەرکەس دەبی و قەرار دەگری، یەکی دی روو دەردەخا و ئەوەی پێشوو فەرامۆش دەکەی. کەوایە ئاشقی نەفسی فەقر دەبین کە جوانی وەهای تێدایە.»

# ڕەزاگرانی مار نا، گرانی گەنج ببینە!

ئەوە کە دەڵێن « لە نەفسی مرۆڤ دا شەڕڕێک هەیە کە دە حەیوان و دڕندە دا نیە » لەبەر ئەوە نیە کە مرۆڤ لەوان خرابترە. لەبەر ئەوەیە کە ئەو خوو خراپە و نەفسە شەڕڕ و شوومانەی کە دە مرۆڤ دایە، هی گەوهەرێکی شاراوەیە کە دەو دایە ـ کە ئەم ئەخلاق و شەڕڕ و شوومە بوون بە حیجابی ئەو گەوهەرە. وەها کە هەرچی گەوهەر گرانباییتر و گەورەتر و شەریفتر، حیجابی ئەو پتر. کەوایە شوومیی و شەڕڕ و ئەخلاقی خراپ لەبەر حیجابی ئەو گەوهەرە بوە و ئەم حیجابانە لانادرێن ئیللا بە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر نەبێ.

وە هەوڵ جۆراوجۆرە. گەورەترین هەوڵ تێکەڵاو بوون دەگەڵ ئەو دۆستانەیە کە روویان دە هەق کردوە و رووی خۆیان لەم عالەمە وەرگێڕاوە. هیچ هەوڵێک سەختتر لە دانیشتن دەگەڵ دۆستی سالّح نیە ـ چونکە ئەوان توێنەر و فەوتێنەری ئەو نەفسەن.

لەبەر ئەوەیە کە دەڵێن « مار چل ساڵ مرۆڤ نەبینێ، دەبێتە ئەژدیها » یانی کەسێک نابینێ کە ببێتە هۆی تواندنەوەی شەڕڕ و شومیی ئەو.

لە هەرکوێ قفلێکی زل لێدەن، نیشانەی ئەوەیە کە لەوێ شتێکی گرانبایی و گرانی تێدایە. نها، هەرچی حیجاب گەورەتر، گەوهەر باشتر.

وەها کە مار لە سەر گەنجە، تۆ ڕەزاگرانی مار مەبینە، گرانی گەنج ببینە.

## له فەقیر واباشترە پرسیار نەکەن!

له فـەقیـر وا باشـتره پـرسیـار نـەکەن، چونکە وەهـایە کە ئـەو هـان بدەی و ناچاری بکەی کـه لـه خـۆیەوە درۆیەک سـاز بکا. بـۆچی؟ چونکە جـسـمـانیـیـەک پرسـیـاری لێکردوە، ئـەو لە سـەری پێـویسـتـە بە پێی ئـەقڵ و توانـایی ئـەو وڵامی بـداتەوە و وڵامـەکەی وەها کە شـیـاوە ناتوانێ بداتەوە، چونکە ئـەو قـابیل و لایقی وەها وڵامـێک نیـە و وەها پارووەیەک لایقی ئەو لێو و زارە نیـە. کەوایە ئەو دەبـێ لایقی حـەوسـەلەی ئەو و تاڵعی ئەو، وڵامێکی درۆ سـاز بکا هەتا لە کۆڵی بێتەوە. هـەرچەند ئەوەی فـەقیر دەیڵـێ هـەقـە و درۆ نیـە، بـەڵام ئەوەی کـە ئەو بە وڵامـی دادەنێ، قـسـە ئـەوەیە و هـەق ئەوەیە، درۆیە ـ بەڵام لای گوێگر راستە و پتر لە راستی.

دەروێشـێـک شـاگردێکی هـەبوو، سـواڵی بۆ دەکـرد. رۆژێک لە سـواڵ خـۆراکی بۆ هێناوە و دەروێش خـواردی. شـەو، شـەیتـانی بوو. پرسـی کـە « ئەو خـۆراکەت لە کوێ هێناوە؟ »

گوتی « کچێکی جوان دایمێ. »

گوتی « وەڵڵا، من بیست ساڵە شـەیتانی نەبووم. ئەوە لەبەر پارووی ئەو بوە. »

دەروێش دەبێ خـۆ بپـارێزێ و پارووی هـەرکـەس نـەخـوا ـ چونکە دەروێش لەتیـفـە، شـوێنی لە سـەر دادەخـا و گـەلێک شـتـی لێدەردەکـەوێ. هـەر ئەوجـۆرەی کـە لە جلی پاکی سـپـی، هـەندێک رەشـایی دەردەکـەوێ. بـەڵام لە سـەر جلی رەش کـە چـەند سـاڵە لەبەر چڵـک رەش هەڵگـەڕاوە و رەنگی سـپـی بە سـەر نەمـاوە، ئەگـەر هـەزار چـەشنە چڵک و چەوریی بە سـەر دا بتکێ، لێـیدەرنـاکـەوێ. کـەوایە چونکە وەهایە، دەروێش نابێ پارووی زاڵـم و حـەرامـخـۆر و جـسـمـانیـیـەکان بخـوا ـ چونکە شـوێن لە سـەر دەروێش دادەخـا و بیری فـاسـد لەبەر ئەو پارووە لێیدەردەکەوێ، هـەر ئەوجۆرەی کە لەبەر خۆراکی ئەو کچە، دەروێش شەیتانی بوو.

# چاکە تەرکی خراپەیە!

هەرچی لە بازاڕ دا دوکانێکە یا خواردنەوەیەک یا کەرەسەیەک یا مەتاعێک یا پیشەیەک، سەرچاوەی هەرکام لەوان حاجەتێکە دە نەفسی مرۆڤ دا و ئەو سەرچاوەیە شاراوەیە ـ هەتا شتێک پێویست نەکرێ، ئەو سەرچاوەیە ناجووڵێتەوە و سەر هەڵنادا. هەر ئەوجۆرەی، هەر گەلێک و هەر دینێک و هەر کەرامەتێک و موعجیزەیەک و ئەحواڵێکی ئەنبیا، هەرکام سەرچاوەیەکیان هەیە دە رووحی مرۆڤ دا، هەتا پێویست نەکرێ، ئەو سەرچاوەیە ناجووڵێتە و سەر هەڵنادا.

گوتی: فاعلی چاکە و خراپە یەک شتە یا دوو شت؟

ولام: لەو روانگەوە کە لە کاتی شک و گومان لە بەحس دان، بێشک دوون ـ چونکە کەسێک دژایەتی دەگەڵ خۆی ناکا و لەبەر ئەوەیە کە چاکە و خراپە لێک جیا دەکرێنەوە. چونکە چاکە تەرکی خراپەیە و تەرکی خراپە بێ خراپە مەحاڵە. دەربڕینی ئەوە کە خراپە تەرکی چاکەیە لەبەر ئەوەیە کە ئەگەر هاندەری خراپە نەبا تەرکی چاکە نەدەکرا، کەوایە دوو شت نین.

وەها کە گاور گوتیان کە « یەزدان خوڵقێنەری چاکەکانە و ئەهریمەن خوڵقێنەری خراپەکان و مەکرووهەکانە. »

ولاممان داوە کە « مەحبووبەکان لە مەکرووهەکان جیا نین، چونکە مەحبووب بێ مەکرووه مەحاڵە. چونکە مەحبووب زەواڵی مەکرووهە و زەواڵی مەکرووه بێ مەکرووه مەحاڵە. شادیی زەواڵی غەمە و زەواڵی غەم بێ غەم مەحاڵە. کەوایە یەکن، جوێ ناکرێنەوە. »

هەتا شتێک فانی نەبێ، فایدەکەی دەرناکەوێ. وەها کە هەتا قسەکانی ئەو فانی نەبێ لە نوتق دا، فایدەی ناگاتە گوێگر. هەرکەس بە خراپ باسی عارف بکا، بە چاکە باس کردنە لە راستی دا، چونکە عارف لەو خدەیە رادەکا کە تانەی لە سەر بنیشێ. عارف دوژمنی ئەو خدەیە. کەوایە خراپوێژی ئەو خدەیە، خراپوێژی دوژمنی

عـارف و پەسنکەری عـارف دەبێ ـ چونکە عـارف لە وەها زەمـێک رادەکا و راکـەری زەم، پەسـنکراوە. کـەوایە، لە راسـتـی دا عـارف دەزانـێ کـە « ئەو دوژمنـی من نیـە و تانەلێدەری من نیـە ـ کە من وەک باغ رازاوەم و دیوارم بە دەورە دا کێشراو و دڕک و شـیـاکە بەو دیوارەوەیە، هـەرکـەس کە تێـدەپەڕێ باغ نابینێ، ئەو دیوار و پیـسـاییـە دەبینێ و خراپەی ئەو دەڵێ. »

کەوایە باغ بـۆ رقی لێـهـەڵگرێ؟ ئیللا خـراپە کوتن زیانی پێدەگـەیـەنێ ـ کە دەبێ دەگەڵ ئەو دیوارە بسازێ، هەتا بە باغ بگا. کەوایە، بە تانە لێدان لەو دیوارە، لە باغ دوور دەکەوێتەوە، کەوایە خۆی فەوتاندوە.

## ئەم خەڵکە دەڵێن: شەمسی تەورێزمان دیت!

ئەم خەڵکە دەڵێن کە « ئێمە شەمسی تەورێزمان دیت. ئەی خواجە، ئێمە ئەومان دیت! »

خوشک قەحپە*، لە کوێت دیت؟ کەسێک کە لە سەربان وشترێک نابینێ، دەڵێ کە من کونی دەرزیم دیت و بەنم پێوەکرد. چاکیان گوتوە ئەو حەکایەتە کە پێکەنینم بە دوو شت دێ: یەک ئەوە کە قول سەر پەنجەکانی خەنەی تێگرێ، یان کوێرێک سەر لە دەربیچە دەرکێشێ. ئەوان وەک یەکن: دەروون کوێرەکان سەر لە دەربیچەی قالب دەردەکێشن چ ببینن؟ لە پەسن و رەدی ئەوان چ پێکدێ؟ لای ئاقڵ هەردوو یەکن. چونکە هەردووک نەیاندیوە، هەردووک هەتڵەبێژن. دەبێ بینایی پێکبێنی، دوای ئەوە بینین. هەروەتر کە بیناییش پێکبێ کێ دەتوانێ ببینێ ـ کە ئەوان بۆیان نیە؟

لە عالەم دا، گەڵێک ئەولیان کە بینان و ئەولیای دیکە هەن لەوان سەرتر کە بەوان دەڵێن « شاراوانی هەق ». ئەو ئەولیایانە دەپاڕێنەوە کە « خودایە، لەو شاراوانەی خۆت، یەکمان پێ نیشان بدە! » هەتا خۆیان نەیانەوەی و هەتا بۆیان نەبێ، هەرچەند چاوی بیناشیان هەبێ، ناتوانن ببینن. تەنانەت، خەراباتییەکان ـ کە قەحپەن ـ هەتا بۆیان نەبێ کەس ناتوانێ پێیانبگا و بیانبینێ. کێ دەتوانێ شاراوەکانی هەق بێ ویستی خۆیان، ببینێ و بناسێ؟ ئەو کارە هاسان نیە.

فریشتەکان لەوە تێماون کە « ئێمەش ئاشقین، رووحانین، نووری مەحزین، ئەوان کە مرۆڤن، تاقمێک نەوسنی خوێنڕێژ. » نووکە، ئەو هەموە بۆ ئەوەیە هەتا مرۆڤ لەرزی تێکەوێ کە فریشتەکانی رووحانی کە ئەوان نە ماڵ و نە پلە و نە حیجابیان هەیە، نووری مەحزن، خۆراکیان جەمالی خودایە، ئەشقی مەحزن، دووربینی چاوتیژن، ئەوان دە نێوانی رەد و ئیقرار دان هەتا مرۆڤ لەرزی تێکەوێ کە « هاوار! من کێم و لە کوێی بناسم؟ » و ئەگەر نوورێکی لێدەرکەوت و زەوقێک رووی تێکرد، هەزار شوکری خودا بکا کە « من کوا شایەنی ئەوەم؟ »

ئەوجار، ئێوە لە قسەی شەمسی تەورێز زەوقی پتر وەردەگرن. چونکە باسپێری کەشتی وجوودی پیاو بڕوایە. کاتێک باسپێر هەبێ، با ئەو بۆ شوێنی گەورە دەبا و ئەگەر باسپێر نەبێ، قسە بایە. خۆشە ئاشق و مەعشووق دە نێویان دا هیچ سەخڵەتییەک نەبێ. ئەم هەموو سەخڵەتییە بۆ غەیرە. هەرچی غەیری ئەشق بێ، لەو حەرامە.

ئەم قسەیەم پتر روون دەکردەوە بەلاّم درەنگە دەبێ گەلێک تێکۆشن و گەلێک قاناو لێدەن هەتا بگەنە حەوزی دڵ. ئیللا قەوم مەلوولن یا وێژەر مەلوولە و بیانووی دێنێتەوە، دەنا ئەو وێژەرەی خەفەت لە قەوم نەڕەوێنێ، دوو پووڵ ناهێنێ.

ئاشق ناتوانی هۆ بۆ باش بوونی مەعشووق لای هیچکەس بێنێتەوە و هیچکەس ناتوانێ هۆ دە دڵی ئاشق بنێ  کە بەڵگە بێ بۆ بوغزی مەعشووق. کەوایە روون بۆوە کە لێرە پێویست بە هۆ نیە: لێرە دەبێ داخوازی ئەشق بی. نووکە، ئەگەر لە بەیت مبالغە بکەین، لە هەق ئەشق دا ئەو مبالغەیە نیە. هەروەتر دەبینم کە مرید مانای خۆی بە روخساری شێخ بەخشی. چونکە هەر مریدێک بۆ لای شێخ دێ، لە پێشدا لەبەر مانا هەڵدەستێ و موحتاجی شێخ دەبێ.

بەهائەددین پرسیاری کرد کە « لەبەر روخساری شێخ لە مانای خۆی هەڵناستێ، بەڵکە لە مانای خۆی هەڵدەستێ بۆ مانای شێخ؟ »

فەرمووی « نابێ وا بێ ـ کە ئەگەر وابێ، کەوایە دوو شێخن. »

نووکە دەبێ هەوڵ بدەی کە دە دەروون دا نوورێک پێکبێنی هەتا لە ئاگری پەشێویی رزگار بی و هێمنایەتییت دەست کەوێ! ئەو کەسەی کە وەها نوورێکی دە دەروون دا پێکهات، ئەحوالی عالەم کە پێوەندییان بە دونیاوە هەیە، وەک پلە و ئەمارەت و وەزارەت، وەک بەرقێک تێدەپەڕێ. وەها کە ئەهلی دونیا لە ئەحوالی عالەمی غەیب ـ لە ترسی خودا و لە شۆقی عالەمی ئەولیا ـ تێیان دا دەدرەوشێتەوە وەک بەرق تێدەپەڕێ. ئەهلی هەق، بە تەواوەتی خودا گەڕاون و روویان لە هەقە و خەریک و نوقمی هەقن. هەوەسەکانی دونیا، هەروەک شەهوەتی پیاوێکی لە پیاوەتی کەوتوو، رووی تێدەکا و ئۆقرە ناگرێ و تێدەپەڕێ. ئەهلی دونیا، لە ئەحوالی قیامەت، بە پێچەوانەی ئەوەن.

* مەولەوی کاتێک لە کەسێک زۆر تووڕە ببا ئەو جنێوەی بە سەر زار دادەهات و پێیدەکوت «غر خواهر ».

## قسەکانی ئێمە نەقدە!

حیسامەددینی ئەرزەنجانی بەر لەوەی کە بە خزمەت فەقیرەکان بگا و دەگەڵیان قسە بکا، بەحسکەرێکی گەورە بوو، دەچوو هەر کوێ و دادەنیشت، بە جیدی بەحس و موناقشەی دەکرد، چاکی دەکرد و خۆشی دەگوت، بەڵام کاتێک دەگەڵ دەروێشان هەڵسوکەوتی کرد، ئەو لە دڵی دا سارد بۆوە.

ئەو عیلمانە لە چاو حاڵی فەقیرەکان یاریی و عەمر زایە کردنە. نووکە، کاتێک مرۆڤ باڵغ و ئاقڵ و کامل بوو، یاریی ناکا و ئەگەر کردی، لە شەرمان بە دزی دەیکا هەتا کەس نەیبینێ. ئەم عیلم و قاوەقاو و هەوەسەکانی دونیا بایە و مرۆڤ خاکە. کاتێک با تێکەڵ بە خاک بێ، بگاتە هەرکوێ، چاوەکان ماندوو دەکا و لە وجوودی ئەو جگە لە نارەحەتی و بۆڵەبۆڵ شتێک پێکنایە. بەڵام نووکە، هەرچەند خاکە، هەر قسەیەک دەبیسێ، دەگری و فرمێسکی وەک ئاو دەڕژێ.

نووکە، چونکە لەبری با، ئاو دەڕژێتە سەر خاک، کار بە پێچەوانە دەبێ، بێشک. کاتێک خاک ئاوی پێبگا، شیناوەرد و رەیحان و گوڵ و گوڵزاری لە سەر دەڕوێ. ئەم ڕێگایەی فەقر ڕێگایەکە کە پێیدا بە تەواوی ئارەزووکانت دەگەی. هەر شتێک کە تەمەننای تۆ بێ، هەڵبەت لەم ڕێگایە دا پێتدەگا ـ لە تێشکانی لەشکرەکان و زاڵ بوون بە سەر دوژمنەکان دا و داگیرکردنی مڵکەکان و دەستەڵات بە سەر خەڵک دا و یەک گرتنی نزیکانی خۆ و خۆشڕاوێژیی و ڕەوانبێژیی و شتی لەم بابەتە. کە ڕێگای فەقرت هەڵبژارد، ئەمانە هەمووو بە تۆ دەگەن. کەس پێی دەم ڕێگایە نەنا کە سکاڵا بکا، بە پێچەوانەی ڕێگاکانی دیکە: هەرکەس پێی دەو ڕێگایانە نا و تێکۆشا، لە سەدهەزار، یەکیانی بە ئامانج گەیشت و ئەویش نە وەها کە دڵی بێوەی بێ و ئۆقرە بگرێ. چونکە هەر ڕێگایەک ئەسبابێک و شێوەیەکی هەیە و بۆ گەیشتن بەو ئامانجە و ئامانج دەست نادا مەگەر بە ڕێگای ئەسبابەوە و ئەو ڕێگایە دوورە و پڕ لە بەڵا و پڕ لە تەگەریە. بەشکەم ئەو ئەسبابانە سەربزێوی بکەن لە ئامانج!

نووکە، کاتێک پێت لە ڕێگای فەقر نا و هەوڵت دا، هەقتەعالا مڵک و عالەمی وەهات پێدەبەخشێ کە بە زەینیشت دا نەهاتبێ و لەوەی کە پێشتر تەمەننات دەکرد و دەتەویست شەرمەزار دەبی ـ کە « مخابن، من بە هەبوونی وەها شتێکەوە، شتێکی

وەها هیچەکەم چۆن داوا دەکرد؟ »

بەڵام هەقتەعالا دەڵێ کە « هەرچەند تۆ لەو پاک بوویەوە و ناخوازی و بێزاری، بەڵام ئەودەم ئەوە بە زەینی تۆ دا هاتبوو، لەبەر ئێمە تەرکت کرد. کەرەمی ئێمە بێنەهایەتە، هەڵبەت ئەویشت پێدەگەیەنین. »

وەها کە مستەفا بەر لە وەسڵ و ناوبانگ دەرکردنی، خۆشوێژیی و ڕەوانبێژیی عەرەبی دەدیت، تەمەننای دەبرد کە « منیش وەها خۆشوێژیی و ڕەوانبێژییەکم هەبێ! » کاتێک عالەمی غەیبی لێدەرکەوت و بوو بە مەستی هەق، ئەو تەڵەب و ئەو تەمەننایەی لە سەر دڵ سارد بۆوە.

هەقتەعالا فەرمووی کە « ئەو خۆشوێژیی و ڕەوانبێژییەی کە داوات دەکرد دامان بە تۆ!»

گوتی « یا ڕەب، بە چ کارم دێ؟ بێنیازم و نامەوێ! »

هەقتەعالا فەرمووی « غەم مەخۆ! ئەویش دەبێ و بێنیازییش قایمە و هیچ زەرەری نیە. »

هەقتەعالا قسەی دایە کە تەواوی عالەم، لە سەردەمی ئەو هەتا ئەم سەردەمە، لە شی کردنەوەی ئەو دا چەندین بەرگیان نووسیوە و دەینووسن و هێشتاش لە تێگەیشتنی کلۆڵن. هەقتەعالا فەرمووی « سەحابە ناوی تۆیان لەبەر بێدەستەڵاتی و ترسی سەر و حەسوود، بە گوێچکەکانیان دا دەچپاند. گەورەیی تۆ وەها بڵاو بکەمەوە کە لە سەر منارە بەرزەکان، لە هەموو مەڵبەندی عالەم، پێنج جار، جارِ بدەن بە دەنگی بەرز و دەنگی خۆش، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا دەنگ بداتەوە. »

نووکە، هەرکەس لەم ڕێیە دا خۆی بەخت کرد، تەواوی ئامانجەکانی دین و دونیای دەست کەوت و کەس شکایەتی لەم ڕێگایە نەکردوە.

قسەکانی ئێمە نەقدە و قسەکانی خەڵک نەقڵە. ئەم نەقڵە فەرعی نەقدە. نەقد هەروەک پێی مرۆڤە و نەقڵ هەروەک قالبێکی چێویین، بە شکڵی هەنگاوی مرۆڤ. نووکە، ئەو هەنگاوە چێوییننەیان لەم هەنگاوە ئەسڵییە دزیوە و ئەندازەی ئەویان لەمە وەرگرتوە. ئەگەر لە عالەم دا پێ نەبا، ئەوان ئەو قالبەیان لە کوێ دەناسی؟ کەوایە هەندێک قسە نەقدن و هەندێک نەقڵ و وەک یەک دەچن. هەڵسەنگێنەرێکی دەوێ کە نەقد و نەقڵ لێک بناسێتەوە. هەڵسەنگاندن ئیمانە و کفر هەڵنەسەنگاندنە. نابینی کە لە سەردەمی فیرعەون، کاتێک وەکازی مووسا بوو بە مار و دار و گوریسی

سێحربازەکان بوونە مار، ئەوەی کە هەڵسەنگاندنی نەبوو هەمووی وەک یەک دیت و فەرقی پێنەکرد و ئەوەی کە هەڵسەنگاندنی هەبوو سێحری لە هەق جیا کردەوە و ئیمانی هێنا بە هۆی هەڵسەنگاندن؟ کەوایە زانیمان ئیمان هەڵسەنگاندنە.

ئاخر ئەم شەریعەتە لە ئەسڵ دا وەحی بوە، بەڵام چونکە تێکەڵ بە بیر و هەست و دەست تێوەردانی خەڵک بوو، ئەو لوتفەی نەما. ئێستا، کوا ئەو لەتافەتەی وەحی ماوە؟ هەر ئەوجۆرەی کە ئەم ئاوەی کە بە سەر خاک دا رەوانە، بەرەو شار. لەو شوێنەی کە سەرچاوەیە بڕوانە چەند روون و لەتیفە! بەڵام کە بگاتە شار و بە باغ و گەڕەک و ماڵەکانی خەڵکی شار دا تێپەڕێ، کۆمەڵێک خەڵک دەست و روو و پێ و ئەندامەکان و جلەکان و بەڕەکان و میزی گەڕەکەکان و پیسایی ئەسپ و یەستری تێدەکرێ و تێکەڵاو دەبێ، کە بەولای دا تێپەڕی و سەیری بکەی، هەرچەند هەمانە، خاک دەکاتە قوڕ و تینووی تێراو دەکا و دەشت شین دەکا. بەڵام هەڵسەنگێنەرێکی دەوێ کە تێبگا ئەم ئاوە ئەو لوتفەی نەماوە کە هەیبوو و شتی ناخۆشی تێکەڵاو بوە.

پیر ئەگەر خەریکی یاریی بێ ئاقڵ نیە، هەرچەند سەدساڵەش بێ، دیسان خاو و منداڵە. ئەگەر منداڵیش خەریکی یاریی نەبێ، پیرە. لێرە تەمەن موعتەبەر نیە.

« یەکێک لە نوێژ دا نەعرەتەی لێبدا و بگری، نوێژەکەی باتڵ دەبێ یا نا؟ »

« وڵامی ئەمە دوور و درێژە. ئەگەر ئەو گریانە لەبەر ئەوە بێ کە عالەمێکی دیکە رووی تێکردوە بەدەر لە هەستپێکراوەکان، ئەگەر وەها شتێکی دیبێ کە لە جنسی نوێژ بێ و تەواوکەری نوێژ، مەبەست لە نوێژ ئەوەیە. نوێژەکەی دروست و تەواوترە. بەڵام بە پێچەوانە ئەگەر بۆ دونیا گریا، یا دوژمنێک بە سەری دا زاڵ بوو لە داخی ئەو گریانی هاتێ، یا ئێرەیی برد بە کەسێک کە « ئەو گەلێکی ئەسباب هەیە و من نیمە! » نوێژەکەی ناتەواو و باتڵە. »

کەوایە زانیمان ئیمان هەڵسەنگاندنە ـ کە فەرق بکا دە نێوان هەق و باتڵ و نەقد و نەقڵ. هەرکەس هەڵسەنگاندنی نەبێ، مەحروومە. نووکە، ئەو قسانە دەکەم، هەرکەس هەڵسەنگاندنی هەبێ کەلکی لێوەردەگرێ و هەرکەسێک هەڵسەنگاندنی نەبێ ئەم قسانە لای ئەو زایە دەبن. وەها کە دوو کەسی شاریی ئاقڵ و باڵغ بڕۆن، لەبەر بەزەیی، بە قازانجی گوندییەک شاهیدیی بدەن. بەڵام گوندیی لەبەر جەهل، شتێک بڵێ دژی هەردووک، ئەو شاهیدییە هیچ فایدەیەک نادا و هەوڵی ئەوان زایە

دەبێ.

بایەزید لە سەردەمی منداڵی، باوکی بردیە مەدرەسە هەتا شەریعەت فێر بێ. کە بردیە لای مامۆستا، گوتی « هذا فقه الله؟ »

گوتیان « هذا فقه ابی حنیفه. »

گوتی « انا ارید فقەالله. »

کە بردیانە لای نەحوییەک، گوتی « هذا نحوالله؟ »

گوتیان « هذا نحو سیبویه. »

گوتی « ما ارید. »

هەر ئاوا، دەیبردە هەرکوێ، وایدەگوت. باوکی لێی عاجز بوو و لێیگەڕا.

دوای ئەوە بۆ ئەم داوایە، هاتە بەغدا. هەر جۆنیدی دیت نەعرەتەیەکی لێدا. گوتی « هذا فقەالله! »

چۆن دەبێ بەرخ دایکی خۆی نەناسێتەوە، کە شیرەخۆرەی ئەو گوانانە بێ؟ ئەو لە ئەقڵ و هەڵسەنگاندن زاوە، واز لە رواڵەت بێنە!

شێخێک مریدەکانی بە پێوە راگرتبوون، دەستەونەزەر، لە خزمەت دا. گوتیان «یاشێخ، ئەو جەماعەتە بۆ دانانیشێنی؟ ـ کە ئەمە دابی دەروێشان نیە، ئەوە عادەتی دەستەڵاتداران و ئەمیرەکانە! »

گوتی « نا، بێدەنگ بن! من دەمەوێ ئەوان رێز لەم شێوەیە بگرن هەتا فایدەیان پێبگا. هەرچەند رێز دە دڵ دایە بەڵام الظاهر عنوان الباطن. »

مانای عنوان چیە؟ یانی لە عنوانی نامەوە دەزانن کە نامە بۆ کێیە و لای کێیە، لە عنوانی کتێب دەزانن کە چ باب و فەسڵێکی تێدایە. لە رێزی رواڵەت و سەر دانواندن و بە پێ وەستانەوە دەردەکەوێ کە دە دەروون دا چەندیان رێز هەیە و چلۆن رێزی هەق دەگرن. ئەگەر بە رواڵەت رێز نەگرێ، دەردەکەوێ کە دە دەروون دا بێباکە و رێز لە پیاوانی هەق ناگرێ.

## قسه کورت بێ و پڕ بێ!

باشـتـرینی قـسـەکـان ئەمـەیە کـە فـایدەی هەبێ، نەک زۆر. « قل هـوالله احـد » هەرچەند کـەمـە بە رواڵەت، بەڵام لە « بقرە » هەرچـەند درێژترە، سـەرتـرە ـ لە بابەت فـایدەوە. نووح هـەزار ساڵ بانگەوازیی کرد، چل کـەسـی لە خۆ کۆ کردەوە. مسـتەفـا سـەردەمـی بانگەواز کردنـی خـۆ دیارە چەندە بـوو، چەندین وڵات ئـیـمـانیـان پێـهـێنا، چەندین ئەولیا و ئەوتاد لەوەوە سەریان هەڵدا. کەوایە جێباوەڕ لە زۆر و کەم دا نیە. مـەبەست فـایدەیە. بۆ هەندێک لەوانەیە قسـەیەکی کورت فـایدەی پتر بێ هەتا درێژ. هەر ئـەوجـۆرەی کـە تەنـوورێک ئەگـەر ئاگـرەکـەی زۆر تیـژ بێ، ناتوانی فـایدەی لێوەرگری و نـاتوانی لێی نزیک بیەوە. بەڵام چرایەکی کز هەزار فایدەی لێوەردەگری. کەوایە دەرکەوت کە مـەبەست فـایدەیە. بۆ هەندێک فـایدە ئەمـەیە کە قسە نەبیسن ـ بەس بە دیتن بەسـیـان بێ و فـایدەی لێـوەرگـرن، بەڵام کـە قـسـە ببـیـسن، زیانیـان پێبگەیەنێ.

شـێـخـێک لە هیندووسـتـانـەوە تەمـای [دیتنی] گـەورەیەکی هـەبوو. کە گـەیشـتـە تەورێز، گەیشتە سووچی دەرگای شێخ. لە ژوورەوە دەنگ هات کە « بگەڕێوە! لە هەق تۆ دا فایدە ئەمەیە کە گەیشتیە بەر ئەم دەرگایە. ئەگەر شێخ ببینی زیانت پێدەگا! »

قـسـەی کـورت و بە کـەلک وەهایە کـە چرایەکی ئایسـاو، چرایەکی خـامـۆشی رامووسی و رۆیشت. ئەوە لە هەقی ئەو دا بەسە و ئەو بە مەبەست گەیشت.

نەبی، ئاخر، ئـەو روخسارە نیـە. روخساری ئـەو، ئەسپی نەبییـە. نەبی، ئەو ئەشق و مـەحـەببـەتەیە و ئـەو هەمـیـشـە دەمێنێتـەوە. هەر ئەوجـۆرەی کـە وشـتـری سـالح روخساری وشتری هەیە. نەبی، ئەو ئەشق و مەحەببەتەیە و ئەو هەمیشەیی ـ یە.

یەکێک گوتی کە « لە سـەر منارە، بۆچ تەنیا خـودا پەسن ناکـەن و مەحـەممەدیش باس دەکەن؟ »

پێـیـانگوت کە « ئاخـر، پەسنی مـەحـەممەد، پەسنی هـەقـە. وێنەکـەی وەهایە کـە یەکێک بڵێ کە « خودا تەمەنی درێژ بدا بە پادشا و ئەو کەسەی کە منی بەرەو پادشا

برد و ناو و چاکەی پادشای بە من گوت! » پەسنی ئەو لە راستی دا پەسنی پادشایە.

ئەم نەبییە دەڵێ کە « شتێکم بدەنێ! من موحتاجم! یا جوببەی خۆت بدە بە من، یا ماڵ و جلی خۆت! »

ئەو جوببە و ماڵ چ لێدەکا؟ دەیەوێ جلی تۆ سووک بێ هەتا تینی هەتاو بە تۆ بگا. ماڵ و جوببەی تەنیا ناوێ. گەلێک شتی بە تۆ داوە غەیری ماڵ: عیلم و بیر و زانست و روانین. یانی « ساتێک، تێڕوانین و بیر و تێڕامان و ئەقڵ خەرجی من بکە! ئاخر، بەم ئامرازانە کە من پێمداوی ماڵت دەست خستوە. » هەم لە مەل و هەم لە داو سەدەقەی دەوێ.

ئەگەر دەتوانی رووت بیەوە لەبەر هەتاو، باشتر ـ کە ئەم هەتاوە رەشت ناکا، بەڵکە سپیت دەکاتەوە. دەنا نا، جل سووکتر بکە، هەتا چێژی هەتاو ببینی! ماوەیەک خووت بە ترشی گرتوە، کەوایە، شیرینیش بەتاقی بکەوە!

## هەرچی دەڵێم نموونەیە!

هەرچی دەڵێم نموونەیە [مثال]، هاووێنە [مثل] نیە. نموونە شتێکی دیکەیە و هاووێنە شتێکی دیکە. هەقتەعالا نووری خۆی بە چرا دەشوبهێنێ بۆ نموونە و بوونی ئەولیا بە شووشە. ئەمە بۆ نموونەیە، دەنا نووری ئەو دە کەون و مەکان دا ناگونجێ، دە شووشە و چرا دا کەی دەگونجێ، رۆژهەڵاتەکانی شۆقی هەق کەی دە دڵ دا دەگونجێن؟ مەگەر کە داواکاری بی، دە دڵ دا دەیبینی. هەر ئەوجۆرەی کە وێنەی خۆت دە ئاوێنە دا دەبینی و دەنا وێنەی تۆ دە ئاوێنە دا نیە مەگەر کە چاو لە ئاوێنە بکەی و خۆت ببینی.

ئەو شتانەی کە لە ئەقڵ دا ناگونجێن، کاتێک نموونەی قسە بێنییەوە، لە ئەقڵ دا دەگونجێن و دەسەلمێندرێن. وەها کە بڵێی: کەسێک چاو وێکدەنێ، شتی سەیر و سەمەرە دەبینێ و بیچم و شکڵ بە ئاشکرایی دەبینێ و کاتێک چاو دەکاتەوە، هیچ نابینێ. کەس پێی مەعقوول نیە و باوەڕی پێناکەن، مەگەر بە نموونە بیهێنیەوە و روون بێتەوە، ئەوەش چۆن دەبێ؟ هەروەک کەسێک لە خەو دا، سەدهەزار شت دەبینێ کە لە بەخەبەری دا ناکرێ یەک لەوان ببینێ. هەروەک موهەندیسێک کە لە دەروون دا، بیری لە خانوویەک کردەوە، لە بەرینایی و درێژایی و شکڵی خانوو، کەس پێی مەعقوول نیە، ئیللا کاتێک شکڵەکەی لە سەر کاغەز بکێشێتەوە، دەربکەوێ و کاتێک چلۆنایەتییەکەی روون بکاتەوە، مەعقوول بێ. دوای ئەوە کە مەعقوول بوو، خانوو بنیات بنێ بەو پێودانە، هەتا ئاشکرا بێ. کەوایە دەرکەوت تەواوی نامەعقوولەکان بە نموونە، مەعقوول و ئاشکرا دەبن.

هەروەتر، دەڵێن کە لەو عالەم دا، نامەکان دەفڕن ـ هەندێک بە دەستی راست و هەندێک بە دەستی چەپ ـ و مەلاییکە و عەرش و ئاگر و جەننەت دەبێ و میزان و حیساب و کتاب. ئەوە هیچ روون نابێتەوە هەتا ئەو نموونەیە نەهێننەوە ـ کە هەرچەند لەم عالەمە دا هاووێنەی نیە، ئیللا بە نموونە روون دەبێتەوە و نموونەی ئەو لەم عالەمە دا ئەوەیە کە شەو هەموو خەڵک دەخەون ـ لە کەوشدروو و پادشا و قازیی و جلدروو و ئەوانی دیکە. تەواوی بیرەکانیان لە کەللە دەفڕێ و هیچکەس بیرێکی نامێنێ. دیسان کە سپێدەی بەرەبەیان هەروەک نەفخی سوور لێدرێ، زەڕڕەکانی

لەشی ئەوان زیندوو دەکاتەوە، بیرەکانی هەرکەس هەروەک نامەکان ـ بە فڕین و بە غار ـ بۆ لای کەس دەچنەوە و هیچ هەڵەیەکیش نابێ. بیری جلدروو بۆ لای جلدروو، بیری فەقێ بۆ لای فەقێ، بیری ئاسینگەر بۆ لای ئاسینگەر، بیری زاڵم بۆ لای زاڵم و بیری عادڵ بۆ لای عادڵ. هیچکەس شەو وەک جلدروو دەخەوێ کە بەیانی وەک کەوشدروو لە خەو هەستێ؟ نا. چونکە کار و پیشەی ئەو، ئەوە بوە، دیسان خەریکی دەبێتەوە هەتا بزانی کە لەو عالەمیش هەروا دەبێ و ئەمە مەحاڵ نیە و لەم عالەمە دا گونجاوە. کەوایە ئەگەر کەسێک ئەم نموونەیەی بۆ دەرکەوێ و بگاتە بناوانەکەی، تەواوی ئەحواڵی عالەمی دیکە لەم دونیایە دا بۆ دەردەکەوێ و پەی پێدەبا و لێی ئاشکرا دەبێ، هەتا بزانێ کە دە توانای هەق دا هەموو شتێک دەگونجێ.

گەلێک ئێسک دە گۆڕ دا دەبینی رزاو، ئیللا ئەوانەی کە راحەتییان پێدراوە خۆش و سەرمەست خەوتوون و ئاگایان لەو لەززەت و مەستییە هەیە. ئاخر، ئەوە درۆی زل نیە کە دەڵێن « خاک وە خۆی بگرێ! » . نموونەی ئەمە لە عالەمی هەستپێکراو دا هەیە. وەها کە: دووکەس دە نوێنێک دا خەوتوون. یەکیان خۆی لە نێو جوانان و گوڵستان و بەهەشت دا دەبینێ و یەکێک خۆی دە نێو مار و گڕی دۆزەخ و دووپشکان دا دەبینێ و ئەگەر دیسان لێی بکۆڵیەوە، دەنێوان ئەوە دوانە دا نە ئەو دەبینی و نە ئەمە. کەوایە سەیر نیە کە ئەندامەکانی هەندێک کەسیش دە گۆڕ دا، لە لەززەت و راحەتیی و مەستی دابن و هەندێک لە عەزاب و ئێش و ئازار؟ و هیچیش نە ئەمە دەبینی و نە ئەو.

کەوایە روون بۆوە کە نامەعقوول بە نموونە مەعقوول دەبێ و نموونە وەک هاووێنە نیە. هەر ئەوجۆرەی کە عارف، فەرعانە و خۆشیی و کراوەیی بە « بەهار » داناوە و گیراویی و غەم بە « پاییز » ناو دەبا. دەنا لە رواڵەت دا خۆشیی کەی وەک بەهار و غەم کەی وەک پاییزە؟ ئیللا ئەوە نموونەیە ـ کە بێ ئەمە ناکرێ مانا بنەقشێن و تێیبگەن.

# قسە بکە تا بتناسنەوە!

ئەگەر کەسێک لە کاتی قسە کردنی ئێمە دەخەوێ، ئەو خەوە لە غەفلەتەوە نیە، بەڵکە لەبەر هێمنایەتییە. وەها کە کاروانێک بە رێگایەکی بەسام، بە تاریکەشەوێک دا دەڕۆن و داژوێن لە ترسان، نەکا لە دوژمنەوە بەڵایەکیان پێبگا. هەر کە وەڕینی سەگ یا قووقەی کەڵەباب بگاتە گوێیان و بگەنە ئاوایی، ئاسوودە دەبن و پێ رادەکێشن و خۆش دەخەون. لە رێ دا کە هیچ دەنگ و هەرایەک نەبوو، لە ترسان خەویان نەدەهات و لە ئاوایی دا، لەبەر هێمنایەتی، سەرەڕای سەوەڕ و قووقەی کەڵەباب، ئەرخەیان و خۆش، خەویان لێدەکەوێ. قسەی ئێمەش لە ئاوەدانی و هێمنایەتییەوە دێ و حەدیسی پێغەمبەران و ئەولیایە: رووح کاتێک قسەی ئاشنایان دەبیسن هێمن دەبنەوە و ترسیان دەشکێ، چونکە لەم قسەیە بۆنی هیوا و دەوڵەت دێ.

وەها کە کەسێک، لە تاریکەشەو دا، دەگەڵ کاروانێکە. لە ترسی زۆر، هەردەم پێیوایە کە جەردە تێکەڵ بە کاروانە. دەیەوێ کە قسەی هاوڕێیان ببیسێ و ئەوان بە دەنگ بناسێنێتەوە. کە قسەی ئەوان دەبیسێ، هێمن دەبێتەوە.

زاتی تۆ ناسکە. وەبەر چاو نایە. کە قسە دەکەی، بۆیان دەردەکەوێ کە تۆ ئاشنای رووحەکانی، هێمن دەبنەوە و دەحەسێنەوە. قسە بکە!

لە مەزرا، جانەوەرێک هەیە کە لەبەر وردیی وە بەر چاو نایە. کە دەنگ هەڵبڕێ، ئەو دەبینن بە هۆی دەنگییەوە. یانی خەڵک لە مەزرای دونیا نقوم بوون و زاتی تۆ لەبەر لوتفی زۆر، وەبەر چاو نایە. قسە بکە تا تۆ بناسنەوە!

قسە بێ پایانە، بەڵام لە قەدەر خوازیار دادەکەوێ. زانست وەک بارانە. لە مەعدەنی خۆی دا بێ پایانە. بەڵام لە قەدەر بەرژەوەندیی دادەکەوێ ـ لە زستان و لە بەهار و لە هاوین و لە پاییز دا، لە قەدەر پێداویستی ئەو و پتر و کەمتر. بەڵام لەو شوێنەیەوە کە دێ لەوێ بێنەهایەتە. شەکر دە کاغەز دەکەن یا عەتتارەکان دەرمان. بەڵام شەکر ئەوەندە نیە کە دە کاغەز دایە ـ مەعدەنەکانی شەکر و مەعدەنەکانی دەرمان بێنەهایەتن و بێنەهایەت کەی دە کاغەز دا دەگونجێ؟

تەشەریان لێدەدا کە « قورئان بۆ مەحەممەد بۆچ وشە وشە دێتە خوار و سوورەت سوورەت دانایێ؟»

مستەفا فەرمووی کە « ئەم گەوجانە چ دەبێژن؟ ئەگەر بە تەواوەتی بۆم دابێ، من دەتوێمەوە و نامێنم. »

چونکە ئەوەی کە ئاگادارە، لە کەم زۆر فام دەکا و لە شتێک گەلێک و لە دێڕێک دەفتەرێک. وێنەکەی وەها کە کۆمەڵێک دانیشتوون، حەکایەتێک دەبیسن بەڵام یەکێک ئەو رووداوەی بە تەواوەتی دەزانێ و خۆی تێیدا بەشدار بوە. لە رەمزێک هەمووی تێدەگا و زەرد و سوور هەڵدەگەرێ و لە حاڵێک بۆ حاڵێک دەگۆڕێ و ئەوانی دیکە ئەوەندەیان کە بیست [هەر ئەوەندە] تێگەیشتن، چونکە لە چلۆنایەتییەکەی ئاگادار نەبوون بەڵام ئەوەی کە ئاگادار بوو، لەوەندە گەلێک تێگەیشت.

گریمان چوویە لای عەتتار، شەکر زۆرە، بەڵام دەڕوانێ کە دراوت چەند هێناوە، لە قەدەر ئەوت دەداتێ. دراو لێرە هیممەت و بڕوایە. بە قەرا هیممەت و بڕوا قسە دەڕژێ. کە بۆ شەکر هاتووی، سەیری جەواڵت دەکەن چەندەیە، بە قەرا ئەوت بۆ دەپێون پێوانەیەک یا دوو. بەڵام ئەگەر قەتاری وشتر و جەواڵی مشەت هێنابێ، دەفەرموون کە ربەپێوان بێنن ـ کە « کاری ئەمە زۆر دەخایەنێ و بە پێوانەیەک یا دوو پێکنایە » وەها، مرۆڤێک هەیە کە دەریاکان بەشی ناکەن و مرۆڤێک هەیە کە چەند دڵۆپی بەسە و زێدە لەو زیانی پێدەگەیەنێ. و ئەمە تەنیا لە عالەمی مانا و زانست و حیکمەت دا نیە. لە هەموو شت دا وەهایە ـ لە ماڵ و زێڕ و مەعدەنەکان دا گشتیان بێنەهایەت و بێبن، بەڵام لە قەدەر پێویستی کەس دادەکەون، چوونکە پتر لەو هەڵناگرێ و شێت دەبێ. نابینی لە مەجنوون و لە فەرهاد و لە ئاشقەکانی دیکە دا کە وە کێو و سارا کەوتن، لە ئەشقی ژنێک؟ چوونکە شەهوەت لەوەی کە پێویستی ئەو بوو، پتریان تێکرد و نابینی کە مڵک و ماڵیان پتر دە فیرعەون کرد، داوای خودایەتی کرد؟

قسەی گشتیی ئەمەیە: ئەگەر نوورت هەیە، مرۆڤایەتییت نیە. مرۆڤایەتیی داوا بکە! مەبەست ئەمەیە. باقی درێژ دادڕینە. قسە کە زۆری دەڕازێننەوە مەبەست فەرامۆش دەکرێ.

بەققاڵێک ژنێکی خۆش دەویست. بە کڵفەتی خاتوون دا رایسپارد کە من وەهام و ئاوام و ئاشقم و دەسووتێم و ئارامم نیە و زوڵمێکی زۆرم لێدەچێ و دوێ وەها بوو و دوێشەو وەهام لێگوزەرا ... کۆڵێک کوڵی دڵی هەڵڕشت.

کڵفەت هاتەوە خزمەت خاتوون. کوتی « بەققاڵ سلاوت دەگەیەنێتێ و دەڵێ کە وەرە هەتا ئاوا و وەهات لێبکەم! »

کوتی « وا بە ساردیی؟ »

کوتی « ئەو درێژی گوت، بەلام مەبەست ئەمە بوو. »

ئەسڵ مەبەستە، باقی سەرێشەیە.

# فەرهەنگۆک

**باسپێر:** پارچەیەک کە لە ئەستووندەگی گەمی و کەشتی دەبەستن بۆ کەلک وەرگرتن لە هیزی با.

**بەقا:** ١ـ باوەڕ. ٢ـ باقی، مانەوە.

**تەمیز:** کاری هەڵسەنگاندن وهەڵبژاردن و جیا کردنەوەی شاز و چاک لە ناشاز و خراپ، تەشخیس

**جوببە:** باڵاپۆشێکی فش و درێژ.

**چەرخی فەلەک:** فەلەک، دونیا.

**حاجەت:** داوا، پێداویستی

**حاجەتخانە:** ئاودەست، توالێت

**حەلیم:** ئاشێک کە بە گەنم و گۆشت سازی دەکەن و گۆشتەکە دەبێ زۆر بکوڵێ و هەلابەهەلا بێ.

**حیجاب:** پەچە، رووبەند، رووپۆش

**خوداوەندگار:** لەقەب و نازناوی مەولەوی

**خۆبەکەمزان:** کەسێک کە خۆی پێ زۆر نەبێ و سەرەڕای گەورەیی لە پلە و زانست دا خۆ بە چووک دابنێ.

**خەرابات:** قەحپەخانە، خراپەخانە

**رەباب:** ئامێرێکی کۆنی مۆسیقا وەک تەنبوور کە پێشتر بە نینۆک یا زەخمە لێدەدرا و لە دوایی بە ئارشە ژنیویانە.

**رەبەن:** کەسێک کە تەرکی دونیا دەکا و ژن ناخوازێ.

**زێدەڕەویی:** ئیفرات

**سەماع:** دەست و پێ راوەشاندن و جەزم و حاڵەت و سەمای سۆفییەکان

**عالەم:** دونیا، جیهان

**عالیم:** زانا، تێگەیشتوو

**غەرەز:** مەبەست

**قاروورە:** شووشەیەکی چووک وەک میزڵدان کە میزی تێدەکەن بۆ مەعاینە.

**قایم:** بەستە، وابەستە، گرێدا

**قول:** رەش پێست، قولەڕەش

**کاشۆ:** داردەستی گۆیێن

**کڵ:** پایەی پرد، بناغەی پرد.

**کەردار:** چاروێدار، خەربەندە

**کەلوو:** قاپۆغی هەندێک دانەوێڵەی وەک نۆک و پۆڵکە و لوبیا...

**گوێڕەش:** گیانداریکی گوانداری کێوییە، بە قەرا رێوییەک دەبێ، لە رەگەزی پشیلە و لە جسنی یووزپڵینگە و لە شوێنی گەرمی ئاسیا و ئافریقا دەژی، تووکی سەر پشتی خەنەیی و بن زگی سپیە، گوێچکەکانی تەواو رەشە و نێوەکەی سپیە، گونڕەش.

**گووران:** نوتفە بەستن، خۆ گرتن و هاتنە وجوود.

**لۆک:** وشتری نێر

**لەوح:** هەر شتێکی پانی وەک تەختە و گڵ و شتی لەم بابەتە کە بۆ نووسین کەلکی لێوەرگرن، دەپ.

**لەوحی مەحفووز:** چلۆنایەتی هەڵدان و ئاڵوگۆڕیی و داهاتوو و هەرچی کە لە جیهان دا دەردەکەوێ و پێشتر خودا دیاریی کردوە و پاراسراوە.

**مشە:** زۆر، گەلێک

**نوێژی دوانە:** نوێژی بەیانی کە دوو رەکەعەتە.

**نەبی:** پێغەمبەر

**هەستە:** باج، خەراج، زەریبە

**هەق:** ١ـ هەقتەعالا، خودا. ٢ـ ماف

**هەقتەعالا:** خودای تەعالا، خودا

**هەڵوێنی:** جۆرێک قەیسی شیرین

**ئوستورلاب:** ئامرازێکی ئەستێرەناسان بوە، بۆ ئەندازە گرتنی بەرزایی و دووریی ئەستێرەکان و چلۆنایەیی هەڵکەوتنیان و کاروباری دیکەی فەلەک.

**ئەبدان:** کۆی بەدەن، لەشەکان، بەدەنەکان.

**ئەغیار:** غەیر، بێگانە، نەیار

**ئەقڵی جزوو:** مەبەست لە ئەقڵی جزوو، ئەقڵێکە ناتەواو. ئەقڵێک کە کەموکووڕیی و کەمایەسی هەیە و زۆربەی خەڵک دەگرێتەوە. ئەم رادەیە لە ئەقڵ بۆ ناسین و تێگەیشتن و فامینی مەسەلەکان و شتەکان تەواو نیە، چونکە هەمیشە لە شک و گومان دادەبێ و ئەو شک و گومانە تێکەڵاوی ئەقڵ دەبێ و بناغەی ئیستدلالەکانی ئەقڵ سست و بێهێز دەکا.

**ئەقڵی کولل:** ئەقڵێکە پێگەیشتوو و تەواو کە موحیت بە سەر هەموو شتێک و مەسەلەیەکە و راستی و دروستییەکانی بە تەواوەتی بۆ دەردەکەوێ و تێیدەگا. ئەم ئەقڵە بە بڕوای مەولەوی تایبەتی هەڵبژاردەکان و نزیکەکانی خودایە کە ئەنبیا و ئەولیا و پیاوچاکان و شێخی راست و عەبدی موخلیس دەگرێتەوە.

**ئەوتاد:** چوارکەس کە لە چوار لایەنی زەویین و خودا لەبەر خاتری ئەو چوارکەسە دونیا دەپارێزێ. (لە رۆژهەڵات: عبدالرحمن، لە رۆژاوا: عبدالودود، لە باشوور: عبدالرحیم، لە باکوور: عبدالقدوس) هەرکات یەک لەم چوارە بمرن کەسێکی دیکە دەبێتە جێگریان.

**یەرغوو:** دادخوازیی (وشەیەکی مەغوولی)

## ناونامە

**ئادەم:** یەکەم مرۆڤ و مێردی حەووا. بە پێی تەورات خودا بە پێنج رۆژ زەوی و ئاسمانی خوڵقاند و رۆژی شەشەم کەسێکی هاووێنەی خۆی لە خاک ساز کرد.

خودا، جبرەییلی نارده سەر زەوی هەتا هەندێک خاک بێنێ، خاکێکی تەڕ و ویشک، رەش و سپی، سوور و زەرد و سەوز، سوێر و شیرین، هەتا ئادەمی لێ ساز بکا. خاک هێنده پاڕاوه هەتا ئەو ئەرکەی نەخاتە سەر، جبرەییل بەزەیی پێداهات و گەڕاوە. خودا میکاییل و لە دوایی ئیسرافیلی نارد و ئەوانیش دەسبەتاڵ گەڕانەوە. لە ئاکام خودا عیزراییلی نارد و ئەو ئەمرەکەی بە جێ گەیاند. (هەر لەبەر ئەوە عیزراییل ئەرکی گیان کێشانی مرۆڤیشی پێسپێردراوە.)

خودا چل رۆژ بارانی خەفەتی بە سەر ئەو خاکە دا باراند و یەک ساعەت بارانی شادیی، لە دوایی پاڵاوتی و لە بەشە پاڵاوتەکە ئادەمی خوڵقاند و لە پاشماوەکەی داری خورما. پاشان ئادەمی بردە بەهەشت و لە پەراسووی چەپی حەووای خوڵقاند و جگە لە بەری درەختێک ـ سێو یا گەنم ـ هەموو شتی لێ حەڵاڵ کردن.

لە ئاکام ئیبلیس ـ دەرکراوی خودا ـ رێی دە بەهەشت کەوت و ئادەم و حەووای هەڵفریواند. ئەوان لە بەری ئەم درەختەیان خوارد و چاو گوێیان کراوە و چاک و خراپیان لێک کردەوە و بوونە غەنیمی خودا و هەر لەبەر ئەوە لە بەهەشت دەرکران و هەڵدێرانە سەر گۆی زەوی. جبرەییل، نووسین، کشتوکاڵی، خانوو ساز کردن و هەندێک شتی دیکەی فێر کردن.

ئادەم نۆسەد و سی و نۆ ساڵ ژیا. دوای مەرگی فریشتەکان شینیان بۆ گێڕا و مانگ و هەتاو شەش شەو و رۆژ گیران.

**بایەزید:** بایەزیدی بەستامی (طیفور بن عیسی بن سروشان) مەشهوور بە سوڵتانەلعارەفین لە مەشایخی زۆر گەورەی سۆفییە. بایەزید لە یەکەم کەسانێک بوە کە بڕوای بە وەحدەتی وجوود و فنا فی الله بوە.

بایەزید چەند ساڵ بەر لە حەللاج ئیدعای « سبحانی ما اعظم شانی » کردبوو و کوتبووی: شەئنی من لە مەحەممەد سەرترە و تۆش پتر لەوە کە لە ژێر فەرمانت دابم

دەبێ فەرمان لە من ببەی... ئادەم، خودای خۆی بە پارووپەک فرۆشت ... بەهەشتی تۆ لەیستۆکی منداڵانە...

بایەزید کوتی قسەی چوارکەس گەلێک شوێنیان لە سەر دانام.

یەکەم: منداڵێک کە چرایەکی ئایساوی بە دەستەوە بوو و بە ڕێگایەک دا دەڕۆیشت. پرسیم « رۆڵە ئەو رووناکییەت لە کوێ هێناوە؟ » فووی لە چرا کرد و کووژاندیەوە و کوتی « ئەی شێخ! تۆ لە پێشدا پێمبڵێ ئەو رووناکییە بۆ کوێ چوو هەتا پێتبڵێم لە کوێوە هێناومە. »

دووهەم نێرەمووکێک لە ڕێگایەک دا بە نزیک من دا تێدەپەڕی، خۆم لێ لادا. کوتی « ئەی شێخ خۆ بۆ لە من لادەدەی کە ئاخری کاری من و تۆ دیار نیە کە چیمان لێدێ! »

سێهەم، ژنێکی جوان داوای یارمەتی بۆ مێردەکەی لێدەکردم، پێمکوت لە پێشدا رووت داپۆشە و لە دوایی داواکەت باس بکە. وڵامی دامەوە « ئەی شێخ من لە خۆشەویستی مێردەکەم کە مەخلووقە وەها شێت و شەیدام کە خەبەرم لە داپۆشینی رووی خۆم نیە. تۆ کە ئیدعای خۆشەویستی خالەق دەکەی چۆنە ئاگات لە رووی دانەپۆشراوی من هەیە؟ »

چوارەم، مەستێک لە ڕێ دا بە لا دادەهات. کە گەیشتمە لای کوتم « پێت قورس داگرە بڵا نەکەوی! » کوتی « ئەی شێخ تۆ وریا بە و پێت قایم داگرە هەتا لە ڕێگای غەفلەت نەکەوی، زانا و بینا ئەوە! »

هەروەتر دەڵێ: خەڵک لە دەریایەکی بێنەهایەت دان. خۆ دوور خستنەوە لەوان کەشتییە. هەوڵ بدە هەتا لەم کەشتییە دا نیشتەجێ بی و لەشی بەستەزمانت لەم دەریایە رزگار کەی!

**بەغدا:** پێتەختی خەڵیفەکانی عەبباسی و پێتەختی ئێستای عێراق.

**بەنی ئیسرائیل:** ناوی گشتی قەومی یەهوود. ئیسرائیل ناوی یەعقووب ـ ی پێغەمبەرە و بە بەرەی ئەو کە هەمان عیبرانی یا جوولەکەکانن، بەنی ئیسرائیل دەکوترێ.

**بەهائەددین وەلەد:** باوکی مەولانا، کە بە سوڵتانەعولەما بە ناوبانگە. خەڵکی بەلخ

و له سـەردەمی خۆی دا لـه زانست و فـەزل دا پلـه و پایەیەکی گـەورەی هەبوە. گـۆیا لەبەر نێوانناخۆشی دەگەڵ مەحەممەدی خارەزمشا یا بە قسەیەکی دیکە پێشبینی شـالاو و هێـرشی مـەغـوول، بەلخ جێ دەهێـڵـێ و روو لە قـۆنیـه دەکـا و لەوێ دەگیرسێتەوە. ئەوسەردەمە مەولەوی گۆیا چاردە ساڵە بوە.

دەگێڕنەوە:

مەحەممەدی خارەزمشا سەرەڕای پادشایەتی، مریدی بەهائەددین بوو و هەمیشە لە مـەجلسـەکەی حـازر دەبوو. رۆژێک خـارەزمـشـا دەچێتـە سـەردانی بـەهائەددین. کۆمـەڵێکی یـەکجـار زۆر دەبینێ کە بۆ زیارەت هاتبـوون. خـارەزمـشـا دەگـەڕێتـەوە و کلیل و کـەرەسـەی پادشـایەتی بۆ بەهائەددین دەنێرێ و دەڵێ: « لە ئەسـبابی دەوڵەت هەر ئەوانەمان لابوو و ئەوانیشمان بۆ ناردی! »

**پەروانە:** مـوعـینەددین پـەروانە لە نزیکـان و مـریدانی مـەولەوی. مـاوەیەک پلە و پایەدار و وەزیر بوە و یارمەتی مەغوولەکانی داوە بـەڵام لە دوایی بە تاوانی هاوکاری و دەست تێکەڵ کردن دەگەڵ میسـر بە دژی مەغوولەکان، دەگـەڵ سی و شـەش کـەس لە یاران و دۆسـتـانی دەیگرن. مـەغـوول لە داخـان پەروانە لەت و کـوت دەکـەن و دە مەنجەڵ دا گۆشتی دەکوڵێنن و هەرکەس هەندێکی لێدەخوا.

**تووقات:** شارێکە لە رۆژهەڵاتی باکووریی قۆنیە.

**حەججاج:** (ابن یوسف بن حکم ثقفی) سـەرداری سپای عبدالملک بن مروان کە دەستەڵاتێکی زۆری هەبوو و گەلێک زوڵم و زۆریی کردوە و بە مەنجەنیق ماڵە خودای وێران کردوە. هەروەتر دامەزرێنەری شاری واسێت بوە.

دەروێشێکی دوعاگیرا لە بەغدا سەری هەڵدا.

حەججاجی یۆسفیان ئاگادار کرد.

بانگی کرد و کوتی « دوعایەکی بە خێرم بۆ بکە! »

کوتی « خودایە گیانی بستێنە! »

کوتی « بۆ خاتری خودا ئەمە چ دوعایەکە؟ »

کوتی « ئەمە دوعایەکی بە خێرە بۆ تۆ و هەموو موسڵمانان! » (گوڵستانی سەعدی)

**حەللاج:** (ابو مغیث حسین بن منصور حلاج ـ مەنسووری حەللاج ـ) عارفی بەناوبانگ کە لەبەر ئەنەلهەق (من خودام) بە دەستووری حامد بنی عەبباس وەزیری عەبباسی (لە ساڵی ٩٢٢ ی زایینی لە بەغدا) دەست و لاقیان بڕی، لە داریان دا و مەیتەکەیان سووتاند و خۆڵەمێشەکەشیان بە دەجلە داکرد.

مەرگی حەللاج وەک وێنەیەک بۆ بێبەزەیی دەستەڵاتداران و بە هەند نەگرتنی مەرگ بەناوبانگە:

... بردیان هەتا بیکوژن

سەدهەزارێک کۆ ببوونەوە و ئەو بە سێزدە بەندی گرانەوە بە کەشم و نەشم دەڕۆیشت.

کوتیان « ئەو ناز و غەمزەیە چیە؟ »

کوتی: « دەچمە ژوانگە، بۆ قەتڵگە. »

پێی لە سەر پلەی پەیژە دانا.

کوتیان « ئیدی ئێستا؟ »

کوتی « ئێمە هی سەرین و بۆ سەر دەچین، مێعراجی پیاوان لە سەر دارە! »

هەرکەس بەردێکی تێگرت. شیبلی ـ هاوڕێ و هاوڕای ـ بۆ هاودەنگی و هاوڕەنگی گڵمەتێکی پێدادا. مەنسوور ئاخێکی کرد.

پرسیان « لەو هەمو بەردە ئاخێکت نەکرد لەو گڵمەتە ئاخت لە چی بوو؟ »

کوتی « ئەوان نازانن و مەعزوورن، لەبەرم گران هات لەمە کە دەیزانێ و نابێ بیکا! »

دەستیان بڕی.

خوێنەکەی لە رووی خۆی هەڵسوو.

کوتی « خوێنێکی زۆرم لەبەر رۆیوە، دەزانم دەبێ رووم زەرد بووبێ، بلا پێتانوانەبێ لە ترسانە، خوێنم تێهەڵسوو هەتا بە رووسوورم ببینن! سووراوی پیاو خوێنەکەی خۆیەتی!»

پێیان پەڕاند.

چاویان هەڵکۆڵی.

زمانیان بڕی و لە داریان دا.

ئێوارە بوو کە سەریان بڕی. بزەیەکی هات و گیانی دا.

کەلاکەکەیان سووتاند نەکا فتنەیەک پێکبێنێ و خۆڵەمێشەکەیان بە دەجلە داکرد.

**حیسامەددینی چەڵەبی:** (حسام الدین حسن بن محمد بن حسن) کوڕێکی کوردی خەڵکی ئورومیە کە بنەماڵەکەی کۆچیان کردە قۆنیە. باوک و باپیری شێخی

فەتیـان بوون. حیسامـەددین هێشتا باڵـغ نەببوو کە باوکی دەمرێ و تەواوی مـەشایخ و گـەورەپیـاوان بانگەوازی دەکـەن بـەڵام ئەو راست روو لە مــەولەوی دەنێ و مــاڵ و خـزمـەتکار و پیاوان و خـۆی لە ئیـختـیـار مـەولەوی دەنێ و هـەرچی دەست دەکـەوێ و هـەرچی لالاکان و لاوەکانی دەریدێن پێشکەشی مـەولانای دەکا وەها کـە دەنگیان لێ بەرز دەبێتـەوە کە « چ نەمـاوە جگە لە ئێمە » دەڵێ « ئەلحـەملای، ئەوە ئێـوەشـم رزگار کـرد لە ئەشـقی مـەولانا ». مـەولـەوی دوای مـردنی سـەلاحـەددینی زەرکـووب روو لە ئەشقی چەڵەبی دەنێ و هـەموو داهـات و مـاڵی دە مست دەنێ و وەهـا کە لە ئازیزترین کـەسـانی خـۆشـتـر دەوێ و کـۆڕێکی ئەوی لێنەبـا مەولەوی گـەرم دانەدەهـات و قـسـەی نەدەکرد. مەسنەویی مـەعنەوی بەرهـەمی گرانبایی مـەولەوی ئاکامی هـەوڵ و ئەشـقی چەڵەبییە لە ماوەی پازدە ساڵ دۆسیایەتییان دا.

رۆژێک ئەمیـر تاجەددین حـەفتـاهـەزار دەرهـەمی بۆ دەنێـرێ. دەفەرمـوێ بیـدەن بە حیسامـەددین. سوڵتان وەلەدی کوڕی دەڵێ کە « چمان دە مـاڵ دانیە و هـەرچیمان بۆ دێ بۆ حیسامەددینی بەرێ دەکەن، ئەدی ئێمە چ بکەین؟ » دەفەرمووی « بەهـائەددین وەڵڵا بیـللا تەڵڵا ئەگـەر سـەدهـەزار کـامیلـی زاهیـد تووشـی تەنگانـە بێن و مـەترسـی فەوتانیـان هـەبێ و ئێمە تاقە نانێکمـان هـەبێ، ئەویش بۆ حـەزرەتی چەڵەبی دەنێرم. »

**جبرەییل:** وشـەیەکی عیبرییە بە مانـای « پیاوی خودا یا هێزی خودا »، لە ئیسـلام دا یەک لە چـوار فریشتـەکـانی نزیکی خـودایـە و ئەمـینی وەحی. جـبـرەییل دەگـەڵ پێغـەمبـەرەکان پێوەندیی هـەبوو و وەحی خودای بۆ هێناون. ئادەمی فێرە کشتـوکاڵی کـرد و ئـاسنی پێنـاسـاند. دانیـالی فێـرە لێکدانـەوەی خـەون کـرد. مـزگێنی لە دایک بوونی یەحیا و عیسـای دا بە زەکەریا و مریەم. داودی فێرە زرێ سازکردن، کرد...

**جۆنید:** (ابوالقـاسم جنیـد بن مـحـمد بن جنیـد) عـارفی بەنـاوبانگ. سی جـار بە پێیان چۆتە حەج و لە بەغدا کۆچی کردوە.

لە جۆنید دەگێڕنـەوە:

لە بەغدا دزێکیان لە دار دابوو. جۆنید چوو پێش و پێی ماچ کرد.

پرسیاریان لێکرد.

کوتی « هەزار رەحمەتی لێبێ کە لە کاری خۆی دا مەرد بوو و مرد، ئەوەند لە سەر ئەم کارەی سوور بوو کە سەری لە سەر دانا! »

**خدر (خزر):** هەندێک بە یەکێک لە پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسراییلی دادەنێن و هەندێک بە یەکێک لە بەندەکانی خودا وەک لوقمان کە گەلێک زانیاریی هەبوە و ناوی لە قورئان دا نەهاتوە. خدر دەستی بە ئاوی حەیات راگەیشتوە و لەبەر ئەوە هەتا قیامەت زیندوویە و لە لێقەومان دا یارمەتی خەڵک و رێ لێونبوان دەدا.

**زەکەریا:** یەکێک لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسراییل و باوکی یەحیا. کاتێک مریەم زگی بە عیسا پڕ بوو، زەکەریا تاقە کەسێک بوو کە سەری دەدا. جوولەکە تەمای کوشتنی ئەویان گرت و رای کرد. لە کاتی هەڵاتن دا، دەنگ لە درەختێکەوە هات کە وەرە نێو منەوە. دار شەق بوو و زەکەریای وەخۆ گرت و وێک هاتەوە. شەیتان چاوی پێکەوت و داوێنی جلەکەی گرت هەتا لە دەرەوە دیاری بکا. کاتێک جوولەکە هاتن، شەیتان کە خۆی کردبوو بە بەشەر، پرسیاری پیرێکی بە وەها ناو و نیشانی لێدەکەن. شەیتان دەڵێ سێحربازی وام نەدیوە، ئەو درەختەی شەق کرد و چوە نێو ئەم درەختەوە و سووچی داوێنی دیارە، جوولەکە بە پێشنیاری شەیتان درەخت دەبڕن و بە مشار و شەقە دوولەتی دەکەن.

**سولەیمان:** کوڕی داود پادشای بەنی ئیسراییل کە ناوی دە قورئان دا هاتوە. سولەیمان یەکەمین پەرستگای عیبرانی لە ئورشەلیم ساز کرد. لەبەر زانایی بە ناوبانگە و زمانی گیاندارانی زانیوە و با لە فەرمانی ئەو دابوە.

**سوڵتان مەحموود:** سێهەمین پادشای غەزنەویی. سی و سێ ساڵ پادشایەتی کرد و پەنجاویەک ساڵ ژیا.

**سوڵتان وەلەد:** کوڕی گەورەی مەلەوی کە بە ناوی باپیری (بەهائەددین وەلەد) کراوە. سوڵتان وەلەد جگە لە نووسراوەکانی خۆی، یادداشتی لە قسەکانی مەولەوی و شەمس هەڵگرتۆتەوە و فیەمافیە بەرهەمی ئەرک و هەوڵی ئەوە.

سوڵتان وەلەد هەمیشە دەگەڵ باوکی بوە و مەولەویش زۆری خۆش ویستوە. دوای مەرگی باوک دەبێتە خەلیفە و جێگر و یەک لە مەشایخی تەریقەتی مەولەوییە و گۆڕەکەشی لە قۆنیە لای گۆڕی باوکییەتی.

**سەموود:** هۆزێکی بوتپەرست بوون لە باکووری مەدینە دەژیان لە سەردەمی ساڵح. سەموود بۆ موعجیزە داوایان لە ساڵح کرد کە لە کێو وشترێک بە بێچووکەیەوە بێنێتە دەر. بە فەرمانی خودا بەرد قەڵەشا و وشتر و بێچوو دەرکەوتن.

خەڵک تاوانی سێحریان لێدا و کاتێک وشتری ساڵح چوو سەر کانی و هەموو ئاوەکەی خواردەوە، سەریان بڕی و لەپڕ دەنگێکی بە قەو لە ئاسمان بەرز بۆوە و هەموو لە ترسی ئەو دەنگە مردن و هۆزەکەیان بە تەواوەتی فەوتا.

**سەمەرقەند:** شارێکی بەناوبانگ لە ئاسیای ناوەندیی و سەر بە ئوزبەکستان.

**سەنایی:** شاعیر و عارفی بەناوبانگی سەدەی شەشەمی کۆچی خەڵکی غەزنەین. سەنایی لە پێشدا شاعیری دەرباری غەزنەوییەکان دەبێ و لە دوایی دەست لەم کارە هەڵدەگرێ و پشت لە دونیا و دونیایی دەکا و روو لە عیرفان و سەفەر دەنێ.

**سەید بورهانەددینی موحەقیق:** (سەیدی سرڕزان) شاگرد و مریدی شێخ بەهائەددین وەلەد (باوکی مەولەوی) لە بەلخ، کە دوایی روو لە قۆنیە دەکا و نۆ ساڵ خەریکی تەربیەت و پێگەیاندنی مەولەوی دەبێ. گۆیا هەر لە بەلخ باوکی مەولەوی، ئەوی بە سەید سپاردوە کە پێیبگەیەنێ. لە سەید کتێبێک بە جێ ماوە بە ناوی مەعارف کە یادداشتی قسەکانیەتی:

ئاخر هەیە و ئاخوڕ.

هەر گایەک کە دە ئاخوڕ دا بێ بزانە کە بۆ کێردی قەسسابە. هەر گایەک کە گاسنی بکێشێ دە ئەمان دایە. ئەگەر لەو گایە روون بباوە کە ئاخوڕ دەیگەیەنێتە کوێ گاسن کێشانی پێ زەحمەت نەدەبوو و نیر بۆی دەبوو بە راحەتی گیان. نووکە هەر ئالیکێک دە ئاخوڕی گای بکەن، چەورایی مەنجەڵە نە چاکە لە هەق گا دا... کەوایە هەرکات لە ئاخوڕ دا ئالیکێکی زۆرت دیت مەڵێ کە « ئەوە چاکەیە لە هەق من دا! » کە ئەوە بۆ بڕینی سەرە، لمبۆز لە ئاخوڕ هەڵگرە.

**شەدداد:** پادشایەک کە داوای خودایەتی دەکرد لە سەردەمی داود دا. شەدداد باغ و کۆشکێکی ساز کرد هاوتا و هاووێنەی بەهەشت، بەڵام کاتێک ویستی پێ دەو باغە نێ، مرد و باغیش وە بن لم کەوت.

**شەمسی تەورێزیی:** (شمس الدین محمد بن علی بن ملکداد) عارفی بەناوبانگ و خەڵکی تەورێز کە زۆربەی ژیانی لە سەفەر دابوە و کۆمەڵێک زانا و گەورەی سەدەمی خۆی دیوە. لە دیدارێک دەگەڵ مەولەوی ئاگوگۆڕێکی بنەڕەتی تێدا پێکدێنێ وەها کە مەولەوی واز لە وەعز و مرید و مەدرەسە دێنێ. لە شەمس نووسراوە و کتێبێک بە دەستەوە نیە و تەنیا کۆمەڵێک وتاری لە پاش بەجێماوە کە یادداشتی قسەکانیەتی کە وێدەچێ مەولەوی و کوڕەکەی بەهائەددین و حیسامەددینی چەڵەبی لێیان

هەڵگرتبێتەوە و بە ناوی مەقالاتی شەمس بڵاو بۆتەوە:

ئەگەر یەک لە چوار بەشی حەشیمەت، گشتیان لایەک بن و من لە لایەک، هەر موشکلییێکی کە هەیانبێ، هەمووی جواب دەدەمەوە و هیچ لێیراناکەم و قسەی ناسوورێنم و نایهێنم و نایبەم. ئەهلی ئەم چارەگە حەشیمەتە هەر ئیشکالێک کە بیلێین، جوابی حازر دەدۆزنەوە دە ئێمە دا، لە هەرچی کە ئەوان پێیان گران بوە.

جواب لە سەر جواب، چارە لە سەر چارە دەبێ، قسەی من: هەر پرسیارەی دە جواب و حوججەت کە دە هیچ کتێبێک دا نەنووسرابێ بەو ناسکیی و بەو چێژە. وەها کە مەولانا دەفەرموێ « لەوەتی دەگەڵ تۆ ئاشنا بووم، ئەو کتێبانە لەبەر چاوم بێ زەوق بوون. »

**شێخ سەلاحەددینی زەرکووب:** (سەلاحەددین فرەیدوون) کابرایەکی ئووممی خەڵکی قۆنیە کە سەرەتا مریدی سەید بورهانەددینی موحەقێق بوو و لە دوایی لە کۆڕێکی وەعزی مەولەوی نەعرەتەیەکی لێدا و بە پێی مەولاناوە نووسا و ماچ بارانی کرد.

دوای ون بوونی شەمس مەولەوی دڵی بە سەلاحەددینەوە نا و کردیەوە خەڵیفە و جێگری خۆی. خەڵک بە دژایەتی هەستان کە کابرایەکی بێسەواد کە تەنانەت بە هەڵەش قسە دەکا و لەبری قفڵ دەڵێ قلْف و بە فەقەت دەڵێ فەتەق کردوویەتی خەڵیفە، دیسان شەمس سەر و سەواد و زمانی هەبوو. مەولەوی گوێی نەدایە ئەو قسانە و بێباکانە ئەشقی خۆی لە هەموو جێگەیەک دەردەبڕی. ٧١ غەزەلی مەولەوی بە ناوی سەلاحەددین کۆتایی پێدەێ.

دەگێڕنەوە مەولەوی لە ئەشقی سەلاحەددین بە قفڵ و فەقەتی دەکوت قلْف و فەتەق تەنانەت لە شێعریش دە بە کاری دێنا.

یەک کوتی « مەلانا ئەوانە هەڵەن! »

فەرمووی « تۆ راست دەکەی بەڵام ئێمە لە زمان مرجەعێکەوە کە دەیبیسین دروستن.»

**شێخ ئیبراهیم:** قوتبەددین ئیبراهیم، یەکێک لە مریدەکانی باوکی مەولەوی کە لە بەلخەوە دەگەڵ پیری خۆی سوڵتانەعولەما، هاتبوو قۆنیە.

**عاد:** قەومێکی بە ناوبانگ لە باڵابەرزیی و هێز دا. گۆیا پێیان بە زەوی رەقەن دادابا هەتا چووکیان رۆ دەچوون و تەمەنیان کەمتر لە هەزار ساڵ نەبوە. خودا هوودی ناردە سەر ئەو قەومە کە ئیمان بێنن و ئەوان کە پشتیان بە هێز و دەستەڵاتی خۆیان بەستبوو کوتیان کێ بە ئێمە دەوێرێ. هوود کوتی فوویەکی خودا بۆ ئێوە بەسە و تووکی لێکردن. خودا بای سەرسەری ناردە سەریان و بە حەوت شەو و هەشت رۆژان یەکسەرە هەموانی فەوتاند.

**عومەر:** خەلیفەی دووهەم. لە پێشدا کافر دەبێ و تەمای کوشتنی مەحەممەد دەگرێ و لە دوایی ئیمانی پێدێنێ. حەفسە (حفصە) کچی عومەر ژنی پێغەمبەر بوە و یەکێک لە ژنەکانی عومەریش بە ناوی ام کلثوم کچی عەلی بوە. پیاوێکی بە زیبک و زاکون بوە و دوای ئیمان هێنانی ئەو ئیسلام ئاشکرا دەبێ و قەوەت دەگرێ. لە تەواوی شەڕەکان دا دەگەڵ بوە و ئێران و میسر و سووریەی گرتوە و لە ئاکام بە دەست ابولوءلوء دەکوژرێ.

**عەبباس:** کوڕی عبدالمطلب و ئامۆزاری پێغەمبەر. بەر لە کۆچ، بوو بە موسڵمان بەڵام شاراوە رایگرت. لە ئاخری تەمەنی دا چاوی کوێر بوو و لە مەدینە کۆچی دوایی کرد.

**عیسا:** کوڕی مریەم و یەک لە پێغەمبەرانی خاوەن کتێب. لە بەیتولەحم دە تەویلەیەک دا لە دایک بوە. رێکەوتی لە دایک بوونی روون نیە و چەندە سەدە دوایی بە پێی لێکدانەوەیەک ساڵ و رۆژی لە دایک بوونیان دیاری کردوە.

عیسا پیاوێکی ئارام و ئاشتیخواز بوە و یارمەتی شێت و نەخۆش و لێقەوماوانی داوە. دەستەڵاتدارانی یەهوود لە ترسی پێکهێنانی ئاڵۆگۆڕیی و فەوتانی خۆیان پیلانی بۆ دەگێڕن و لە ئاکام دوای ئەتک و سووکایەتییەکی زۆر وێڕای دوو دز لە سەر تەپکێک بە ناوی جومجومە لە خاچی دەدەن.

**فەرهاد:** یەکێک لە قارەمانەکانی چیرۆکی خوسرەو و شیرین. فەرهاد غەنیمی خوسرەو بوو و شیرینی خۆش دەویست. خوسرەو بەڵێنی دا کە ئەگەر فەرهاد کێوی بێستوون هەڵکەنێ شیرین بەو دەسپێرێ. فەرهاد پشت بەستوو بە ئەشق ئەو کارەی لا هاسان دەبێ. کارەکەی نزیک تەواو بوون دەبێ کە پیرێژنێک لێی پەیدا دەبێ و بە درۆ خەبەری مەرگی شیرینی پێدەدا. فەرهاد لە تاوان قولینگی دەستی لە سەری خۆی دەدا و دەمرێ.

**فیرعەون:** نازناوی پادشاکانی کۆنی میسر بوە. فیرعەونی سەردەمی مووسا ناوی رامسێسی دووهەم بوە.

فیرعەون لە ئەستێرەناسانی بیست کە منداڵێک پەیدا دەبێ و ئەو دەفەوتێنێ. لەبەر ئەوە دەستووری دا هەر منداڵێک کە لە دایک دەبێ، بیکووژن. دایک و باوکی مووسا، ئەویان دە زەمبیلێک نا و بە ئاویان دادا. ئاسیە، ژنی فیرعەون لە ئاوی گرتەوە و بە خێوی کرد و بەمجۆرە مووسا لە ماڵی فیرعەون پێگەیشت.

کاتێک کە مووسا و قەومەکەی لە دەست زوڵمی فیرعەون رایاندەکرد و گەیشتنە رووباری نیل، مووسا بە ئەمری خودا، وەکازی لە نیل دا و نیل لێک کراوە و رێگای بۆ کردنەوە هەتا تێپەڕن و تێپەڕین. بەڵام کاتێک لەشکری فیرعەون گەیشتنە نیل و ئەوانیش ویستیان تێپەڕن، نیل وێک هاتەوە و فیرعەون و لەشکرەکەی نوقم کرد.

هەندێک لە سۆفییە پیانوایە کە فیرعەون لە دەروون دا ئیماندار بوە و شەوانە زنجیری دە مل کردوە و عیبادەتی خودای کردوە بەڵام بە رواڵەت لە رۆژ دا داوای خودایەتی کردوە.

**قابیل:** کوڕی ئادەم و حەووا. قابیل دەگەڵ خوشکی دوانەی خۆی « ئیقلیما » لە دایک بوو و دوای ئەوان هابیل دەگەڵ خوشکی دوانەی خۆی « لبودا » لە دایک بوون. کاتێک قابیل و هابیل باڵغ بوون، ئادەم ئیقلیمای دا بە هابیل و لبودای دا بە قابیل. قابیل کوتی من ئیقلیما خوشکی هاوزا و دوانەی خۆم دەوێ کە لە جوانی دا هاوتای نیە. ئادەم کوتی کەوایە قوربانی بکەن و قوربانی هەرکەس قەبووڵ کرا ئیقلیما هی ئەوە. قوربانی قابیل قەبووڵ نەکرا و لە داخان تەمای کوشتنی براکەی گرت و لە ئاکام رۆژێک کە لە سەر کێوێک برای بە خەوتوویی دیت؛ بەردی دەست دایە و هابیلی کوشت. دوای کوشتن سەرگەردان دەخولاوە و نەیدەزانی دەگەڵ کەلاکەکەی چ بکا. لەپڕ دوو قاڵاو لەبەر چاوی دەستیان بە شەڕ کرد و یەکیان ئەوی دیکەی کوشت و کەلاکەکەی دە بن خاک نا و قابیلیش هەر ئەو کارەی کرد و هابیلی ناشت.

**قاف:** کێوێکی ئەفسانەیی کە پێنجسەد فەرسەخ بەرزە، بە دەوری زەوی دا کێشراوە و لە زبەرجەد پێکهاتوە و کاتێک هەتاو لێیدەدا ئاسمان شین دەبێ. گۆیا هێلانەی سیمر لە دوندی ئەو کێوەیە.

**قۆنیە:** شارێکە لە تورکیەی ئێستا، شوێنی بەشی زۆری ژیانی مەولەوی و

گۆڕەکەی.

**کووفە:** شارێکە لە باشووری عێراق کە بە دەست سەعدی وەقاس بنیات نراوە.

**لووت:** برازای ئیبراهیم و لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسراییل. قەومی لووت خەڵکێکی نێربازاز (لەوات) بوون. رۆژێک خودا، جبرەییلی بە دوازدە فریشتەوە بە نەناسیاویی ناردە لای لووت. خەڵک دەیانەویست خەریکی ئەو فریشتانە بن و لەواتیان دەگەڵ بکەن، بەڵام لووت بەری گرتن و شەڕی دەگەڵ کردن. لووت تووکی لە قەومی خۆی کرد. بە فەرمانی خودا لووت و ئیماندارەکانی لە شار دەرکەوتن و دوای ئەوە شاری بەردەباران کرد و وێران بوو و وە بن زەوی کەوت. ژنی لووتیش لە بەدکاران بوو و ئەویش دەگەڵ قەومی لووت بەردەباران کرا و فەوتا.

**لەیلا:** مەعشووقەی قەیس. کچی مەهدی بنی سەعدیا بنی مەهد بنی رەبیعە کە هەر لە منداڵیەوە مەجنوونی خۆش دەویست. باوکی رازی نابێ و کچەکەی بە زۆریی دەدا بە کابرایەک. لەیلا هەتا ئاخر خۆی وە دەست مێردەکەی نادا و لە ئاکام لەبەر خەم و خەفەت دەمرێ.

**مریەم:** دایکی عیسا و کچی عیمران. باوکی نەزری کردبوو کە منداڵەکەی بکاتە مجێوری بەیتولموقەددەس. منداڵەکە بە کچ دەرچوو و چونکە کچ بۆ مجێور نەدەبوون، خودا ئەمری پێکرد کە لە پەنا مزگەوتی دانێ. لە هەژدە ساڵەیی بێ نزیکی لە پیاو زگی پڕ دەبێ. جوولەکە بوختانی دەخەنە سەر و ئەویش تەما دەگرێ کە بێدەنگ بێ و قسەیان دەگەڵ نەکا، لەبەر ئەوە خامۆشیی رەچاو دەکا و دەم وێکدەنێ. لە ئاکام عیسا دەزێ و لە لانکە دا وە قسە دێ و ئەو تاوان و بوختانە لە سەر دایکی لادەدا.

**مەجنوون:** قەیس بنی عامر، کە لە دوایی لەبەر ئەشق و گێرۆدەیی بە لەیلا شێت (مەجنوون) دەبێ و روو لە بیابان دەکا و دەبێتە هاودەمی گیانداران. کاتێک خەبەری مەرگی لەیلای پێدەدەن، دەچێتە سەر قەبرەکەی و ئەوەندە شین و رۆڕۆ دەکا و پێیەهەڵدەڵێ هەتا گیان دەدا و بە جوانەمەرگی دەمرێ و هەر لای قەبری لەیلا دەینێژن.

**مەککە:** یەکێک لە شارە بەناوبانگەکانی عەرەبستان کە مزگەوتی الحرام و کابەی لێهەڵکەوتوە و رووگەی موسڵمانانە.

بنیاتی ئەم شارە دەگەڕێتەوە سەر سەردەمی ئیبراهیم. لە سەدەی چواری کۆچی

دا بە دەست قـەرامـتـە (قـرامطە) وێران کـراوە و لـە سـەدەی دەهومـیش لـە ژێر دەستەڵاتی عوسمانییەکان دابوە.

**نەمروود:** پادشای کەلدە (بابیل) لە سەردەمی ئیبراهیم دا.

نەمروود داوای خودایەتی دەکرد و دەیەویست دەگەڵ خودای ئیبراهیم بە شەڕ بێ. سندووقێکی ساز کرد و لە چوار لاوە گۆشتی بە سەر نەیزەوە کرد و چوار سیسارکەی برسیشی لێ بەست. سیسارکەکان بەرەو گۆشتەکە دەفڕین و سندووقەکەیان هەڵکێشا، کە بەرز بۆوە، نەمروود تیرێکی بە خوداوە نا و خودا تیرەکەی خوێناوی کرد و بۆی فڕێ داوە. نەمروود پێیوابوو کە خودای بریندار کردوە.

نەمروود ئیبراهیم دەگرێ. ئاگرێکی گەلێک گەورە ساز دەکا بەڵام کەس ناوێری لەبەر تین و تاوی نزیک بێتەوە و ئیبراهیمی تێباوێ. شەیتان مەنجەنیقیان فێر دەکا و ئەوان بە مەنجەنیق ئیبراهیم دە ئاگر داوێن، بەڵام بە ئەمری خودا ئاگر دەبێتە شیناوەرد و گوڵستان.

نەمروود، جارێکی دیکە تەمای شەڕی دەگەڵ خودای گرتەوە و خودا مێشوولەی دە سەر کردن و لەشکرەکەی فەوتاند و مێشوولەیەکیش چوو دە تفنکیەوە و بە مێشکە سەریەوە نووسا و کوشتی.

**واسیت (واسط):** شارێکە لە عێراق کە بە ئەمری حەجاج بن یوسف بنیات نراوە و لە سەردەمی بنی امیە پێتەخت بوە. چونکە لە نێوان و وەسەتی کووفە و بەسرە هەڵکەوتوە ئەو ناویان پێداوە.

**وەکازی مووسا:** داردەستی دەست مووسا بوە و لە ئاست ماری سێحربازەکانی فیرعەون فڕێی داوەتە سەر زەوی و بۆتە ئەژدیها و هەموو مارەکانی قووت داوە. هەروەتر وەکازەکەی لە بەرد داوە و ئاوی لێهەڵقولاوە و بەنی ئیسراییل لەو ئاوەیان خواردۆتەوە.

**هامان:** وەزیری فیرعەون لە سەردەمی مووسا. فیرعەون ئەمری پێکرد کە بورجێکی زۆر بەرز ساز بکا هەتا لە سەرەوەی ئەو بە سەر خودای مووسا دا زاڵ بێ.

**هابیل:** کوڕی ئادەم و حەووا. (بڕوانە: قابیل)

**یۆسف:** خۆشەویستترین کوڕی یاقوب. یاقوب دوازدە کوڕی هەبوو کە یۆسف و بنیامین لە بەرەیەک و دەیەکەی دیکە لە بەرەدایکێکی دیکە بوون. یۆسف یەکێک لە جوانترین بەشەرەکانی سەر رووی زەوی بوە و خودا بەشێک لە جوانی خۆی بەو بەخشیوە، هەر لەبەر ئەوە روخساریان بە مانگ شوبهاندوە. زڕبراکانی ئێرەیی پێدەبەن و تەمای فەوتاندنی دەگرن و لە ئاکام دە چاڵاوێکی داوێن و کراسەکەی بە خوێنی مەڕ خوێناویی دەکەن و بۆ باوکیان دەبەنەوە و دەڵێن کە گورگ خواردوویەتی. لەو لاشەوە کاروانێک رێی دەم چاڵاوە دەکەوێ و یۆسف دەردێنەوە و دەگەڵ خۆیان دەیبەنە میسر و لەبەر لێکدانەوەی خەونی فیرعەون کە قەرارە ویشکەساڵی و قاتی دابێ دەبێتە عەزیزی میسر و لەم کەین و بەینەش دا زلەیخا ئاشق و گیرۆدەی دەبێ و چیرۆکەکەی بە ناوبانگە.

کاتێک خودا ئادەمی خوڵقاند، تەواوی بەرەکانی داهاتووی خۆی لە خەو دا دیت. خۆی دیت کە مات و حەیرانی مرۆڤێکی لە رادەبەدەر جوانە. بەژن و باڵایەکی رێکوپێک، روخسارێکی وەک مانگ، پرچی لوول و پەرێشان لە سەر شانەکانی. ئادەم لە خودای پرسی: ئەمە کێیە؟ خودا لە وڵام دا کوتی: ئەمە یۆسفە. نووری چاوی تۆ و ئاوێنەی دڵی تۆ. رێزی بگرە!

**یۆنس:** کوڕی مەتتی لە بەرەی هوود. یۆنس بیست ساڵ بانگەوازیی خودای تاکانەی بۆ خەڵکی نەینەوا کرد و ئاکامی نەبوو و ئازاریان دەدا. یۆنس تووکی لێکردن و خودا هەورێکی سووری نارده سەریان کە گڕی ئاگری لێدەبۆوە. کاتێک ئاگر گەمارۆی دان، یۆنس لە خودا تووڕە بوو و بە تووڕەیی سواری کەشتی بوو و رۆیشت. تۆفان و فەرتەنە کەشتی داگرت و کوتیان دەبێ تاوانبارێکمان تێدابێ. سێ جار پشکیان هەڵاویشت و هەر سێ جار وەبەر یۆنس کەوت. کە ئەوەی دیت خۆی دە دەریا هاویشت. ماسییەک قوتی دا و یۆنس دە زگی ماسی دا تۆبە کرد و پاڕاوە. خودا تۆبەی قەبووڵ کرد و ماسی لە بەستێنێک فرێی دا. خەڵکی نەینەوا بە پێی دا کەوتن و پاڕانەوە. خودا لێیان خۆش بوو و یۆنس بە خۆشییەوە گەڕاوە.

**یەحیا:** کوڕی زەکەریا لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسراییل کە لە سی ساڵەیی بە پێغەمبەرایەتی گەیشت و دوای پەیدا بوونی عیسا پەرەی بە ئایینی وی دا. یەحیا عیسای تەعمید دا و دوای عرووجی عیسا کوژرا.

**ئەبووبەکر:** (ابوبكر عبدالله بن ابی قحافه) یەکەم خەڵیفەی ئیسلام. باوکی

ئایشێ. دوو ساڵ و سێ مانگ خەلافەتی کردوە.

**ئەبووجەهل:** (خاوەنی جەهل) لەقەبێک کە پێغەمبەر و موسڵمانەکان بە عمرو بن هشام بن مغیره ـ یان دابوو لەبەر دژایەتی ئەو دەگەڵ ئیسلام. ئەبووجەهل خاڵی عومەر بوو.

عومەر کە ئیسلام دێنێ روو لە ماڵە خاڵی ـ ئەبووجەهل ـ دەکا و دەرگای دەکوتێ و خاڵی بە خێر هاتنی دەکا و عومەر دینی خۆی ئاشکرا دەکا و دەڵێ « لا اله الا الله و ان محمد رسول الله ». ئەبوو جەهل دەڵێ « چ ناحەزت هێناوە » و دەرگای لە سەر دادەخا.

**ئەتابەک:** موجەددین ئەتابەک، زاوای موعینەددین پەروانە لە نزیکان و مریدەکانی مەولەوی بوە.

**ئەکمەلەددین:** حەکیمێکی زانا و موریدی مەولەوی بوە و لە کاتی نەخۆشی دا چاوەدێریی لە مەولەوی کردوە و پێیڕاگەیشتوە.

**ئەمیر نایب:** ئەمینەددین میکاییل کە بە شێوەی « نایب » یان « ئەمیر »یش هاتوە، یەک لە گەورەپیاوان و لە دۆستانی مەولەوی بوە.

**ئەنگوستیلەی سولەیمان:** دەستەڵات و حکوومەتی سولەیمان بە سەر مرۆڤ و گیانلەبەران لەبەر ئەنگوستیلەیەک بوو کە دە قامکی دابوو و لە بن نەقیمەکەی ناوی خودا نەقش کرابوو. رۆژێک دێوێک بە فێڵ و تەڵەکە ئەم ئەنگوستیلەی لێدەرفێنێ و چل رۆژان لە جیات سولەیمان دەستەڵات بە دەستەوە دەگرێ هەتا لە ئاکام بە تەگبیری وەزیرەکەی دەستی بە ئەنگوستیلەکەی رادەگاتەوە.

**ئیبراهیم:** پێغەمبەری خودا کە هەزار و پێنجسەد ساڵ بەر لە زایین ژیاوە. خۆشەویستی خودا بوە و لە لایەن دینەکانی دیکەشەوە بە خۆشەویستییەوە باسی کراوە.

**ئیبراهیمی ئەدهەم:** یەکێک لە سۆفی بەناوبانگەکان کە لە پێشدا پادشا بوە و لە دوایی دەستی لە تاج و تەخت هەڵگرتوە و وە شوێن عیرفان کەوتوە.

**ئیبلیس:** فریشتەیەکی نزیکی خودا کە سوجدەی بۆ ئادەم نەبرد و هەر لەبەر ئەوە خودا لە دەرگای خۆی دەریکرد. بە فریشتەیی ناوی عەزازیل بوو و دوای دەرکران، ناوی بوو بە ئیبلیس.

هەندێک سۆفی، شەیتان بە « سلطان العارفین » دادەنێن و پێیانوایە کە خودا خۆی ویستی کە ئیبلیس فریو بخوا. دوای دەرکران داوای لە خودا کرد هەتا قیامەت زیندوو بمێنێتەوە و باشترین خوڵقاوی خودا فریو بدا. ئیبلیس بە یارمەتی مار و تاوس رێی دە بەهەشت کەوت و حەووای فریو دا.

**ئیسماعیل:** کوڕی ئیبراهیمی خەلیل و هاجەر، (باپیرەی عەرەبەکان)، کە بە پێی رەوایەتی موسڵمانان باوکی دەیەویست بۆ خودا قوربانی بکا.

له کاتی وەرگێڕان و پێداچوونەوەی ئەو کتێبە دا، جاروبار هەستم دەکرد کە پێوەندییەک دە نێوان روانگەی مەولەوی و زەردەشتی نیچە دا هەیە. تاوێک رادەمام و چاوم لە سووچێکی کتێبخانەی ژوورەکەم دەکرد لە **وەهای گوت زەردەشت** ...

نیچە لایەنی تاریکی مەولەوی ـ یە. ئاوا بوونی هەتاوە. « من دەبێ ئاوا بم، ئەوانەی کە دەمەوێ بۆ لایان داگەڕێم. وەهای دەست پێکرد ئاوا بوونی زەردەشت! ». دەستپێکی نیچە شەوە و لە لایەنی رەش و تاریک دەدوێ. بەشەکەی وا دراوە. قەشەیەکی رەشپۆشی ئاڵمانی کە فرچکی بە تاریکی گرتوە و تیشکی هەتاوی رۆژهەڵاتی وێنەکەوتوە، زەحمەتە لە تینی تاوێنەری هەتاو بدوێ. لە شەو دەدوێ. «ئاخ، بریا تار و شەوڕەنگ بام! ئەودەم دەمزانی کە چلۆن مەمکی نوور بمژم! »

شەو رازە. رواڵەتەکان رازن. خشپەیەک دڵ وە خورپە دێنێ و سێبەرێکی چووک، ترسێکی گەورە دەخوڵقێنێ. خەڵک و بەشێکی زۆری بوونەوەر خەوتوون و پەچەیەک بە سەر یار و نەیار دا کشاوە. نیچە رێبواری ئەو شەوەیە و ئاگری بە دیاری هێناوە، ئەویش نەک ئاگرێک بۆ خۆ گەرم کردنەوە، بەڵکە بۆ سووتاندن، بۆ ئاگر هەڵگیرساندن.

لەم شەوە دا نیچە بە دوای کەسێکەوە، سەرووتر لە خۆ، پێغەمبەرێک. پەنا بۆ خەڵوە دەبا و خەیاڵی بەرزەمرۆڤ دەدۆزێتەوە و وەڕێ دەکەوێ هەتا پەیامی ئەم بەرزەمرۆڤە بە مرۆڤ رابگەیەنێ...

کەچی ژیانی مەولەوی، بەشی زۆری رووناکی و هەتاوە. ئەنگووتنی مەولەوی لە بەرەبەیان دایە. راز لێرە رواڵەت نین، لێرە دەروونەکان شاراوەن. تەنانەت بەرزەمرۆڤی مەولەویش ناوی شەمس ـ ە و نەک بە خەیاڵ، کە بە ئاشکرا دێ و شۆق دەخاتە سەر نهێنی و رازەکانی دەروون.

نیچە رێبواری تاریکی و وێڵی بەرزەمرۆڤ و مەولەوی هەتاونشین و هاودەمی شەمس.

« شـەو هـەرچەند دژی رۆژە، بەڵام یارمـەتیدەری ئەوە و یەک کـار دەکـەن. ئەگـەر هەمیشە شـەو با، هیچ کارێک جێبەجێ نەدەبوو و پێکنەدەهات و ئەگەر هەمیشە رۆژ با، چاو و سەر و مێشک زەق دەمانەوە و شێت دەبوون و بێکەلک. کەوایە لە شەو دا، دەحەسێنەوە و دەخەون و هەمـوو ئەندامەکان، لە مێشک و بیر و دەست و پێ و چاو و گوێ، هـەمـوویان هێـز دەگرن و رۆژ ئەو هـێـزانە خـەرج دەکـەن. کـەوایە تەواوی دژەکان لە چاو ئێمە دژ دەنوێنن ـ لە چاو زانا، هەموو یەک کار دەکەن و دژ نین. »